سەردەم 43

شوباتی
2006
ســـــــاڵی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد
بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی    شوان ئەحمەد
شاهۆ سەعید    لاوك سەلاح

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان
کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق

ناونیشان
سلێمانی – فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347
دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە
Tel - Fax: 0044 7543129839
ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:
www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

–ســەردەم گۆڤارێکــە بــە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانــی کــەلتووری بیــانی لــە بـواری فەلسـەفە و فیکـر و ڕەخنـە و لێکۆڵینــەوە و داهێنــانی ئــەدەبی و هونەریدا.

–تکایـە ئـەو بەرهەمانـەی بـۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسـەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسـەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتــەر کرابێــت. پــەراوێز و ســــەرنجەکانیش لــــە کۆتــــایی وتارەکـەدا هـەبن. ئەگـەر یـەکێك لـەو مەرجانــە نەهاتنــە دی دەســـتەی نووسـەران مـافی بڵاونەکردنـەوەی هەیـە و پێشـەکی داوای لێبـوردن لـە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمــەکان بڵاوبکرێنــەوە یــان نەکرێنــەوە نادرێنــەوە بــە خاوەنەکەی.

–هــەموو پەیوەندییــەك لــە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## وێستگەكانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# ماناکانی نیشتمان لە دونیای تازەگەریدا

نیکۆس پاپاستێرگیادس
لە ئینگلیزییەوە: لاوك سەلاح

نیشتمان جۆرێك لە ڕێزگرتنە، نەك جێی ساختمانێك
لە هەرکوێیەك بین، لە هەر کاتێکدا، ئەگەر سەرپشك بین ڕەنگە لە شوێنێکی دیکە بین،
بەڵام دڵنیابە ئەو شوێنەی هەڵیدەبژێریت شوێنێکی دروستە.

دەبلیو ئێچ ئۆدن
لە ساتەکانی جەنگدا - 1942

### خاکی مژدەبەخش

بیرکردنەوە سەبارەت بەوەی ئێمە سەر بە کوێین چیدی پێبەپێی ڕەوت و چەمکێکی جوگرافیی پەتیی شوێن و هەستکردن بەوەی ئێمە لە ڕووی مێژووییەوە پابەندی ئەو شوێنەین پێناسە ناکرێت، لەبەرئەوەی هەستمان بەوەی "ئێمە کێین" و "سەر بە کوێین" تێکەڵ بە چەندین هۆی جۆراوجۆری جیهانی دەبێتەوە. ئەمە سەرباری هۆکانی کۆچکردنی خەڵك و جێگۆڕکێی مانا و شوێنەکانی کارکردن کە زۆر رادیکاڵانە کار دەکەنە سەر مەسەلەی پابەندبوون بە شوێنەوە. هەرچەندە رازیکردنی هەستی بە ئینتیمابوون، ڕەنگە وەك بیرۆکەیەکی ڕووت بێتە بەرچاو، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە زیاتر لە ڕێبوارێك دەچین، نەوەك دانیشتووی شوێنێکی تایبەت، بەناو پرۆژەیەکدا رادەبوورین بە تازەگەری ناوزەند دەکرێت. بێگومان ناونانی پرۆژەکە شتێکە و درککردن بە گۆڕانکارییەکانی شتێکی دیکەیە.

ئایا تازەگەری هێشتا هەڵگری ئەو مژدەیەیە کە ببێتە نیشتمان بۆ نیشتەجێکردنی پرۆژەی رۆشنگەری و عەقڵ و پەرەپێدان؟ یاخود هەر ئەوەندە دۆخێکی تاراوگەیە و پڕە لە مەنگی دونیای تەکنەلۆژیا و حاڵەتێکە بەرەو خوار لێژدەبێتەوە، دۆخێك ئاژاوە سیمایەتی و

**نایەکسانی بەرجەستەیەتی و جۆرێك لە زەمینەخۆشکردنە بۆ خولْقاندنی پەشێویەکی کەلتووری و ژینگەیی. بە داخەوە، گریمانە نوێکان لەناو خۆیاندا کۆك و تەبانین. لەلایەکەوە ئێمە لەو بڕوایەداین کە بوونی گۆڕانکاری شتەکان چاکتر دەکەن، لەلایەکی دیکەوە دەمانەوێت شتەکان وەك خۆیان بمێننەوە. تازەگەری لە هەردوو ئەم بڕوا ناکۆکەوە سەرچاوە دەگرێت: لەسەفەرکردن و دوورکەوتنەوە لە نیشتمان و نیشتەجێبوون تیایدا لەهەمان کاتدا. بۆ هەمووومان، ئەو کەسانەی کە سەفەر بە ڕێگا گشتییە خێراکان و دوورەکانی تازەگەرییدا دەکەین هیوایەکی پەنهان هەیە، بۆ گوزارشتکردن لەو هیوایە هەمیشە ئێمە جەخت لەسەر شێوازو دەنگێکی جیاواز دەکەین. ئەم دەنگە تایبەتە، کە پێی ئاشناین، وەك جۆرێك لە داخوازی و فۆرمێك لە دلْنیایی وەدەردەکەوێت. من زۆرجار وەك ئەم شێوەیەی خوارەوە دێتە بەرگوێم:**

چەند دوور بڕۆیین، هەمیشە دەتوانین بێینەوە نیشتمان

دونیا چەند شێتگیر بێت، شتەکان هەمیشە وەك خۆیان دەمێننەوە لە نیشتمان

چاوەڕوانی هەرچییەکت لێبکەن تۆ وەك خودی خۆت دەبیت، لەویٚ، لە نیشتمان

ئەوان هەر چییەك بکەن، ئێمە بەو جۆرە، شتەکان بەڕێوە دەبەین، لێرە، لە نیشتمان

**لەم چوار دێرەدا، گوێمان لە مژدەی گەرانەوە و سەقامگیربوون دەبێت کە دەشێت لە سەفەرە تازەگەریەکاندا دەستەبەرکرێن، هەر بۆیە نیشتمان ئەوێیە کە دلْی لێیە. ئەم دلْنیاکردنەوە دایکانەیە ئەوەمان دێنێتەوە یاد کە سەرباری کۆچ و پەشێوییە کۆمەلاٚیەتییەکان و قەیرانەکانی خود و جیاوازییە کولتوورییەکان، نیشتمان وەك دلْفرێنترین شوێن دەمێنێتەوە، لەویٚ زێد و چارەنووس تێکدەچڕێن و هەرگیز دەستەبەرداری ئارامی و ئاوێزانبوون نابین. لە دەستپێکی گۆرانییەکی کۆمیدیایی ئەمەریکایی بەناوبانگ بە ناوی بەخۆشیت "*cheers*" ئەم دلْنیاکردنەوەیە بە جۆرێکی زۆر کاریگەر بەرگویٚ دەکەوێت:**

دەتەوێت بچیت بۆ ئەو شوێنەی کە خەلْك پێی دەزانن، ئەو خەلْکانەی وەك یەکن

دەتەوێت بچیت بۆ ئەو شوێنەی کە هەموو کەس ناوت دەزانن

**لە کۆمەلْگایەکدا کە پانتاییە ناوخۆییەکان بە کۆست و نائارامی داگیرکراون، باشترین وێنا کە بەکاربهێنرێت بۆ وەسفکردنی ئەو کۆمەلْگەیە تەنها بارە. بەلاٚم نیشتمان لە هەر کوێیەك بێت شوێنێکی پیرۆزە، هەر لەوێوە خەلْك نەخشە بۆ دونیا دەکێشێت. هەموو سەرکێشەکانی دونیای دەرەوە بە نیشتمانەوە دەپێورێت. هەموو خەونەکانی سەفەر هەر لە نیشتمانەوە دەست پێدەکەن، دواتر گەڕان بە دونیادا لەوێوە ڕێچکە دەبەستێت. نەخشەکێشان جۆرە ئامرازێکە لە نیشتمانەوە فێری دەبین و گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان وەك دووپاتکردنەوە بۆ بوونی وزەیەك کە نکولْی لێناکرێت دەژمێردرێت. نیشتمان چەند هەلْگری مانا ناوەندییەکانە ئەوەندە ماناکانی دوورە لە ناوەندەوە، هەمیشە هەردوو ئاراستەکە ئاوێتەی یەکتر دەکات. هەمیشە نیشتمان ناوەندی دونیاییە.**

**پێدەچێت ئەمە قەناعەتێکی جیهانی بێت و جیاواز بێت لە هەر مشتومڕێکی دیکە سەبارەت بە ڕێژەیی ئەو تێڕوانینە تایبەتەی بۆ نیشتمان**

هەمانە. ئەگەر دان بەوەدابنێین کە هەموو خانوویەك و ماڵێك بە نیشتمان دادەنرێت، دەبێت درك بەو راستییە بکەین کە هەر نیشتمانێکی بێخەوش پێبەپێی وردەکارییەکانی ماڵ دەستنیشان ناکرێت. لەوە دەچێت ئەم جۆرە چەمکە نەکەوتبێتە ژێر کاریگەری ڕەخنە دەرەکییەکانەوە. نیشتمانی بێخەوش ماڵێك نییە کە داڵدەمان بدات و تیایدا شتەکانمان حەشار بدەین. نیشتمان سەرباری ئەوەی جەستەمان و ژیانمان دەپارێزێت و بەهایەکی ماددی هەیە، شوێنێکە بەها کۆمەڵایەتی و کەسێتییەکانمان تیایدا ڕەگ و ڕیشە دادەکوتن. ڕەنگە چەند بەشێکی ماڵ وەك نیشتمان بۆ چەند ئەندامێکی جیاوازی خێزان بەکاربێت. پانتاییەکانی ماڵ بە بونیادە ماددیەکانییەوە دەپێورێت، بەڵام نیشتمان بە سنوورە رەمزییەکانییەوە دەستنیشان دەکرێت. ئەم سنوورانە دەرئەنجامی دۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی جۆرە شوناسێك و پرۆژەیەکن کە ئەمانەش پێبەپێی تەمەن و ڕەگەزەکان جیاوازن. نیشتمان زیاتر پانتاییەکی رەمزییە وەك لەوەی شوێنێکی ماددی ڕووت بێت.

لەوە دەچێت بەسەرنجراکێشانمان بۆ تایبەتمەندێتی چەمکە جیاوازەکانی نیشتمان، ناوەندێتی بیرۆکەی نیشتمان بشێوێت، بەهەرحاڵ، ئێستاکە، گرفتەکان زیاتر لە ناوخۆدا سەر هەڵدەدەن، ئێمە هەمیشە دەتوانین بەرگری لە نیشتمان بکەین کاتێك کە دووچاری هەڕەشەیەك دەبێت یاخود پاش هەر پەلاماردانێك، سەر لەنوێ دەست بە دروستکردنەوەی دەکەین، بەڵام چۆن مامەڵە لەگەڵ پرۆسەیەکی خاو، بەڵام سوور لەسەر ئەوەی لە ناوەوە هەرەس بە نیشتمان بێنێت، دەکەین؟ چی ڕوودەدات کاتێك هەستکردنمان بە نیشتمان پڕ لە کۆست و نسکۆ دەبێت" لە ئێستای بریتانیادا، قسەکردن دەربارەی نەخشە و سروشتی بوون نییە، بەڵکو زیاتر مەسەلەکان خۆیان لە چوارچێوەی قورسایی کاریگەری پارەی خانوو یاخود ترس لە دزین و بڵاوبوونەوەی تاوان و سیاسەتە توندەکانی پەنابەری دەبینێتەوە. چاودێریکردنی تەمەنداران و پەککەوتەکان لەلایەن هەندێ دەزگاوە کە پێیان دەوترێت هۆم. ئێستاکە، ماڵ بۆتە شوێنێك بە ترس گەمارۆدراوە.

## مێژووەکانی نیشتمان:

لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆردا، گرنگی نیشتمان وابەستەی پەیوەندییە بە دونیای دەرەوە. ڕەنگە نیشتمان شوێنێك بێت لە ناو دارستانێکدا، یاخود کامپێك بێت لە ناوەراستی بیابانێکدا، یان دوورگەیەك لەناو دەریادا. هەمیشە دونیای دەرەوە وەك شوێنێکی نەیار و تاریك و نوتەك وێناکراوە، وازانراوە لەودیو سنوورەکانەوە ئەهریمەن خۆی مەڵاس داوە و لە پشت کامپەکەوە هیچ ئاماژەیەك بۆ بوونی ژیان نییە. لە دەرەوە، لە ناوەراستی دەریاکاندا گۆڕانکارییەکان پێشوەخت و بەر لە خۆئامادەکردن ڕوودەدەن. ئەم جۆرە هەستە بەرانبەر بە دونیای دەرەوە وەك سەرچاوەی زیادکردنی هەڕەشە نادیارەکان وایکردووە پتر بایەخ بە نیشتمان بدرێت و وەك شوێنێکی ئارامبەخش و جێی دابینکردنی یاسا و پاراستنی ژیان تەماشا بکرێت. نیشتمان تەنیا شوێنێك نییە کە خۆتی لێبیت، بەڵکو شوێنێکی تایبەتە لەبەرئەوەی لەلایەن خەڵکەوە دەناسرێتەوە، لەوەندەش زیاتر لەلایەن یەزدانەوە. هەمیشە بەجێهێشتنی نیشتمان کارێکی پڕ مەترسی و سەرکێشی بووە. سەرنجەکانی نۆڤالیس بەوەی کە

"فەلسەفە بریتییە لە غوربەتی عەقڵ" ئاسوودەی لە زۆر لە شاکارە ئەدەبییە مەزنەکاندا بەرجەستە کردووە کە زۆربەیان لە جیهانبینینی تاراوگەوە هەڵقوولاون. ئەم دیدە بێگەردترین تێڕوانینمان پێدەبەخشێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاراوگە چەندین شتت لێ وون دەکات، بۆ نموونە، ئەو ئاماژانەی کە هەمیشە پێی ئاشنابووین. تاراوگە هەموو شتێک دەکاتە گرفت. تاراوگە بریتییە لە فڕێدانی کەس لە شوێنێک کە پێشتر لە ڕێی ئەزموونەوە ڕەفتاری تیاکردووە بۆ پانتاییەکی کۆمەڵایەتی کە تیایدا متمانە بە هیچ ناکات. تاراوگە بۆنی دەریا پەرەوازە دەکات و تیشکی خۆر کاڵ دەکاتەوە و شێوازە تایبەتییەکانی سڵاو لە یەکترکردن دەسڕێتەوە و ئەوەندەی لە ژیان مابێت دەکاتە سەرگوزشتەیەکی پڕوپوچ و سەخت. تاراوگەییەکان هەمیشە بەدەست خواردن و کەشەوە دەناڵێنن. دانتی، کاتێک کە لە زێدی خۆی لە فلۆرنس دوور خراوەتەوە، گرفتی هەرە گەورەی پلیکانە بووە. لە تاراوگەدا وزە نەرجسیەکانی خود و پرۆسیسەکانی گەشەسەندن کە لەلایەن خەڵکەوە شایستە دەکرێن، فەرامۆش دەکرێن.

کاتێک ئۆڤید دوور دەخرێتەوە بۆ ناوچەیەکی بچووکی دوور لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، دادوەرەکەی لەسەر دوو بنەما حوکمی دەدات، یەکەمیان: بارودۆخی دەوڵەت ئارام دەبێت کاتێک ئەم ڕەخنەگرە دوور لە وڵات بژێت، دووەمیان: چێژوەرگرتن لە بێدەنگکردنی ئەم "زمانە بەددە". سزادانی ئۆڤید تەنها بەو چەند میللە ناپێورێت کە دوورخراوەتەوە لە ڕۆما، بەڵکو بە پەیوەندیکردنی ئەم بە زمانەوە لەم ناوچە بەربەرییە و دوورە پەرێزە. ئەو لە بەکارهێنانی زمان چەککرابوو. لە دۆخی ئەم ڕەخنەگرەدا، شوێن دەبێتە هۆیەکی هەڕەشە بە مەبەستی بێدەنگکردن و لێکترازان لەگەڵ دۆست و باووباپیران و تەنانەت نەوەکانی ئاییندە.

ئەم دۆخە جیاوازانە لە نێوان نیشتمان وەک بەرجەستەکردنی کەلتوور و یاسا و مێژوو لەگەڵ تاراوگە وەک دۆخێکی پڕ ئاژاوە و کێوی و لە یادچوونەوە هەمیشە لە ئەدەبی نوێدا دووبارە بۆتەوە، هەر لە وێناکردنی نیشتمان وەک شوێنێک کە دەکرێت گوزارشت لە بەهای کەلتووری و گەشەسەندنی دابونەریتی تایبەتی تاوەکو نواندنی دۆخی پڕ هەست و سۆز کە ئەمەش ئێمە دەکاتە جۆرێک لە شایەتی شوناس، بەهەرحاڵ خاڵی نێوان شوناس و هوشیاریی مێژوویی دەگۆڕدرێت لە ساتی جەخت خستنە سەر پەیوەندی نێوان نیشتمان و نەتەوەوە. ڕەمزەکان و مێژووە گێردراوەکان تەنیا لەیەک حاڵەتدا بەرهەم دەهێنرێن ئەویش ئەگەر لە قەوارەی نیشتماندا ئاوێتە ببن. هەروەها دەبێت یادەوەریی ژیانی نەتەوە بگێردرێتەوە و ئەو زمانەی قسەی پێدەکرێت ببێتە ئامرازێک بۆ ناسینەوەی گیانی نەتەوایەتی. زمان و ئایین و شوناسنامە لەلایەن ستیڤن دێدالوس وەک زنجیرەیەکی بەیەکەوەبەستراو و بەرجەستەکراوە، بێگومان جۆیس هەوڵی ئەوەی نەداوە کە فێڵ بکات بەوەی لە ڕۆحیدا ویژدانێکی ناڕەسەن بخوڵقێنێت. ئەم پانتاییە ڕەمزییەی نیشتمان لە دونیایی نوێدا سەرسەختانە و لە هەمان کاتدا ڕووبەڕووی هەردوو بەها ترادسیۆنەکانی سەقامگیری و ئەو ئارەزووانەی هەوڵی گۆڕانکاری دەدەن دەبێتەوە. لە کاتێکدا کە میرسا ئیلیادە نیشتمانی ترادسیۆنەکانی وەک ئاستێک دەستنیشان دەکات کە دەبێتە هۆی یەکگرتنی مانا خۆماڵی و ڕۆحیەکان. کەسەکان بەشێوەیەکی ستوونی لە ڕووی کاتەوە بە نەوەکانی ڕابردوو دەبەستێتەوە و بەشێوەیەکی

ئاسۆیی لە ڕووی پانتاییەوە بە دۆستەکانییەوە دەبەستێتەوە. ئەم پرۆسەیە کە ڕێکەوتنێکی ئۆنتۆلۆجیانەیە لە زۆر لە خوێندنەوەکانی "گاستۆن باشلاردا" بۆ مانا مەجازییەکانی شیعری نویّ سەدای هەبووە. تەنها جیاوازی لە نێوان نیشتمانی کۆن و نویّ ئەوەیە کە یەکەم وەك دەفرێکی گەورەیە هەموو یادگارەکانمانی تیا هەڵگیراوە و جێیەکی نەگۆڕە بۆ ناسینەوەی شوناس، لە کاتێکدا دووەمیان وەك هۆنینەوەیەکی بێدەنگانەی خەونەکانمانە و تەنها خۆڕێکخستنێکی کاتییە و هیچی دیکە. جۆن بێرگەر ئاماژە بە خەونە لەرزۆکەکان و زەمینە لاوازەکان لە دونیایی نوێدا دەکات کاتێك کەوتوویەتی "نیشتمان چیدی شوێنێك نییە لێی نیشتەجیّ بووبین، بەڵکو چیرۆکێکی نەگێردراوی ژیانێکە بەسەری دەبەین".

کاتێك جۆرج لۆکاش چەمکی "گەیشتن بەو دیو ماناکانی ئاوارەیی داهێنا" ئەو چەند لەبارەی بارودۆخی رۆشنبیرییەوە قسەی دەکرد ئەوەندەش لە چارەنووسی تاکەکەسەکان. هەننا ئەرێندت لەو فەیلەسوفانە بووە کە توانیی لە پاش پەرینەوە تراجیدیایەکەی پایرێنس کە والتر پینجامین گیانی لەدەستدا، لە نازیەت دەرباز بێت و بگاتە نیویۆرك و ئەو تەمەنەی مابووی بەسەر بەرێت بەبیّ ئەوەی جانتاکانی سەفەری لە کەلوپەلەکانی بەتاڵبکاتەوە. ئەم گوزارشتە پڕ ڕەمزە بۆ بوونی ئاوارەیی، ڕەتکردنەوەی نائومێدییە دەرهەق بە نیشتمان. بۆ تاراوگەیەك، تەنها سیّ ڕێگاچارە لە بەردەمیدایە، دواخستنی پڕۆژەی گەڕانەوە تاوەکو کاتێك گونجاو دەسازێت یان دۆزینەوەی نیشتمانێکی نویّ، لێرەو هەر ئێستا، یان دواجار شێتبوون. تاراوگەیی دەچێتە دۆخێکەوە کە درك بە وەهمە پێویستیەکانی ئاوێزانبوون لەگەڵ نیشتمان دەکات هەروەها لەگەڵ سنوورە مەزەنەکراوەکانی ئینتیمابوون. لە شاکارەکەیدا بە ناوی مینیما مۆرالیا، تیۆدۆر ئەدۆرنۆ باس لە ئەزموونی خۆی لە تاراوگە دەکات و بەم جۆرە دەدوێت: هاوسەنگیەکی لێوانلێوە لە ترازان لە ڕابردوو و پەیوەندیەکی ژەهراوییە لەگەڵ ئێستادا. ئەدۆرنۆ خۆی ئەشکەنجەی خۆی دەدات و بەردەوام سزای خۆی دەدات لەبەر مەترسی لەدەستدانی زمان و خیانەتکردنی لەبەهاکان و هەرەسهێنانی هۆشیاریی مێژوویی. لە پاش کامپەکانی هۆلاکۆست، تاراوگە بووە دۆخێکی هەمیشەیی، هەرچەندە قەرەبوو کردنیان بۆ ئایندەیەکی نادیار دواخرا.

## نەخشەکێشانی دونیا لە نیشتمانەوە

نەخشەکێشانی جیهان هەر لە سەرەتاوە بە دەستنیشانکردنی نیشتمان دەست پێدەکات. ماوە جیاکەرەوەکانی نێوان خود/ئەو، ناوەوە/ دەرەوە، یاسا/ ئاژاوە پێشتر بە دەوری ئەو بونیادەی نیشتماندا دەخولێتەوە کە لێوەی بەهاکان ڕێچکەیان بەستووە. نیشتمان ئەو شوێنەیە کە هەموو سەرگریّ و سیستمە ئەخلاقییەکان تیایدا دەهۆنرێتەوە و یەك دەگرن. لێکۆڵینەوەی زانستی گەردوون ئەوەندە گرنگە کە لە مەسەلە ناوخۆییەکان (لۆکەڵییەکان) بکۆڵێتەوە و لە مەسەلە دەرەکییەکان جیایان بکاتەوە. گرنگی نیشتمان نەبەستراوە بە ڕادەی دژایەتیکردنی پانتاییەکی دەرەکییەوە، بەڵکو لە نێوان ئەو پانتاییە تایبەتییانەی کە وەك ماڵ ڕێکخراون و پانتاییە دەرەکییەکان کە ئاژاوە خەسڵەتییەتی کۆمەڵێك پانتایی دیکە هەن کە دەکەونە نێوانیانەوە. بۆ یۆری لۆتمان، زانای ڕووسی لە زانستی

ئامازەناسیی کەلتووریدا، چەندین جۆری جیاوازی دژە نیشتمان لە نێوان نیشتمان و دۆخی ئاوارەییدا بیناکراوە. بۆ ئەوانەی کە دژە نیشتمانن، ئەوە دووپاتدەکەنەوە کە نیشتمان وەك میکانیزمێکی نەخشەکێشانی سەرەکی بەکارهاتووە لەبەرئەوەی دەستنیشانکردنی شوناسیان پابەندە بە نموونەترین جۆری نیشتمانەوە، هەروەها دۆخی بێدەنگی بەخاڵێکی سەرەکی لە نێوان لایەنگرانی نیشتمان و دژە نیشتمان دەژمێردرێت. بێدەنگی لە نیشتماندا مانای ئاشتی و ئاسوودەییە، لە کاتێکدا لەلای دژە نیشتمان بێدەنگی بە جۆرێك لە ئازار پڕ دەبێتەوە، ئازارێکی بێ زایەڵە.

ڕەخنەگرە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوانەی کە تازەگەری وەك جۆرێك لە پێشبینیکردن دەبینن، ئەو هەلومەرجەی کە ڕەخسابوو بۆ پۆلێنکردنی هەموو شوێنەکانی نەبوونی و بێدەرامەتی بۆ دژە نیشتمان نەقۆستەوە. هەمیشە ئەوانەی دژە نیشتمان/ ماڵەوەن وا ناسراون کە لە ڕۆخی شارەکان، یان لە ڕێرەوی شەمەندەفەرەکانی ژێر عەرددا، دەژین یان ئەو گەڕۆکانەن کە لە ڕێگا پان و بەرینەکاندا گەورەبوون، بۆ نموونە ماڵە سۆزانییەکان، لەو شوێنانە دادەمەزرێن کە کرێکارە نێرینەکانی دونیای پیشەسازی لێیان خڕدەبنەوە. وا تەماشا دەکرێن کە ئاراستەی بە تەواوی پێچەوانەی دابونەریتی ژیانی تایبەتی کەسە. لە تێڕوانینی "لۆتمان"ەوە، دژە نیشتمان بەهۆی گۆڕینی ئاراستە نەگۆڕەکانی دابونەرییتەوە پێناسە ناکرێت، بۆ نموونە، ڕەنگە ماڵە کارتۆنیەکان کە گەشکەرەکان لەبەردەم کۆگا گەورەکاندا ڕایدەگرن و خۆیان دووچاری مەترسی دەکەن، لەناوەوە جۆرێك لە یاسا و ڕێسا سەرەکییەکانی ماڵی تێدا بێت. ئەوەی نیشتمان لە دژە نیشتمان جیادەکاتەوە

وێرانەی ماڵ و نەبوونی و فەرامۆشکردن نییە. لە دیدی "لۆتمان "ەوە، هەمیشە دژە نیشتمان لە نێوان ئیرەیی و بەربەرەکانیدا دابەش بووە. بە پێچەوانەوە نیشتمان ئەو شوێنەیە کە تۆ دووریت لە هەر جۆرە گومانلێکردنێك و تۆمەتکردنێك، ئەو شوێنەیە کە ئینتیمابوون ئازادە لە نەفرەتی ئەهریمەن و لە هەستکردن بە قورسایی ململانێکان، یاخود وەك ئەوەی جارێکیان کەسێکی شاری لە ئوستورالیا وتبووی نیشتمان/ ماڵەوە ئەو شوێنەیە کە دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت گۆرانی بڵێیت بەبێ ئەوەی گوێ بدەیتە ئەوەی دراوسێکانت چیت پێدەڵێن. بە واتایەکی دیکە هێنانە خوارەوەی پەردەکانی ماڵەوە هەمیشە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەمە دەستپێکی سەربەستییە و بەخشینی هۆگرییە، بەڵکو زۆرجار ئەو پەردانە ئەو شتانە دەشارنەوە کە شەرمیان لێدەکەین. هەمیشە خەڵك هەوڵ دەدەن کە ژیانی تایبەتی کەس بپشکنن و لێی وردببەنەوە.

دەستنیشانکردنی نیشتمان وەك شوێنێك کە پەیوەندییە خێزانییەکان و کەسێتییەکان تیا پەرە دەستێنێت، هەروەك دیڤد مۆرگان باسی لێوەکردووە، دیاردەیەکی هەمیشەی و سیفەتێکی گەردوونی یان کۆمەڵایەتی نییە. بەهۆی جۆرە جیاوازەکانیەوە دەتوانرێت لە بەهاکانی نیشتمان تێبگەین. مشتومڕەکەی مۆرگان ڕۆشنایی دەخاتە سەر دوو پەیوەندی سەرەکی.

یەکەمیان پەیوەندی توندوتۆڵی بە ستراتیژییەکانی چاودێریکردنەوە، دووەمیان بە ڕەگەز کردنی پانتاییەکان. کاتێك چەمکی نیشتمان دەبەسترێتەوە بە ژیانی خێزانەوە، ئەم پانتاییە وەك جۆرێك لە دایکایەتی یان فیمنییزمی دەناسرێت. بەهەرحاڵ، هەموو بەشەکانی ماڵ موڵکی ئافرەت

نییە، دابەشکردنی کار، هەر لە چێشتخانەوە تاوەکو گەراج جۆرە سنوورێکی ڕەگەزانەی تێدایەکە پانتاییەکانی ماڵەوەی تیا جیادەکاتەوە ئەنجامدانی کارە ئاساییەکان، بۆ نموونە، کێ خۆڵەکە بڕژێت؟ ڕەنگە بەردەوامی سنوورەکان دەربخات لە نێوان ناوەوە و دەرەوەدا، لەبەرئەوەی دونیای دەرەوە واناسراوە کە شوێنێکی پڕ مەترس و شەخسی نییە، ئەوا ماڵەوە/ نیشتمان دەبێتە شوێنی ئولفەت و هۆگربوون. ڕەنگە برادەرە شارییە ئوستورالییەکە کەنار بگرێت لە ناو فانتازیای ئەو سەربەستییەی کە لە ماڵەکەیدا هەیە، بەلأم ئەم سەربەستییە پابەندی دابینکردنی سەقامگیرییەکی کۆمەلأیەتیی بەرفراوانترە. لە دونیایەکدا کە متمانەپێکردن تا ڕادەیەکی زۆر نەماوە، ئەو چاوانەی کە چاودێری دراوسێکانیان دەکرد بوونە هۆیەك بۆ خۆپاراستن دژی ڕوودانی تاوان و چاودێریکردنی هەر پێشێلکردنێك کە منداڵ تووشی ببێت یان پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت. هەر لەبەر ئەوە ژیانی تایبەتی ماڵەوە دوورە لە زامنکردنەوە.

## گەڕان بەناو تازەگەریدا

چەمکی نیشتمان لە دونیای تازەگەریدا چەمکێکی ئارام نییە. یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی تازەگەری ئەوەیە کە لە نیشتمانە کۆنەکەت بێیتە دەرێ، بەلأم هەرگیز شوێن و قەوارەیەکی دیاریکراو بۆ نیشتمانێکی نوێ لەناو دونیای تازەگەردا نییە. لە تێڕوانینی نوێخوازێکەوە دەبێت نیشتمانی کۆن بەجێبهێڵرێت لەبەرئەوەی سەر بەزەمەنێکی وەستاو و بەستەڵەکی ڕابردووە: واتە پابەندی دابونەریتە نەگۆڕەکانە و سنووردارە تەنها بۆ چەند ئەندامێك و بەهۆی شێوازێکی باوکانەیی دەستەلأتدارانەوە حوکم دەکرێت و چەندین بیروڕای غەیبی کۆنترۆڵی دەکات. بەکورتی نیشتمانی کۆن نوێنەرایەتی ترادسیۆنە داخراوەکان دەکات. مانەوە لەوێ مەرگ خۆیەتی، بەلأم نوێخواز هەست دەکات کە ئێستا دۆخێکی کراوەیە، زیاتر هانی گەڕان دەدات وەك لە مانەوە و سەقامگیری و هەروەها جیاوازی وەك هۆیەك بۆ هێنانەکایەی شتێکی تازە و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێت هەر بڕیار دەرکردنێك هاوبەشانە بێت و دانبەوەدا دەنێت کە عەقڵ سەر بۆ یەزدان دانانەوێنێت.

نوێخواز هەمیشە دەیەوێت پاشماوەی دابونەریتەکان (ترادسیۆنەکان) ڕامالێت بەلأم کاتێك دێتە سەر کێشەی نیشتمان دۆخێکی پڕ دڵەڕاوکێ دەخولقێنێت. ئەگەر تازەگەری ڕابردوو ڕامالێت دەبێت لە ئێستادا شێوازێکی نوێ لەناو ژیاندا بخولقێنێت. ئەو فۆرمانەی کە گوزارش لەم سەردەمە نوێیە دەکەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە شوناس پابەندی ڕابردوویەکی یان شوێنێکی دیاریکراو نییە. چەمکی مۆدێرنی "مرۆڤ خۆی خۆی دروست دەکات" پێویستی بە نیشتمانێکی نوێیە، بەلأم نیشتمانی مۆدێرن خەسڵەتێکی ناکۆکی لەسەردەمەکەیدا هەیە. ئەگەر بەهاکانی نیشتمان ڕەگی لە ترادسیۆنەکاندا چەقاندبێت، ئەوا نیشتمان لە دونیای تازەگەریدا لە باشترین حاڵەتدا ئەو پانتاییە چوارگۆشەییانەیە کە ڕابردوو داگیریکردوون یان ئەو مۆزەخانە جەنجاڵانەیە کە بەهای هونەری بۆشە و یادەوەری سیمای سەرەکییەتی.

چەمکی نیشتمان پانتاییەکی زۆری لە تازەگەریدا داگیرکردووە. لە سەردەمێکدا کە دەربازبوون لە نیشتمان بە یەکەمین هێمای سەربەخۆی دەژمێردرێت بەلأم ئاراستەیەکی ڕوون و

دڵنیا نییە و ئاسۆی دۆزینەوەی نیشتمانێکی نموونەی هەمیشە لەژێر هەڕەشەدایە، هەرەشەی مانەوە لە دۆخێکی هەمیشە ئاوارەبووندا. ڕەنگە تازەگەری بە تەواوی ئیلتیزامی بە پرۆسەی نەمان یان هەڵوەشاندنەوەی دابونەریتەکان هەبێت بەڵام پرۆسەکە یان هێنانەدی ئاواتە ناوەندییەکانی پڕ مەترسیین یان ئەو ئامانجانە هەموویان نایەنەدی. زۆر لە نوێخوازەکان، وەك بایرۆن هۆسمان کە پانتاییان یان وەك قۆناغێکی بێلایەن تەماشاکردووە یان وەك کۆسپ لە بەردەم بە گەیشتن بە ئاسۆ یۆتۆپاییەکان، سەرکەوتوو نەبوون لە مەزەنەکردنی ئەوەی کە مانا دەوڵەمەندەکانی ئەزموونی نیشتمان تۆکمانە پابەندی پرۆسەی دروستکردنی ئۆنتۆلۆجیان.

گرنگی ترادسیۆن لەوەدایە کە کەسایەتییەکان شوناسیان لە نێو هاوکێشەی زەمەن — پانتایی پێکەوە دەبەستن، هەروەها شێوە و شێوازن بۆ گوزارش لە یادەوەری و ماناکان. گریمانە تەکنۆکراتییەکان دەڵێن: دەکرێت واز لە ترادسیۆن بهێنرێت، ئەوان وا پێناسەی دەکەن کە وەك پێستی مار وایە لە پاش تەواو بوونی وەرز پێویستت پێنامێنێت. ئەم بەراوردکردنە ئەو خاڵە لە یاد دەکات کە ترادسیۆن توانای هەیە سەرلەنوێ خۆی ببوژێنێتەوە وەك چینێکی دیکەی پێست سەرهەڵبداتەوە. ئەم هەڵە کاریگەرە بە درێژایی خیتابەکانی تازەگەری دووبارە دەبنەوە. کاتێك مارکس ئەو تێگەیشتنەی پێبەخشین کە بەرەو تازەگەری ڕاپێچیکردین بەهۆی دەستەواژە ڕەمزییەکەیەوە کە دەڵێت: "ئەو شتانەی کە پتەو و ڕەقن لە هەوادا دەتوێنەوە" ئەم دەستەواژەیە وەك پێشبینیکردنی بۆ مەترسی هەڵوەشاندنەوەی ترادسیۆنەکان بوو. ئەم ئاوێتەبوونەی خێر و شەڕ ترادسیۆن لە تازەگەریدا بە توندی لەلایەن دامەزرێنەرەکانی تیۆری کلاسیکی کۆمەڵایەتییەوە دووپاتکراوەتەوە. ئەم کۆسپە گەورانەی لەبەردەم رۆشنگەریدا بوو بە قووڵی هەستپێدەکرا کە دژی ترادسیۆنە، وەك سەرچاوەی چەواشەکردن و دوژمنی عەقڵ و کۆسپ لەبەردەم پێشکەوتندا تەماشادەکران. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ترادسیۆن بوو کە چوارچێوەیەکی تەفسیری و تۆڕێکی دڵنیایی بە مانا کۆمەڵایەتیەکان بەخشی.

ئەو بەها ئەخلاقیەی کە وەیبەر لە دەستەواژەی "قەفەزی ئاسنینی بێئومێدی"دا وەسفیکردووە و هەروەها یاداشتەکانی دۆرکایم کە باس لە تێکچوونی پارسەنگ دەکات ئەوەندەی لە نیشتمانی مۆدێرندا ئازاری چەشتووە لە هیچ شوێنێکی دیکە نەیچەشتووە.

وێرای ئەوەی دڵەراوکێیەکی هاوچەرخانە سەبارەت بە بارودۆخی نیشتمان/ ماڵ هەیە کە تیایدا کاردانەوەکان هەمەجۆرن، هەر لەوپەڕی نەزۆکی نیشتمانەوە کە لەپلانەکانی لیَ —کۆربیسەر تا دەگاتە شێوازە ئاوارەییەکانی سەر شەقامەکانی ئەمەریکا کە سۆرکین و ئەوانی دیکە وەسفیان کردووە، بەڵام هەر کامێکیان بێت، لەوە ناچێت کە چەمکی نیشتمان/ ماڵ لە دونیای تازەگەریدا چەمکێك بێت بەسەر بچێت. گەڕان بەدوای نیشتماندا نەگەڕانەوەیەکی نۆستالیجیایانەیە بۆ ڕابردوویەك کە پێی ئاشناین، نەپەرچەکردارێکی بەرگریانەیە دژی توندوتیژی ئێستا. ماناکانی نیشتمان لەو پرۆژانەدایە کە ریشەیان لە ئاییندەدا داکوتاوە و هەستی ئینتیمابوون لە دۆخی گۆڕان و جێگۆڕکێکردندا دەخولقێنێت.

لازلۆ ماهۆلی— ناگی، یەکێك لەو هونەرمەند و ڕەخنەگرە دەگمەنانە بوو کە درکی بەوە کردبوو

گرفتی خانووبەرە ئەوەندە گرنگە کە تەنها گرفتی پسپۆران نییە. بە درێژایی لێکۆڵینەوەکانی باس لەوە دەکات کە پەیوەندیمان بە پانتاییەوە هەرگیز بێلایەن نییە بەڵکو هەمیشە گوزارش لەو ناکۆکیە فراوانە دەکات کە کاریگەری لەسەر چڕی و ڕوون و ئاشکرایی بەسەربردنی ژیان هەیە لە ڕەوتێکی مۆدێرندا. هەر بۆیە ئەم جۆرە خواست و ئاواتە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو پانتاییەی کە ئێمە نیشتەجێین، ئەو تێبینی کردووە، بە تەواوی نامۆیە بە کاری بیناسازێك. وێرای پێویستییە سەرەکییە جەستەییەکانی، مرۆڤ دەبێت پانتایی بە جۆرێکی دیکە لە ماڵەکەیدا تاقیبکاتەوە — لانی کەم، فێربێت کە تاقیبکاتەوە. نابێت ڕێبەوە بدرێت ماڵ بکرێتە پانتاییەك تەنیا بۆ هەڵاتن و داڵدەدان بەڵکو دەبێت پانتاییەك بێت بۆ ژیان و پەیوەندییەکی دڵسۆزانەی لەگەڵ دامەزرێت.

کێشەی ئینتیمابوون لە دونیای تازەگەریدا پێویستی بەوەیە ریشەییانە بیر لە پەیوەندیمان لەگەڵ پانتاییدا بکاتەوە. لە تیۆری کۆمەڵایەتی کلاسیکیدا، ئەو تێگەیشتنە باڵاییەی کە بوونی هەیە لە ناکۆکییەکی توندەوە سەرچاوە دەبەستێ کە لەو بڕوایەدایە نیشتمانی ترادسیۆن و کلاسیك شوێنی گونجاندن و ئاسوودەییە، لە کاتێکدا نیشتمان لە دونیای مۆدێرندا شوێنی گوزارشکردنە لە خود و سەربەستی. ئەم دۆخە نائارامە لە داواکاریەکانی هەر گەنجێکدا ڕەنگیداوەتەوە: "من پانتاییەکەم بۆ خۆم دەوێت" ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بەوەی کە چوارچێوەیەکی سنوردار هەیە بۆ تێگەیشتن لە مانای گۆران لە کەلتووردا بەوەی کە پانتاییەکانی رابردوو لە ناوچەیەکی داخراودا بەرجەستە بووە. ئەمە زیاتر لەو پێناسە کلاسیکیانەی کۆمەڵگە دیارە کە جەخت لەسەر یەکەیی مەبەست و نیشتەجێبوون لە شوێنێکی دیاریکراودا دەکات. ئەو بیرۆکەیەی کە پێیوایە کۆمەڵگە نەوەك تەنیا لە بەشداربوون لە بەرژەوەندییەکی هاوبەشی گروپێکدا بەڵکو لە چوارچێوەیەکی جیهانی هاوبەشدا" کە تەواو فراوان، تەواو سەرتاپا بۆ ئەوەی ژیانیانی تیا بێت" دەخولقێت. ئەم بیرۆکەیە تا دێت وا دەردەکەوێت کە دوورە لە هەبوونەوە. ئەم تێڕوانینە بۆ ئینتیمابوون لە ئێستادا ملکەچی ئەو شێوازەی بیرکردنەوەیە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کۆچبەری گەردوونی و بە پیشەسازیکردنی دونیا بوونەتە لاوازکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان و خولقاندنی فۆرمە کەلتوورییە تێکەڵەکان. "ئەنتۆنی گیدەنس" دەڵێت کە سیمایەك لە سیماکانی تازەگەری ڕووخاندنی پابەندبوونە بە شوێنەوە. داینامیکیەتی تازەگەری بۆ خولقاندنی پەرتپەرت بوون و پەڕەوازییە، هەر لەبەرئەوە ناسینەوە بەهۆی شوێنەوە دەبێتە مەسەلەیەکی لاوەکی و پچڕاو لە هەر لەو سیفەتانەی کە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی تیایدا بەرجەستەبووە. "گیدەنس" دەڵێت:

لە کۆمەڵگا ترادسیۆنەکاندا. ڕابردوو بەرز ڕاگیراوە و رەمزەکان

بەهادارن لەبەرئەوەی ئەزموونی بەردەوامی نەوەکانی تیادایە.

ترادسیۆن هۆکارێکە بۆ بەڕێوەبردنی کات و پانتایی، کە هەموو چالاکییەك یان ئەزموونێك لەناو دۆخی بەردەوامی

ڕابردوو، ئێستا، ئایندە دەگرێتەخۆ ئەمانیش یەك لە دوای یەك

بونیادێك دروست دەکەن لە هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکاندا.

ل‌ه دونیای تازه‌گه‌ریدا، شوناس چیدی به‌هۆی په‌یوه‌ندییه تایبه‌ت و ئۆتۆماتیکیه‌كانه‌وه له‌گه‌ڵ كات و شوێندا دیاری ناكرێت. پرسیاری "من كێم؟" ته‌نیا به ده‌ستنیشانكردنی شوێن یان زێد یان ئه‌و كاته‌ی كه به‌سه‌ریده‌به‌ین وه‌ڵام نادرێته‌وه. له‌به‌رئه‌وه‌ی بچووكترین كۆمه‌ڵگه‌ی ناوچه‌ی (لۆكه‌ڵ) له ژێر كاریگه‌ری پرۆسێسه گه‌ردوونیه‌كاندایه. پرۆسه‌كانی به‌جیهانیبوون و ته‌نانه‌ت ستراتیژه‌كانی به‌رگریكردن له ناوچه‌یبوون هه‌ردوكیان له "چوارچێوه‌ی پرۆسه‌ی ماوه‌كردنی كات – پانتاییه"، گیده‌نس پرۆسه‌ی لێكترازانی په‌یوه‌ندیه‌كان له‌گه‌ڵ ناوچه‌دا به لێكترازان له سیستمی كۆمه‌ڵایه‌تی وه‌سف ده‌كات. ته‌متومانی چه‌مكانه‌ی نیشتمان و كۆمه‌ڵگه له ئاره‌زوو و خواسته نه‌هاتووه‌كانی شێوازی خێزانی و ناوماڵ له سه‌رده‌مێكی ناجێگیردا ڕه‌نگیداوه‌ته‌وه.

نوستالیجیای مۆدێرن خۆزگه‌یه‌ك نییه بۆ گه‌رانه‌وه بۆ ره‌حمی دایك. قه‌یرانه‌كانی كۆچبه‌ر به‌وه چاره‌سه‌ر نابێت كه خۆی كۆبكاته‌وه و بڕواته‌وه. ڕێژه‌یه‌كی كه‌م له‌و كه‌سانه‌ی گه‌راونه‌ته‌وه بۆ زێدی خۆیان ئه‌و ئه‌نجامه‌یان له‌لامابۆوه كه گه‌ڕانه‌وه‌یه یان گه‌ڕانه‌وه‌یه‌كی سه‌ركه‌وتوو نه‌بوو، نه‌وه‌ك ته‌نیا له‌به‌رئه‌وه‌ی كه شاره‌كه‌ی گۆراوه و ئه‌م گۆڕانه ئه‌و هه‌سته‌یان پێده‌به‌خشێت كه هێشتا ئه‌مان له ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و شوێنه‌ن، وێرای ئه‌مه‌ش، خۆزگه‌یه‌كیان هه‌یه كه ده‌یانه‌وێت ببنه خاوه‌نی شتێك له ناو ئه‌و شاره‌دا كه گۆڕاوه و كه نوێیه. هه‌ر له‌و كاته‌وه‌ی كه له گه‌ره‌كی كۆچبه‌ره‌كان له مێلبۆن له ئوستralیا گه‌وره بووم، دركم به‌و راستییه كرد كه نیشتمان/ ماڵ وه‌ك نمونه‌ی ناو تاقیگه وایه بۆ تێگه‌یشتن له تازه‌گه‌ری. كۆچبه‌ره یۆنانییه‌كان بایه‌خێكی زۆریان ده‌دا به كڕینی خانوو، نه‌وه‌ك ته‌نیا پاره‌ی بانقیان له ماوه‌یه‌كی كه‌مدا ده‌دایه‌وه و فیداكارییه‌كی زۆریان ده‌نواند، به‌ڵكو بونیادی ئه‌م خانووانه ببوونه ره‌مزی سه‌فه‌ره‌كانیان. پانتایی باغچه‌كانیان رێكخستبوو بۆ ئه‌وه‌ی سه‌وزه‌ی تیا بچێنن، كۆڵه‌كه كلاسیكیه – نوێكانیان لابردبوو و له جێگایدا كه‌وانه رۆمانیه‌كانیان دانابوو. ته‌ماته و سه‌وزه‌یان خستبووه لایه‌كه‌وه و دره‌ختی بنێشت و رووه‌كه‌كانی دیكه له‌لایه‌كی دیكه، هه‌روه‌ها گۆڕینی جۆگه‌له پته‌وه‌كان گوزارشتی ته‌نیا له پاك و خاوێنی نه‌ده‌كرد به‌ڵكو له په‌یڕه‌وكردنی پێوه‌ره مۆدێرنه‌كانیش. كه مشتومڕه‌كانی "هۆمی باباها" سه‌باره‌ت "دوو پێشینه" له كه‌لتوور و كۆچبه‌ریدا ده‌خوێنمه‌وه، كه به‌شێكه له ئیستاتیكای ئاواره‌یی، ده‌ستبه‌جێ دراوسێكانم وه‌بیر دێته‌وه كه چه‌ندین نیگاریان له‌سه‌ر ده‌رگاكانیان نه‌خشاندبوو. هه‌ر كاتێك دێنه‌وه ماڵه‌وه ئه‌و دیمه‌نانه‌یان دێته‌وه یاد كه له لایته‌كه‌ی باوكییانه‌وه ته‌ماشای ماڵه كۆنه‌كه‌یان ده‌كرد: به‌له‌مێكی بچكۆلانه له رۆخی به‌نده‌رێكدا كه‌ناری گرتووه و رووی خانووه‌كه به‌رامبه‌ر به‌رده‌ڵانی به‌نده‌ره‌كه بیناكرابوو. ئه‌م پۆسته‌رانه‌ی به‌ده‌ست نووسراون ره‌نگدانه‌وه‌ی دونیاییه‌كی دیكه‌یه، له‌ناو مێشكییاندا بوونی هه‌یه. هه‌ر بۆیه، بۆ نموونه خێزانێكی ڤێتنامی، كۆچبه‌ر زیاتر له دونیایه‌كی هه‌یه. باشترین پێناسه بۆ كۆچبه‌ری ئه‌وه‌یه كه زنجیره شه‌پۆلێكه، كۆچبه‌ر له هه‌مان كاتدا حه‌ز به دووباره بوونه‌وه و جیاوازی ده‌كات و ماڵی كۆچبه‌ر بریتیه له تێكه‌ڵه‌یه‌ك له شته نوێكان و ئه‌و شتانه‌ی پێی ئاشنان.

هه‌ستكردن به‌وه‌ی ئه‌و "گۆڕانه گه‌وره‌یه" كه به هۆی تازه‌گه‌رییه‌وه ده‌ستپێكرد، زۆرجار له گوێزانه‌وه له "كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی زانراوه" وه بۆ "كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی مه‌زه‌نه‌كراو" نه‌خشێنراوه. كۆمه‌ڵگه

**ترادسیۆنەکان بە "زانراو" لەقەڵەمدراون لەبەرئەوەی زۆربەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای رووبەروو و کەسایەتی بوون. ناسینی خەڵك زۆر جار لەسەر بنەمای پەیوەندییە نزیکەکان و کەسییەکان یاخود لە رێگای فۆرمە زارەکیەکانی چیرۆك گێڕانەوەوە بووە. بە پێچەوانەی ئەم دۆخەوە، لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا هەروەك "بێندك ئەندرسن" ئاماژەی پێداوە، بەیانکردنی هەستی کۆمەڵگەیە لەسەر ئاستێکی فراوانتری پانتایی کۆمەڵایەتی. خەسڵەتی سەرەکی یەکیەکەی لە نەتەوەی مۆدێرندا لەسەر بنەمای گەشەسەندنێکی شاقووڵی پەیوەندییە ناوچەییەکان و نزیکەکان دەستنیشان ناکرێت، بەڵکو پەیوەندیەکان لەگەڵ ئەندامەکانی دیکە ئاسۆیی و مەزەنەکراون.**

**مەزەنەکراوە لەبەرئەوەی تەنانەت ئەندامانی بچوکترین نەتەوە یەکتر ناناسن و یەکتر نابینن یان گوێیان لێبێت، بەڵام لە هەمانکاتدا لە مێشکی هەر یەکەیاندا وێنای خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان دەژێن.**

**لە فیکری هاوچەرخدا، چۆنێتی گوێزانەوەی ئەو هەستە هاوبەشە مەزەندەکراوە بۆ پێکەوەنانی فۆرمێکی ئەبستراکت لە پابەندبوونی کۆمەڵایەتی کێشەیەکی سەرەکییە. ئەندرسۆن جەختی لەسەر گرنگی میدیای چاپکراو لەم بوارەدا کردووە کە دەتوانێت بەرجەستەی ئەو رەمز و ترادسیۆنانە بکات کە لە رەگەزەکانی ناسیۆنالیزمدا هەن. رێژەیەکی کەم لە تیۆریستە کۆمەڵایەتییەکان پەرەیان بەم فیکرەداوە بەوەی گرنگی بە میدیا پشتبەستوو بە کامێرا بدەن لە بیناکردنەوەی شوناس لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا. "جۆن تۆمپسن" لەم دواییەدا پیادەکردنی ئەو پەیوەندییە گرنگە لە رێگای تەکنەلۆجیای میدیاوە وەك بەشێك لە دروستکردنەوەی ترادسیۆن تیۆرکردوە. بەهۆی پەرەسەندنی میدیاوە کەسەکان زیاتر شارەزای رووداوەکان بوون، زیاتر چاودێری دەکەن، بە گشتی زیاتر شارەزای جیهان دەبن، هەردوو جیهانەکە، راستەقینەکە و مەزەندەکراوەکە — جیهانێك کە لەو دیوو پانتایی ژیانی رۆژانەوە بوونی هەیە. باسە بە میدیاکراوەکان کە دەگەنە شوێنە دوورەکان شێوازی نوێی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەخوڵقێنن. ناوەرۆکە رەمزییەکانی ئەم شێوازە نوێیانەی پەیوەندیکردن خۆی لە خۆیدا خوڵقاندنی پەیوەندی نوێیە بە شوێنەوە. "پۆل ڤیریلیۆ" هەنگاوێك لەمە زیاتر رۆیشتووە و باسی لە کاریگەری کامیرای پشت ئەستور بە تەکنەلۆجیای نوێ کردووە کە چۆن پەیوەندی ئێمەی بە ئیدراك و دەزگاوە لە هەمانکاتدا گۆڕیوە.**

**تێڕوانینی ڤیرلیوس سەبارەت بە گۆڕانی پەیوەندی نێوان بینین و ئەزموونەوە، دەمانگەیەنێتە تێگەیشتنێك بۆ دوو خاڵی سەرەکی یەکەمیان هەڵوێستی رۆژانە سەبارەت بە دیمەنی ئازار و ئەشکەنجەی خەڵك و دراما کە لە تەلەفزیۆنەکاندا رەنگدەدەنەوە، دووەمیان هێماکردن بەو تێچوونانەی کە بینین بەخۆیەوە دەبینێت وەك هۆکارێکی بالاّ لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان مەعریفە و دەسەلاّتدا. بێگومان تازەگەری هەوڵدەدات بەوپەری توانایەوە بۆ فراوانکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنگەری بینین/ تێڕوانین.**

## بەجێهێشتنی نیشتمان

نە لە نیشتمانێکی نوێ و نە لە ڕۆخی دەریایەکی دیکە
کەنار دەگریت
ئەم شارە هەمیشە بەدوودا دێت
لە هەمان شەقامدا پیاسە دەکەیت و هەر لەوێ گەورە
دەبیت
لە هەمان گەرەک تەمەن بەسەر دەبەیت و
هەر لە هەمان خانوو سەرت سپی دەبێت
تۆ هەر لەم شارەدا دەگیرسێیتەوە

(کاڤافی)

دەمەوێت کۆتایی باسەکەم بە پرسیارێك بهێنم "ئایا ئێمە دەتوانین نیشتمان بەجێبهێڵین؟" ئەم پرسیارە لە پرسیارێکی دیکەوە ڕێچکەی بەستووە کە ئەویش ئەوەیە: "چ جۆرە ئەرکێکمان بەرامبەر نیشتمان هەیە؟" ئەم هۆنراوەیەی کاڤافی لە زللەیەکی توند دەچێت ئاراستەی ئەفسانەی مۆدرێنی دەکات کە پێیوایە بە بەجێهێشتنی نیشتمان مرۆڤ دەتوانێت لە رابردوو رابکات. بە پێچەوانەوە، بیرکردن و حەز بۆ دووبارەبوونەوە هەموو جەستەی مرۆڤ داگیردەکات، ئەو مرۆڤەی پێیوابوو دەتوانێت خودی کۆنی خۆی بەجێبهێڵێت، بیرۆکەی گەڕانەوە هەموو جەستەی سڕ دەکات وەك ئەوەی دەمارەکانی پڕ خوێنی سارد بووبێت. ئەمە هۆنراوەیەکە رەخنە لەو کەسە دەگرێت کە پێیوابوو دەتوانێت گرفتەکان چارەسەر بکات بەوەی هێدی هێدی لە زێدی خۆی دوور بکەوێتەوە، نەیدەزانی کە رابردوو هەمیشە لە ناخی خودا هەڵکۆڵراوە. هەرگیز نیشتمان لە پاش خۆت بەجێناهێڵرێت.

وێڕای ئەمەش، بیرۆکەی هەڵاتن، لەم سەردەمەدا بیرۆکەیەکی باڵایە، لە تێڕوانینێکی هەمەلایەنەوە کە پێیوایە "لە کوێ کڵاوەکەم شۆڕکردەوە، ئەوێ نیشتمانمە" تاوەکو راگەیاندنێکی راست و دروست کە دەڵێت " جارێکی دیکە نامبینیت بگەڕێمەوە وڵات" تێڕوانینێکی پتەو هەیە کە ئەمیش پێیوایە مرۆڤ دەتوانێت ترازانێك لەگەڵ رابردوو دروست بکات و سەر بەشوێنێکی دیکە بێت. پێشانگای رۆجەر پاڵمەر ئەوە پیشان دەدات کە چۆن کەسانێك ژیان دەگوزەرێنن سەربارى ئەوەی ئینتمایان بۆ ئەو شارەی لێیدەژین نییە. کارەکانی، 21 فۆتۆگرافی سەبارەت بە ووردەکاریەکانی ناو گلاسگۆ لەخۆگرتبوو. هەڵبژاردنی رەمزەکان هەروا لە خۆڕا نەبوو. بە هەموو خۆشی و ناخۆشییە رەمزییەکانەوە کە پێشانگەکە نواندبوونی، پاڵمەر توانیبووی ئەوە بسەلمێنێت کە گیانی ئینتیما و شانازیکردن بە شارەکەوە کاڵبۆتەوە. هەر فۆتۆگرافێك گوزارش لە ئازار و ئەندێشەیەك دەکات و هەریەکەیان رەنگدانەوەی پەیوەندییە ناوچەییە جیاوازەکانن، بەڵام هەر هەموویان هیچ هێما و ئاماژەیەکیان بۆ شوێن تیا نییە. شوێن بە تەواوەتی لەو ئاماژانەدا دەرهاتووە.

سەیرە، بۆ دەبێت ئەم فۆتۆگرافانە لە بری هونەرمەندێك کە زیاتر لە "دە"یەك لە تەمەنی لە گلاسگۆ بەسەر بووە بێنە گۆ، هونەرمەندێك کە وتویەتی "خۆشحاڵم ئەگەر لێرە بژیم یان لە شارێکی دیکە، هاوکات لە هەردووکیان هەست بە نامۆی دەکەم، لەوێش لەو شوێنەی گەورە بووم، ئەگەر بگەڕێمەوە، هەر هەمان هەستم هەیە". ئەم هەستە لێکترازاوەی پاڵمەر لە جۆرە تێڕوانینێك دەچێت کە سەرپێیانە بەسەر شارەکەدا ڕادەبوورێت و بێئەوەی مەبەستی بێت پانتایی زوویر بکات. ئەم هەستکردنە، نە تێکەڵەیەکی کۆسمۆپۆلیتیانەیە، نەوەك گوزارشکردنێکی تەواوە لە نامۆی، بەڵکو هەستکردنە بە لێکترازان لە شوێن/ پانتایی. پاڵمەر

هیچ تێڕوانینێکمان ناداتێ سەبارەت بە کات و پانتاییەی دەیەوێت لە شارەکەدا. دۆخێك لە نادیاری بەدیدەکرێت لە پەیوەندی بە شوێنەوە. ئایا شارەکە ئاوێنەیەکە کە ڕەنگدانەوەی پیریی و فەرامۆشکردن و نەناسینەوەیە؟ سارتر دەڵێت: "دۆزەخ خەڵکانی دیکەن"، ڕاستە، ئەوان، ڕەنگە، بەردەوام باست بکەن بەلاّم لەبەر بزربوونی تۆ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. تەنیا ڕێگاچارە بۆ ترازان لە رابردوو ئەوەیە کە وا خۆت پیشان بدەیت لە ئێستایەکی رەهادا دەژیت. خۆبەستنەوە بە ئێستاوە. خۆ دەربازکردنە لە هەر ئیلتیزامێك بە پانتاییەوە. بەلاّم هەر وەك دایکم هەمیشە سکالاّ و گازندەی دەکرد و دەیووت: نیشتمانەکەت میوانخانە نییە!

**نیکۆس پاپاستێر گیادیس:**

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە ناوەندی کەلتووری ئوستورالی. دەرچووی زانکۆی میلیۆن کامبرجە. بابەتی لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە جیهانگیری و کەلتووری و کۆچبەرییە. لە کتێبە چاپکراوەکانی: تازەگەری لە تاراوگەدا، 1992، دایەلۆگەکانی دونیای پەرەوازەبوون 1998، پەشێوییەکانی کۆچبەر 2000.

## سەرچاوە

کتێبی "دایەلۆگەکانی پەرەوازەبوون" لە پەڕە 1- 16. ئەم کتێبە لە ساڵی 1998 لەلایەن دەزگای چاپی "رڤەرس ئۆرام"ەوە لە لەندەن چاپکراوە.

# تۆتالیتاریزم و ڕەتکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی

**مۆریس بارییە**

**لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی**

مۆدێرنەی سیاسی کە هەر لەسەرەتاوە ڕوبەڕوی گەشەکردن و پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم بووبووە، لەسەدەی بیستەمدا بەر ڕێگرێکی ترسناکتر کەوت. ئەم ڕێگرە بریتی بوو لە تۆتالیتاریزم لە شکڵە جیاوازەکانیدا. . بەمشێوەیە مۆدێرنەی سیاسی بەتوندی هێرشی کرایە سەر و بەشێوەیەکی تەواو ڕەد کرایەوە و لەم ئاراستەیەدا لەو شوێنانەدا کە پێشتر بوونی هەبوو لەناوچوو، دروستبوونی لەو شوێنانەشدا کە بوونی نەبوو، نامومکین بوو. بەشێوەیەکی گشتی و بەپێی پێناسە تۆتالیتاریزم نەفیکردنی مۆدێرنەی سیاسیە، چونکە ڕێك دژی جیابونەوەی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، نێوان بواری گشتی و بواری تایبەتیە و لێرەوە لەسەر بناغەی ڕەدکردنەوەی جیاوازی هاوڵاتی و تاکەکەس دامەزراوە. تۆتالیتاریزم دەیەوێت هەمەکیەکی چونیەك و یەکگرتوو دروستبکات (یان سەر لەنوێ دروستی بکاتەوە) و ماوەی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا هەروەها جیاوازی نێوان هاوڵاتی و تاکەکەس بسڕێتەوە. ئەم هەوڵە دەبێتە هۆی ڕەدکردنەوەی دەوڵەتی مۆدێرن و بەرپاکردنی جۆرێك دەوڵەتی پێشمۆدێرن لە کۆمەڵگای تازەدا. بەڵێ قسەکردن لەسەر دەوڵەتێکی تۆتالیتار یان هەمەکی خوازە کە وەك لەناوەکەیەوە دیارە بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەموو شتێکە و دەیەوێت هەموو شتێك لەناوخۆیدا بخوات و بگونجێنێ.

دەوڵەتی تۆتالیتار، بەدەر لە شێوە جیاوازەکانی دەرکەوتنی، بەهۆی جەوهەی خۆیەوە ناتوانێت بە دەوڵەتێکی مۆدێرن بژمێرێت و لەراستیدا خاوەن خەسڵەتە سەرەکیەکانی دەوڵەتی پێش مۆدێرنە. دەوڵەتی تۆتالیتار بوونی کۆمەڵگای مەدەنی، واتە جێگەیەك کە تیایدا بەرژەوەندیە تایبەتیەکان بە ڕەوا دادەنرێن، قبوڵناکات و هەروەها قبوڵی بوارێکی تایبەتی ناکات کە تیایدا تاکەکان خاوەن ئازادی جۆراوجۆر بن و لێرەوە دەیەوێت هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە و چالاکیە مرۆییەکان لە ئابوریەوە بگرە تا فکر و لە ئەنجومەن و سەندیکاکانەوە بیگرە تا زانیاری و هەواڵ و زانست و زانین و کلتور و هونەر و گەمەکردن، کونترۆڵ بکات. دەوڵەتی تۆتالیتار

هەموو ئازادیە فەردیەکان لەناودەبات یان دەیانپاڵێوێ و چ لە بواری زەمینە سیاسی و ئابوریەکاندا و چ لە بواری زەمینە فکری و هونەریەکاندا جێگەیەك بۆ داهێنانی فەردی ناهێڵێتەوە. دەزانین کە نەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی، نەفیکردنی ماڤی مرۆڤ و تەنانەت نەفیکردنی مرۆڤ بەدوای خۆیدا دەهێنێت و تاك کورت دەکاتەوە بۆ بەشێك لە هەمەکی کە ئەو هەمەکیەش هەمان دەوڵەتە. بەمشێوەیە چیدی تاکەکەس خاوەن ماڤی تایبەتی نیە و تەنانەت خاوەن بوونێکی تایبەت نیە و لەئەنجامدا ناتوانێت خاوەن ماڤی شەخسی بێت کە دەوڵەت بەرپرسیاربێت لە پاراستنی. دەرئەنجامی ئەم هەلومەرجەش ئەوەیە کە ماڤی مرۆڤ نەهەیە و نە لەبنەڕەتدا مانای هەیە.

لێرەوە دەوڵەتی تۆتالیتاری دژی دەوڵەتی مۆدێرنە و لەو روەوە کە بوونی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ و ئازادیە واقعیەکانی تاك رەد دەکاتەوە، شکلێکی نوێی دەوڵەتی پێشمۆدێرن، پیشاندەداتەوە. دەوڵەتی تۆتالیتار بە جۆر و بەربلاوی ئەو ئامێر و هۆکارانەی بۆ کۆنترۆڵی کۆمەڵگا دەیگرێتە بەر، لەدەوڵەتشاری کلاسیکی جیادەبێتەوە کە لەناو ئەم ئامێرانەدا دەکرێ ئاماژە بۆ پەنابردنی رێکخراو بۆ فشار و ناچارکردن، توندوتیژی و شێوازەکانی دیکتاتۆر ئاسایانە بەسودوەرگرتن لە تازەترین تەکنیکەکان بکەین. لێرەوە دەکرێت وا تەماشای دەوڵەتی تۆتالیتار بکەین وەك دەوڵەتێکی پێشمۆدێرنە کە ئامێرە مۆدێرنەکان بەکاردەهێنێت. بەڵێ ئەگەرچی بەکارهێنانی ئامێرە مۆدێرنەکان، دەوڵەتی مۆدێرنی بەشێوەیەکی بەرچاو بەهێز کردووە، بەڵام ناتوانێ خەسڵەتی سەرەکی ئەم دەوڵەتە بشارێتەوە. هەرچەندە رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی وەك خەسڵەتی سەرەکی تۆتالیتاریزم هەم لە فاشیزم و ناسیۆنال سۆشیالیزمدا دەبینرێت و هەم لە کۆمۆنیستی سۆڤێتی یان چینیدا، بەڵام هەریەك لەمانە شێوەی جیاواز بەخۆیانەوە دەگرن و لیرەوە چاتروایە هەریەکەیان بەجیا باسبکەین.

### 1ـ فاشیزمی ئیتالی و بابەتە هاوشێوەکانی:

لەگەڵ بوونی شێوەجیاوازەکانی تۆتالیتاریزمدا دەکرێت خەسڵەتی سەرەکی بە بەرپاکردنی دەوڵەتێکی دیسپۆتیزمی . یان تەنانەت تۆتالیتاریانە. و هەروەها وەلاوەنانی سەربەخۆیی فەردی دابنرێت. فاشیزم لەماوەی نێوان دوو جەنگی جیهانیدا لەو وڵاتانەدا دەرکەوت کە یان هێشتا بەشێوەیەکی تەواو مۆدێرنەی سیاسیان نەهێنابوە دی (وەك ئیتاڵیا، ئیسپانیا و پورتوگال) یان بەئاشکرا دژی دەجەنگان (وەك فەرەنسا). بەمشێوەیە فاشیزم بەپێی بابەت و لەرێگەی جیاوازەوە توانی مۆدێرنەی سیاسی هەندێکجار بەشێوەیەکی تەواو و هەندیکجاریش بەشێوەیەکی ناکامڵ، لەناو بەرێت.

دەکرێ بگوترێت فاشیزمی ئیتاڵی کامڵترین شێوەی ئەم دیاردەیە و باشترین نمونەی رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسیە. لەراستیدا فاشیزمی ئیتاڵی بەروونی بڵندایەتی رەهای دەوڵەتی وەك بەهایەکی باڵاتر، راگەیاند و تەنانەت خۆی لەگەڵ دەوڵەتدا بەیەك شت دانا و هەر لەبەرئەمەش دەکرێت ئەم فاشیزمە بەجۆرێك "دەوڵەتسالاری"پێناسە بکرێت. مۆسۆلۆنی لەمبارەیەوە دەنوسێت: "هەرکاتێك لیبرالیزمان بەمانای فەرد دانا، ئەوا فاشیزم بەمانای دەوڵەتە". مۆسۆلۆنی هەروەها بناغە سەرەکیەکانی مۆدێرنەی سیاسی بەئاشکرا رەددەکاتەوە و رایدەگەیەنێت:

"بەڵام لەراستیدا ئەنتی تزی ( . . .)هەموو بنەما نەمرەکانی /شۆڕشی] 1789نوێنەرایەتی دەکەین".

مۆسۆلۆنی بەتایبەتی دژی لیبرالیزم و فەردباوەڕی بەئاشکرا رادەوەستێت: "وەك دەزانین لیبرالیزم بەئاراستەی بەرژەوەندی تاکەکەس، نەفی دەوڵەت دەکات، بەڵام فاشیزم سەرلەنویٰ دەوڵەت وەك واقعیەتی راستەقینەی تاکەکەی دەسەلمێنیٰ".

بەمشێوەیە مۆسۆلۆنی تاکەکەس تەنها لەپەیوەندیدا بەدەوڵەتەوە لەبەرچاو دەگرێت و تاك بەپێی ئینتیمای بۆ دەوڵەت پێناسە دەکات: "تاکەکەس تەنها لەورووەوە بوونی هەیە کە لەناو دەرونی دەوڵەتدا ملکەچی پێداویستیەکانی دەوڵەتە". ئاشکرایە ئەم تێڕوانینە دەگات بە رەهاکردنی دەوڵەت و تاکەکان و گروپەکان دەکاتە فەرمانبەرداری دەوڵەت: "لەدیدی فاشیزمەوە دەوڵەت رەهایەتیەکە کە تاك و گروپەکان لەبەرامبەریدا رێژەیین. بەڵیٰ تاك و گروپەکان تەنها لەناو دەوڵەتدا درك دەکرێن". دیارە دەبێت سەرنج لەوە بدەین کە فاشیزم نەفیکردنی تاکەکەس قبوڵناکات، بەڵکو پێشنیاری تێڕوانینێکی دی بۆ تاکەکەس دەکات: "لەدەوڵەتی فاشیستیدا تاك ناسڕێتەوە، بەڵکو زیاد دەکات. . رێك وەك چۆن سەرباز لە مەفرەزەکەیدا کەم نابێتەوە، بەڵکو بە ژمارەی هاورێکەکانی زیاد دەبێت".

ئەو ئازادیەی فاشیزم خوازیاری دابین کردنێتی هەمان "ئازادی دەوڵەت و ئازادی تاکە لەناو دەوڵەتدا" کە ئازادی دەستەجەمعی کلاسیکیەکان بەبیر دێنیتەوە. لەمڕووەوە دەوڵەتی فاشیستی 1ئازادیە بنەڕەتیەکان" دەپارێزێت و "ئازادیە بێهودە یان زیانبەخشەکان" سنوردار دەکات: "لەم ئاستەدا تەنها دەوڵەت داوەرە، نەك تاکەکەس". بەڵیٰ تاکەکەس خاوەن بونێکی تایبەتی نیە و تەنهالەناو دەوڵەت و بەهۆی دەوڵەتەوە خاوەنی ئازادی دەبێت: "تاکەکەس لێرەدا خاوەن ئازادیەکی زیاترە لە تاکەکەسی گۆشەگیر، چونکە دەوڵەت پارێزگاری لە تاکەکەس دەکات و بە بەشێك لەدەوڵەت دادەنرێت". فاشیزم سەیری تاکەکان وەك بونەوەرانێکی گۆشەگیر و بێلایەن ناکات، بەڵکو وەك ئەندامانی دەوڵەت تەماشایان دەکات کە پەیوەستن پێوەی و تەنانەت خۆیان بەبەشێك لە دەوڵەت دەزانن: "تاکەکان بەر لەهەر شتێك و بەتایبەتی هەمان دەوڵەتن". بەڵام دەوڵەتی فاشیستی سەرەرای هەموو بانگەشە مۆدێرنەکانی، بەئاشکرا وەك دەوڵەتی پێشمۆدێرن سەردەردێنێت کە نە تاکەکەس وەك تاکەکەس بە فەرمی دەناسێت و نەجێگەیەك بۆ سەربەخۆیی راستەقینە دەهێڵێتەوە.

سەرەڕای ئەمە دەوڵەتی فاشیزم هەموو شتێکە، تەواو و کامڵە و تەنانەت "تۆتالیتار" (زاراوەی تۆتالیتار لەدروستکراوەکانی مۆسۆلۆنیە) و بیٰ هیچ پەردەپۆشیەك خۆی وا دەناسێنێت. ئەمە دەوڵەتێکە کە هەموو شتێك لەناو خۆیدا دەگونجێنیٰ، هەموو شتێك رێکدەخات و رابەرایەتی هەموو شتێکیش دەکات. فۆرمەلەکەی مۆسۆلۆنی کە دەڵێت "هەموو شتێك لەدەوڵەتدا، هیچ شتێك دژی دەوڵەت، هیچ شتێك لەدەرەوەی دەوڵەت" لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. لێرەوە بەئاشکرا پێشنیاری "دەوڵەتێکی تۆتالیتار دەکات کە هەموو وزەکان، بەرژەوەندی و ئومێدەکانی نەتەوەی لەناوخۆدا توانۆتەوە". . "بۆئەوەی گۆڕانیان بەسەر بێنێت و بەهێزیان بکات". فاشیزم جیابوەنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا قبوڵناکات و بەگشتی رەدی دەکاتەوە، بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ بەتەواوی لەگەڵیدا نامۆیە. بەمشێوەیە دەوڵەت هەموو کۆمەڵگا کە

بەتەواوی فەرمانبەریّتی لەخۆیدا دەتویّنیّتەوە. لیّرەوە دەولّەت دەبیّتە چارەنوسی دەسەلاّت و دەست دەخاتە ناو هەموو بوارەکانەوە لەژیانی سیاسی و سەندیکاییەوە بگرە تا ژیانی ئابوری و کلتور، خیّزان و تەنانەت دینیش، ئەمە "دەولّەتیّکە کە هەموو هیّزە چالاك و کاراکانی ناو نەتەوە" بەتایبەتی هیّزە ئەخلاقی و ئابوریەکان "کونترِۆڵدەکات".

لەئەنجامدا "لەدەرەوەی چنگی دەولّەت نە تاکەکان دەتوانن بونیان هەبیّت و نە گروپەکانی وەك (حیزبە سیاسیەکان، ئەنجومەنەکان، سەندیکا و چینەکان)". لەسەر ئەم بناغەیە لەکرداردا حیزبە سیاسیەکان بە سودی تاکە حیزبیّك هەلّگیران، پۆلەکان لەبری سەندیکاکان دانیشتن و چالاکیە ئابوریەکان لەچوارچیّوەی ئەو پۆلانەی فەرمانبەرداری دەولّەتن، ریّکخران. دەولّەتیش رەهەندیّکی پۆلی وەرگرت و کۆمەلّیّك دەزگای پۆلی لەخۆیدا هەلّگرتبوو کە ئەگەری کۆنترِۆلّکردنی کۆمەلّگای بۆ فەراهەمدەکەن. هەروەها دەولّەت بەسەر زانیاری و هەوالّەکاندا چاودیّری دەکات و بۆ فۆرمەلەکردنی رای گشتی دەست بە پرِوپاگەندەی بەربلاّو دەکات. دەولّەتی فاشستی تا ئەو جیّگەیە رۆیشت کە تەنانەت دینی لەناو خۆیدا توانەوە و رەهەندی دینی وەرگرت، واتە خۆی بە کاسۆلیك دانا. مۆسۆلۆنی لەمبارەیەوە دەلّیّت: "دەولّەتی فاشیستی کاسۆلیکە (...)و ئیّمە بەئاشکرا رایدەگەیەنین کە کاسۆلیزم بە بەشی تەواوکەری دادەنریّت". لیّرەوە پیّشەوا دۆچە(*Duce*) بەشیّوەیەکی سروشتی بەو جیّگەیە گەیشت کە لەسالّی *1929*دا لەگەلّ پەیماننامەی لاترندا، کاسۆلیزم بە دینی رەسمی دەولّەت بناسیّنیّ.

لەدیدی فاشیزمەوە دەولّەت لە نەتەوە هەم لەپیّشترە و هەم بالاّترە. چونکە دەولّەت نەتەوە دروستدەکات، نەك بەپیّچەوانەوە. فاشیزم تیّروانینی "سروشتباوەر" یان ئەتنی بۆ نەتەوە بە قازانجی تیّروانینی ئەخلاقی یان سیاسی بۆ نەتەوە، رەد دەکاتەوە. لەراستیدا لەدیدی مۆسۆلۆنیەوە "بەپیّچەوانەی تیّروانینی کۆنی سروشتباوەرِەوە" کە بناغەی دەولّەتە نەتەوەییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بوو، نەتەوە دەولّەتی دروستنەکردووە، بەلّکو "بەپیّچەوانەوە دەولّەت نەتەوەی دروستکردووە، و بەخەلّکە هوشیاربوەکە بە یەکیّتی ئەخلاقی خۆی، ئیرادە و لەئەنجامدا بونیّکی کارای بەخشیووە". لەراستیدا فاشیزم بەکردەوە دەولّەتە لەگەلّ نەتەوەدا وەك واقعیّکی ئەخلاقی، واتە سیاسی، بەیەکشت دادەنیّت: "نەتەوە وەك دەولّەت بە واقعیّکی ئەخلاقی دەژمیّریّت کە بەهۆی پەرەسەندن و گەشەکردنی خۆیەوە، بوونی هەیە و دەژی". لەدەستوری*1927*دا هاتووە کە نەتەوەی ئیتالّیا"ئەو یەکیّتیە ئەخلاقی، سیاسی و ئابوریەیە کە لەدەولّەتی فاشیستیدا بەتەواوی بەدیهاتووە".

بەمشیّوەیە فاشیزمی ئیتالّی بە سوربوون لەسەر لەپیّشبوون و بالاّتربوونی دەولّەت و خەسلّەتە تۆتالیتاریەکەی، بەکردەوە هیچ جیّگەیەك بۆ کۆمەلّگای سەربەخۆ و بەکارهیّنانی ئازادیە فەردیەکان ناهیّلّیّتەوە، و بەمشیّوەیە مۆدیّرنەی سیاسی کە ئیتالّیا هیّشتا دەستی پیّنەگەیشتبوو، رەد دەکاتەوە. فاشیزم شیّوەیەکی تازەی دەولّەتی پیّشمۆدیّرنی بەرپاکرد کە لەم ولاّتەدا پیشاندەری پاشەکشیّیەکی سیاسی بوو. بەلّیّ پاش کەوتنی فاشیزم ئیتالّیا گۆرِانی خۆی لەسەرەوە دەستپیّکردەوە و دواجار بە مۆدیّرنەی سیاسی گەیشت. دیارە نابیّت ئەوە لە بیر بچیّت کە فاشیزم

هێشتا هەندێکجار حەسرەتی سەردەمی رابردوو دەوروژێنی و چەند جێ پێیەکی لەخۆی بەجێهێشتووە.

لە ئەوروپادا شێوەکانی تری فاشیزم رویاندا کە ئەگەرچی کەمتر لە فاشیزمی ئیتالی رادیکال بوون، بەلام بەشێوەی ترو بەئەندازەیەکی کەمتر رێگریان لەبەردەم مۆدێرنەی سیاسیدا دروستکرد. فرانکۆسیزم لە ئیسپانیا و سالازاریزم لە پورتوگال نمونە بەرجەستەکانین. هەرچەندە ئەم دوو ولاتە پاش جەنگی جیهانی یەکەم هەنگاوە سەرەتایەکانیان بەرەو مۆدێرنەی سیاسی هەلنابوو، بەلام گۆرانەکەیان بە بەرپابوونی رژێمە دیسپۆتیزمەکان راوەستا کە دەکرێ بگوترێت زۆرتر نەریتخواز و پارێزگار بوون تا فاشیزمی واقعی. ئەم رژێمانە پاش جەنگی جیهانی دوهەم هەروا بەپێوە مانەوە تا دواجار لەناوەراستی حەفتاکانی (سەدەی بیستدا) لەناوچوون و پاشان مۆدێرنەی سیاسی لەم ولاتانەدا مومکین بوو.

فرانکۆسیزم کە پاش کودەتایەکی سەربازی و جەنگێکی ناوخۆ خۆی سەپاند، بە تامەزرۆیی بۆ بەها نەریتیەکان (رێکخستن،دەسەلاتدارێتی، پلەوپایە، مولکایەتی و دین) دەناسرێتەوە. جگە لەمە فرانکۆسیزم پشتی بە هێزە پارێزگارەکان و بەتایبەتی بە سوپا، کەنیسەی کاسۆلیك و یەك حیزب بەستبوو. ئەم حیزبە واتە حیزبی فالانژ گەرچی خۆی وەك "رێکخستنی ماوەی نێوان دەولەت و کۆمەلگا" دەناسێنێت، بەلام بەرنامەکەی بوو بە بەرنامەی دەولەت. لەراستیدا فرانکۆسیزم رێگەی لە جولە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی گرت و هەموو ئەو شتانەی رەد کردەوە کە مۆدێرنەی سیاسی مومکین دەکەن (لیبرالیزم، ئازادیە گشتیەکان و مافەکانی مرۆڤ).

بەشێوەیەکی گشتی فرانکۆسیزم لەپێشبوونی کۆمەل بەسەر تاکدا دەسەلمێنێ و نەك تاکەکەس، بەلکو خێزان بە خانەی کۆمەلگا دادەنێت. لە دیدی فرانکۆسیزمدا دەولەت بە ئامێرێك دادەنرێت لە خزمەتی ولاتدا کە بەهاوکاری تاکە حیزبێك رێکخستنی پۆل و کەنیسە و کۆمەلگا رابەرایەتی و کۆنترۆلدەکات. بەم مانایەش دەولەتێکی دیسپۆتیزم و تەنانەت تۆتالیتارە. فرانکۆ خوازیاری "دەولەتێکی فەرمانبەردار و تۆتالیتار" بوو کە "بتوانێ رێنمای نەتەوە بکات و رێگەیەك بکاتەوە کە بێ هیچ دودلی و لادانێك دەیەوێت نەتەوە بەناویدا ببات". بەلێ بە هاتنەسەر دەسەلاتی فرانکۆسیزم حزبەکان و سەندیکاکان هەلگیران و گەرچی دەستوری ئیسپانییەکان لە سالی*1945* دا ئازادیە بنەرەتیەکانی دەسەلماند، بەلام حکومەت دەیتوانی هەموویان راوەستێنێت. لێرەشدا وەك فاشیزمی ئیتالیا کاسۆلیزم مەزهەبی رەسمی دەولەت بوو، لەنێوان کەنیسە و دەولەتدا پەیوەندیەکی تەنگاو تەنگ هەبوو ، و لەراستیدا کەنیسە پەیوەستبوو بە دەولەتەوە. کەنیسە لەم پەیوەندیەدا دەورێکی دەزگایی لەرژێمدا دەبینی و بەکارهێنانێکی ئایدۆلۆژی لەخزمەتی رژێمدا هەبوو.

ئەم ئاماژانە هەر هەموویان پیشاندەری ئەو راستیەن کە لە ئیسپانیای فرانکۆسیستیدا، نە باسی دەولەتی مۆدێرن لەئارادا بوو، نە کۆمەلگای مەدەنی سەربەخۆی راستەقینە. بەمشێوەیە دەولەتی فرانکۆسیتی بێ ئەوەی دیکتاتۆریەکی راستەقینەی فاشیزمی بێت، وەك جۆرێك دەولەتی پێشمۆدێرن دەرکەوت کە حەسرەتی بۆ مەزنێتی رابردوو دەخواردو و چاودێری پاراستنی هەلومەرجی باوی دەکرد. بەلێ دەولەتی فرانکۆسیستی هێواش هێواش گۆرا و زەمینەی بۆ بەرپابوونی پادشایی

مەشروتە خۆشکرد. ئەم رژێمە پاش مەرگی فرانکۆ لەساڵی*1967* دا بەتەواوی دیار نەما و ئیسپانیا توانی بە توندی پێبخاتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە.

سالازاریسم لە پرتوگال سیستمێکی نوێخوازانەی بەرهەمهێنا کە هەم لە فرانکۆسیزم و هەم لە فاشیزمی ئیتالیایی جیابوو. لەراستیدا سالازاریزم بەهۆی پشتنەبەستن بە سوپا و کەنیسە، لە فاشیزمی ئیتاڵیا جیادەبێتەوە و لەرووی ئەم سێ خاڵەی خوارەوەدا لەفاشیزم جیا دەردەکەوێت: یەکەم سالازاریزم جەخت لەنەتەوە پتر لە دەوڵەت دەکات و لەدیدی ئەوەوە نەتەوە، دەوڵەت بونیاد دەنێت نەك بە پێچەوانەوە (لێرەوە دەکرێ بگوترێ لەمڕووە لەگەڵ فاشیزمدا هاوڕا نیە). سالازار دەڵێت: "ئێمە ناسیۆنالیزمی پورتوگالیمان کردووە بە بناغەی نەمری دەوڵەتی تازە". باس، باسی نەتەوەیەکی مێژووییە کە بەدرێژایی سەدەکان دروستبووە و هەنوکە یەکتابوونی بەرجەستە دەکات: "لەدیدی ئێمەوە نەتەوە یەکتا و نەمرە". نەتەوە لە دەوڵەت گرنگتر و بونیشی هەستپێکراوترە. لەراستیدا پورتوگال بە بەهێزی نەتەوە و لاوازی دەوڵەتدا دەناسرێتەوە. هەرچەند ئاپورەی جەماوەر"خاوەن هوشیاریەکی نەتەوەیی بەهێزە" بەڵام "خاوەن هوشیاریەکی سیاسی سەقامگیر نیە". لەئەنجامدا "نەتەوە لەبەردەست هەمواندایە و دەوڵەتیش لەبەردەست ژمارەیەکی کەمدا".

دوهەم سالازاریزم دەوڵەتی تۆتالیتار رەد دەکاتەوە، "دەوڵەتێك کە بێ ئاوارتن هەموو شتێك دەکاتە ملکەچی بیرۆکەی نەتەوە یان نەژاد" و "هەموو دەرکەوتە فەردی و کۆییەکان" دەبێ ملکەچی ئەو بن. هەرچەندە سالازاریزم پێشنیاری "دەوڵەتێکی بەهێز" دەکات، بەڵام ئەم دەوڵەتە "لەلایەن ئەخلاق، بنەمای مافەکانی مرۆڤ، زەمانەتەکان و ئازادیە فەردیەکان، سنورداری دەکرێت". هەروەها تاکە حیزب لەورووەوە رەد دەکاتەوە کە دەبێتە هۆی دروستبوونی دەوڵەتی تۆتالیتار. سالازاریزم هەوڵدەدات بۆ تاکەکان، خێزانەکان، پۆلەکان و بەڕێوبەرایەتیە ناوچەییەکان، زەماناتی پێویست دابینبکات و هەر بەهەمان ئاراستە ئازادی باوەڕ و هەروەها ئازادی ئەنجامدانی ئەرکە دینیەکان، دەسەلمێنێ.

سێهەم سالازاریزم تێکەڵکردنی دین و سیاسەت بەهەڵە دادەنێت و بڕوایوایە نە کەنیسە دەبێت دەستبخاتە کاروبارە سیاسیەکانەوە و نە دەوڵەتیش دستبخاتە کاروباری دینەوە. لەئەنجامدا جیابونەوەی کەنیسە و دەوڵەتی پاراست کە کۆماری پورتوگال ـ وەك ئاماژەیەك بۆ مۆدێرنەی سیاسی ـ لەساڵی*1911* دا رایگەیاندبوو. لەراستیدا ئەم هەڵوێستە هەم ئازادی کەنیسەی بەدوای خۆیدا هێنا، هەم سنورداریێتی دەسەڵاتی سیاسی. دیارە ئەم جیابونەوەیە رێگەی لە پەیوەندی گرتنی دیبلۆماسیانە لەگەڵ ڤاتیکان و تەنانەت ئیمزاکردنی رێکەوتننامە لەگەڵیدا لەساڵی*1940* دا، نەگرت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەرچی سالازاریزم جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ فاشیزمی ئیتاڵیدا هەبوو، نابێ ئەوە لەبیربکەین کە دژی مۆدێرنەی سیاسیە کە بە راگەیاندنی رژێمی کۆماری لەساڵی*1910* دا ـ دەستی پێکردبوو، وە ئامانجی پاراستنی دەوڵەتێکی پێشمۆدێرنە لەسەر بناغەی بەها نەریتیەکانی وەك نەتەوە، دەسەڵاتداریێتی و ئەخلاق. جگە لەمەش ئازادیخوازی و دیموکراسی رەددەکردەوە و لایەنگری دەوڵەتێکی دیسپۆتیزم و دەستێوەردەر بوو. چونکە دەسەڵاتی دەوڵەت دەبوو قەرەبووی لاوازی کۆمەڵگا بکاتەوە. سالازار گرنگی

هۆكاری سیاسی له پورتوگالدا دەگەڕێنێتەوە بۆ دوو هۆ: یەكەم دەوری روو لەزیادی دەوڵەت، لەراستیدا دەوڵەت "بە هەزار شێوە دەستێوەردان و هەزار شێوەی تواناكانی خۆی، سنورداریێتیەكان و رێنماییە پێویستیەكان بەسەر پەرەسەندنی ئازادی ژیانی كۆمەڵایەتیدا، دەسەپێنێ. دوهەم "ناسكی ژیانی كۆمەڵایەتی له پۆرتوگالدا" چونكە له زۆرێك له بوارەكاندا (خێزان، دین، ئابوری، كلتور، وەرزش و...) "هەموو شتێك بەستراوە بە فەزای سودمەندی یان زەرەرمەندی دەسەڵاتی سیاسیەوە" لەراستیدا گرنگی دەوڵەت له پورتوگالدا دەگەڕێتەوە بۆ كەم گەشەكردنی كۆمەڵگای مەدەنی و لەئەنجامدا دەوڵەت ناچارە دەستبكات بەرێكخستن و كۆنترۆڵكردنی كۆمەڵگای مەدەنی. بەڵێ سالازاریزم كە تەمەنی گەیشتە نزیك نیو سەدە، ئەگەرچی بنەماكانی مۆدێرنەی سیاسی رەد دەكردەوە، بەڵام بەئاسانكردنی گەشەكردن و پەرەسەندنی كۆمەڵگای مەدەنی بەبێ ویستی خۆی بەشداری له پەیدابوونی مۆدێرنەی سیاسیدا كرد. ئەگەرچی سالازاریزم بەهۆی خەسڵەتی پارێزگارانە و نەریتخوازانەیەوە بەردەوام چاوی له رابردوو بوو، وە دەوڵەتی نوێی *(Estadeo Novo)* پورتوگال لەراستیدا جگە لەدەوڵەتێكی پێشمۆدێرن هیچی دی نەبوو، بەڵام سەرەڕای خەسڵەتی دیسپۆتیزمانە و دەستێوردانەیەكەی، زەمینەی بۆ دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن و كۆمەڵگای سەربەخۆ خۆشكرد.

لەفەرەنسادا واتە لەوڵاتێكدا كە لەدێرزەمانەوە مۆدێرنەی سیاسی بەسەقامگیری لەناویدا دروستبوو بوو، رژێمی ڤیشی وەك پاشەكشێیەكی سیاسی، دەركەوت. لەراستیدا ئەم رژێمە بە لابردنی رژێمی كۆماری، مۆدێرنەی سیاسی رەد كردەوە و گەڕانەوە بۆ شێوەیەك دەوڵەتی پێشمۆدێرنی بەدیهێنا. گەرچی هەلومەرجی فەرەنسا لەو قۆناغەدا له ئیتاڵیای فاشیست نەدەچوو، رژێمی ڤیشی هەم كورتخایەنتر و هەم لاوازتر له رژێمی مۆسۆلۆنی بوو، بەڵام چەند ئاماژەگەلێك هەبوون كە بەروونی دەریدەخەن ئەم رژێمە ئەگەرچی دەستیكرد بە هەندێك نوێخوازی ئیداری و ئابوری، بەڵام لەبەرئەوەی سەربەخۆیەكی كەمی بۆ كۆمەڵگای مەدەنی دەهێشتەوە، لەراستیدا دەیوست بگەڕێتەوە بۆ نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن.

سەرەتا رژێمی ڤیشی بنەما سەرەكیەكانی شۆڕشی *1789* ی بەتایبەتی ئازادیخوازی و تاكخوازی، واتە بناغەكانی مۆدێرنەی سیاسی رەد كردەوە و لەبری بنەما ئەبستراكتەكان (و دەرئەنجامە بەد ئەنجامەكانی وە راپرسی گشتی و پەرلەمانتاریزم) مرۆڤی موشەخس و خانە سروشتیەكانی وەك خێزان، پیشەوەری و نەتەوەی دانا. دروشمی پارێزگارانەی"كار، خێزان، وڵات" ی لەبری دروشمی شۆڕشگێڕانەی"ئازادی، بەرابەری، برایەتی" دانا و **بنەماكانی كۆمەڵ** وەك راگەیاندنی ماف و ئەركەكان بووە جێنشینی راگەیاندنی مافەكانی ساڵی *1789*. لەم راگەیاندنەدا بەرووني هاتووە كە ئەگەرچی "مرۆڤ مافە بنەڕەتیەكانی خۆی له سروشتەوە وەردەگرێت، بەڵام ئەم مافانە ئەو خانانە زامنی دەكەن كە مرۆڤ لەناویدا دەژی، وەك خێزان كە پەروەردەی دەكات، پیشە كە نانی بۆ پەیدا دەكات و نەتەوە كە پارێزگاری لێدەكات".

هەر لەم ئاراستەیەدا بەئاشكرا باڵاتربوون و لەپێشبوونی كۆمەڵگا بەسەر تاك و بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیدا، دەسەلمێنرێ. تاك بە بەشێك له گشت دادەنرێت كە لەو سەروتر دەڕوات و دەبێت لەخزمەتیدا بێت: "ئەو هاوڵاتیەی لەدەرەوەی بەرژەوەندی گشتی، بەدوای خێری

تایبەتی خۆیدا بگەڕێت، لەراستیدا دەستی بەکارێك کردووە کە دژی خۆی و تەنانەت بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەتی. هاولاّتیان کار و دەرامەت و تەنانەت ژیانی خۆیان قەرزاری ولاّتن". مارشاڵ پیتن جەخت لەسەر ئەوخاڵە دەکات کە "چارەنوسی پەتی تاك بوونی نیە و فەڕەنسیەکان تەنها بەهۆی فەڕەنساوە بونییان هەیە". ئەو بەشێوەیەکی رێکخراو رەخنەی تاکخوازی دەکرد و بە بەرپرسیاری بەدبەختیەکانی خەڵکی فەرەنسای دەزانی: "تاکخوازی کە خەڵکی فەرەنسا لە رابردوودا وەك ئیمتیازێك شانازیان پێوە دەکرد، لەراستیدا سەرچاوەی ئەو رەنج و گرفتاریانەیە کە خەریکبوو هەموویان پەکبخات". بەبڕوای مارشاڵ پیتن تاکەکان کۆمەڵگا دروستناکەن، بەڵکو کۆمەڵگا بەدروستکەری تاك دەژمێرێت: "وەك کۆمەڵناسی مۆدێرن پیشانیداوە سروشت، کۆمەڵگا بەرمەبنای تاکەکان دروستناکات، بەڵکو تاکەکان بەرمەبنای کۆمەڵگا دروستدەکات". لێرەوە تاك بەهۆی کۆمەڵگا و بۆ کۆمەڵگا دەژی: "تەنها هەژانی دەستەجەمعیە مانا بەژیانی تاك دەدات و ئەمکارەش بە پەیوەستکردنی ژیانی فەردی بە شتێکەوە کە لەو سەروتر دەڕوات، شکۆمەندی دەکات و پەرەپێدەدات، ئەنجامدەدات". تاکباوەڕی سەبارەت بە کۆمەڵگا "دەوری مشەخۆرێك" دەبینێ و "بەناچار بە لارێگەی ئاژاوە دەگات". لێرەوە تەنها کۆمەڵباوەڕیە کە دەتوانێ ئەم هەلومەرجە چاکبکات. لەئەنجامدا پیتن "بنەما نادروستەکانی تاکباوەڕی" رەد دەکاتەوە و دەیەوێت تاکباوەڕی کە "وێرانکەری خێزان و کار و نیشتیمانە" لەناوبەرێت.

بەمشێوەیە رەدکردنەوەی تاکباوەڕی هاوکات لەگەڵ رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسیدا ئەنجامدرا. ئەو "دەوڵەتی فەرەنسا"یەی کە حکومەتی ڤیشی دەیویست بەرپاییکات دژی دەوڵەتی مۆدێرن بوو ، وە "شۆڕشەکەی"، لە ڕاستیدا جگە لە دژە شۆڕش هیچی دی نەبوو کە پێشنیاری گەڕانەوەی بۆ فەڕەنسای کلاسیکی و پێش شۆڕش دەکرد. لەراستیدا هەوڵیاندا یەکتابوونی پێکەوەبوونی نەتەوەیی بونیادبنێنەوە و جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا دابماڵن. هەوڵێکی لەمچەشنە بووە هۆی سنورداریێتی و لەناوچونی زیاتری ئازادیەکان و لێرەوە رێگەگرتن لە هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی سەربەخۆ. بەمشێوەیە حیزبە سیاسیەکان بە فەرمی و سەندیکاکان بە کردەوە هەڵگیران. ئازادی دەربڕین رەدکرایەوە و دەزگاکانی هەواڵ "رۆژنامەکان، گۆڤارەکان و رادیۆ) کەوتنە ژێر سانسۆر و کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە. راپرسی گشتی وازی لێهێنرا و چیدی هەڵبژاردن ئەنجام نەدرا. ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگاکان و ئەنجومەنی شارۆچکەکان (لە بەشەکانی زیاد لە دوو هەزار پۆست) لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنرێن و هیچ هەڵبژاردنێك لەئارادا نەبوو. هەلومەرج لەبارەی ئەنجومەنی نەتەوەیی ولاّت و پارێزگارەکانیش هەربەمشێوەیە بوو. تەنانەت پێشنیاری دابەشکردنی ویلایەتی پێش ساڵی *1789* و لابردنی دابەشکردنی پارێزگاکان (کە شۆڕشی فەرەنسا ئەنجامیدابوو) کرا.

هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوانەدا، دەوڵەت بۆ رێکخستن و رێنمایی کۆمەڵگا و چالاکیە جۆراوجۆرەکان بەتایبەتی چالاکیە ئابوریەکان، دەستێوەردان دەکات. گەرچی دەوڵەتی ڤیشی تۆتالیتار نەبوو، وە بیرۆکەی تاکە حیزبی کە سەردەمێك هاتە ئاراوە، بەزووی رەدکردەوە، بەلاّم بەردەوام ئارەزووی دەوڵەتێکی بەهێز و دیسپۆتیزمی لەخەیاڵدا بوو. ئەم دەوڵەتە لەرێگەی جیاوازەوە هەوڵیدەدا تاکۆمەڵگا بخاتە ژێر

کۆنترۆڵی خۆیەوە، بەتایبەتی بە هاوکاری ڕێکخراوگەلێکی وەك "لژبونی خەباتگێڕان" (کە خەباتکەرانی جەنگەکانی رابردووی لەخۆیدا کۆکردبۆوە و دەورێکی سیاسی و ئایدۆلۆژی لەخزمەتی رژێمدا هەبوو)، "یارانی فەرەنسا"و "کارخانەکانی گەنجان" (کە بەرپرسیارێتی ڕێکخستنی لاوانیان لە ئەستۆ بوو) پۆلەکان و سیستەمە پۆلیەکان (کە کاریان ڕێکخستنی چالاکیەکانی کار بوو) و دواجار میلیس (کە رەفتارێکی هاوشێوەی پۆلیسی سیاسی هەبوو). دەوڵەت بەشێوەیەکی بەرفراوان دەستی دەخستە ناو بواری ئابوریش. بەمشێوەیە بە دەستدرێژکردن بۆ پۆلینگەری، بەرهەمهێنانی ڕێکدەخست و ڕێنمایدەکرد و باڵادەستی خۆی بەسەر پیشەسازی (بەهۆی کۆمیتەکانی ڕێکخراوی دروستکراو لەهەموو لقەکانی پیشەسازیدا) کشتوکاڵ (لەرێگەی پۆلی جوتیارانەوە)ی بەکاردەهێنا. دەوڵەت سەرەڕای ئەمانە لەهەندێك لقی تازە دروستبوودا یان زیندوودا (وەك شارسازی، تەدارکات، ئازوقە گەیاندن) دەورێکی چارەنوسازانەی دەبینی. ئەمجۆرە دەستێوەردانە فراوانە، پەرەسەندنی دەزگای بەڕێوبەرایەتی دەوڵەتی زیادبوونی کارمەندانی لەگەڵ خۆیدا هێنا (لەم قۆناغەدا ژمارەی کارمەندانی دەوڵەت یەك بەرابەر و نیو بوو).

ڕژێم هەروەها دەیوست بەهۆی کۆنترۆڵکردنی هەموو دەزگاکانی راگەیاندن و دەستدرێژکردن بۆ پڕوپاگەندەی میتۆدیانە لە بڵاوکراوەکان و رادیۆ و سینەمادا، بیروڕای خەڵکی فۆرمەلە بکات. کۆمیتەکانی پڕوپاگەندەش دروستبوون کە پەرەی بە شێوازی کەسایەتی مارشال بیتن دەدا. هەرچەندە جیابونەوەی کەنیسە و دەوڵەت بەدەست لێنەدراوی مایەوە، بەڵام پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دوانە تێکەڵ بوون کە دەکرێ لەو ناوەدا ئاماژە بە دانی هەندێك ئیمتیاز بە کەنیسەی کاسۆلیکی بکرێت (وەك کۆمەك کردن بە فێرگا مەزهەبیەکان، گێرانەوەی هەندێك دارایی و پارەی مەزهەبی بۆ کەنیسە، گۆڕانی هەلومەرجی یاسایی ڕێکخراوە دینیەکان، لێخۆشبوون لە زەریبە، چاککردن و بنیادنانەوەی بینا مەزهەبیەکان) کەنیسەی کاسۆلیکیش لەبری ئەمە دەستیکرد بە پشتیوانی شاراوە لە رژێم و سەرکردەکەی.

ڕژێم دەیویست بەئامانجی بونیادنانەوەی نەتەوە، پێکەوەبوونی نەتەوەیی سەرلەنوێ بونیاد بنێتەوە و لە رەگەزە ناویستەکان، پاکی بکاتەوە. بەمشێوەیە دەزگای بەڕێوبەرایەتی پاڵاوت و فراماسیۆن و یەهودیەکانی لە بەڕێوبەرایەتیە دەوڵەتی و هەندێك کار، دەرکرد. جێگەیەکی یاسایی تایبەتی بۆ یەهودیەکان رەچاو کرد کە بەدوو یاسا (یەکەمیان لەئوکتۆبەری ساڵی *1940* دا و دوهەمیان لە ژوینی *1941* دا ) سەپاند و بەکردەوە یەهودیەکان بوون بە هاوڵاتیانی پەراوێزی. هەندێك لە یەهودیەکان تەنانەت نەتەوەی فەرەنسی خۆیان لەدەستدا (لەوانە یەهودیەکانی جێنشینی جەزائیر). دەبێ سەرنج لەو خاڵە بدرێت کە یاسای سێهەمی ئوکتۆبەری *1840* ، یەهودی نەك لەسەر بناغەی دین، بەڵکو لەسەر بناغەی نەژاد پێناسەدەکرد. ئەم پێناسەیە بەئاشکرا تێڕوانینی ئەتنی بۆ نەتەوە پیشاندەدات کە لەگەڵ مۆدێرنەی سیاسیدا ناگونجێت. زۆر تێنەپەڕی کە رەگەزپەرستی بووە هۆی نەفیکردنی جەستەیی زۆرێك لە یەهودیەکان (کە زوربەیان بێگانە بوون)، لەساڵی *1942*دا ئەمانەیان دەستگیرکرد و رەوانەی ئۆردوگاکانی مردنیان کردن.

بەمشێوەیە رژێمی ڤیشی تێڕوانینی ئەتنی بۆ نەتەوە، لەبری تێڕوانینی سیاسی بۆ نەتەوە دانا و بە دانانی کۆمەڵگا لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا و بە بەکارهێنانی ئابوری رەچاوکراو، چاوی لە مۆدێرنەی سیاسی پۆشی. لەئەنجامدا کۆمەڵگای مەدەنی خودموختاری خۆی لەدەستدا و دەوڵەتی فەرەنسا وازی لە مۆدێرن بوون هێنا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا رژێمی ڤیشی تەمەنێکی کورتی هەبوو (تەنها چوار ساڵ) و بەهۆی فەرمانبەرداری لە داگیرکەرانی ئەڵمانی، خاوەن نفوزێکی ئەوتۆ نەبوو. لەراستیدا دەبێ رژێمی ڤیشی بە کەوانێکی کورت لەمێژووی وڵاتێکدا بزانین کە خاوەن مێژوویەکی دێرینی مۆدێرنەی سیاسی بوو. رێك لەبەرئەمەش فەرەنسا پاش ئازادبوون، بێ سێ و دوو رویکردە مۆدێرنەی سیاسی.

### 2ـ ناسیۆنال سۆسیالیزمی ئەڵمانی

لە ئەڵمانیادا ناسیۆنال سۆسیالیزم مۆدێرنەی سیاسی بەتەواوی رەدکردەوە و لێرەوە وەك نەفیکەری تەواوی مۆدێرنەی سیاسی دەرکەوت. دەوڵەتی نازی زیاتر لە دەوڵەتی فاشیستی ئیتاڵیا دژی دەوڵەتی مۆدێرن بوو. . لەو روەشەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی بەتەواوی توانەوە یان خنکاندی، بەدەوڵەتێکی تۆتالیتار دادەنرێت.

ناسیۆنال سۆسیالیزم سەرەتا باڵاتربوون و لەپێشبوونی پێکەوەبوونی بەسەر تاکدا بەروونی راگەیاند کە هێندە شتێکی تازە نەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی باسی پێکەوەبوونی لەسەر بناغەی نەژاد دەکرد، مانایەکی تایبەتی پەیدا کرد. لەم وتەیەوە ئەو دەرئەنجامە وەردەگیرێت کە تاك تەنها بەهۆی پێکەوەبوونی نەژادی و بۆ ئەو بوونی هەیە. ئەم قسەیە بەتایبەتی لە مەسەلەیەکدا راستە کە تاك سەر بە نەژادی ئاریایی بێت کە لەخۆبوردنی ئەندامەکانی بە گریمانە دەگرێت. هیتلەر لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەوەی دەبێتە هۆی مەزنی مرۆڤی ئاریایی نەك دەوڵەمەندی توانا زیهنیەکانی، بەڵکو خەسڵەتی سروشتیەتی بۆئەوەی کە هەموو تواناکانی خۆی بخاتە خزمەت پێکەوەبونەوە(...)و بەوەی ئەو بە مەیل و ئارەزوو، منی خۆی پەیوەستدەکات بە پێکەوەبونەوە و لەکاتی پێویستدا ئامادەیە خۆی لەپێناویدا قوربانی بکات". مرۆڤی ئاریایی بە "ئایدیال خوازی" دەناسرێتەوە. . واتە بەو توانایەی کە تاك بۆ قوربانیکردنی خۆی لەپێناوی پێکەوەبون و هاوچەشنەکانیدا لەخۆی پیشاندەدات. لەئەنجامدا ئازادی تاك بەڕاستی بوونی نیە و ملکەچی پێکەوەبوونی نەژادیە: "مافی خاوەندارێتی ئازادی تاکەکەس لەبەرامبەر ئەرکی پاراستنی نەژاددا، پاشەکشێ دەکات".

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیتلەر دەیەوێت تا "حساب بۆ بەهای تایبەتی تاك بکات" و لەم ئاراستەیەدا تاك لەبەرامبەر جەماوەر و زۆرینەدا دادەنێت و پەنجە بۆ نوێخوازی و داهێنانی تاك رادەکێشێت: "تێڕوانینە نەژادپەرستنەکانی ئێمە (...)نەك هەر بەهای نەژاد، بەڵکو هەروەها گرنگی کەسایەتی مرۆڤی بە فەرمی دەناسێت" لەمڕووەوە "هەرجۆرە رێکخستنێکی دەوڵەت دەبێت لە بنەمای کەسایەتیەوە" سەرچاوە بگرێت و ئەم بنەمایە دەبێ لەبری "بنەمای پەرلەمان کە لەسەر بناغەی زۆرینە دامەزراوە" دابنیشێت. ئاشکرایە ئامانج جەختکردنە لەسەر گرنگی کەسایەتی، ئاراستەکردنی نابەرابەری تاکەکان و رەدکردنەوەی بنەما زۆرینەیە، نەك بە فەرمی ناسینی ئازادی فەردی و بونیادنانی تاك باوەڕی مۆدێرن.

ناسیۆنال سۆسیالیزم لە چرکەی دوهەمدا مەیلی بۆ ئەوە هەبوو دەوڵەت لەگەڵ جەماوەر (یان نەتەوەدا) بەیەك شت بزانێت و سەرەتا یەکەم بخاتە خزمەتی دوهەمەوە. دەکرێ دەوڵەتی تۆتالیتاری هیتلەری ـ بەپێچەوانەی دەوڵەتی لیبڕاڵەوە. بە "یەکشت دانانی نەتەوە و دەوڵەت"، بەیەکتابوونی تەنگا و تەنگ" یان "پەیوەندی یەکتابوونی بەشی سیاسی" نەتەوە بە دەوڵەتەوە پێناسەبکرێت. سەرنجدان لەم خاڵە گرنگە کە مۆسۆلۆنی باڵاتربوون و لەپێشبوونی دەوڵەتی بەسەر نەتەوەدا راگەیاند، لەکاتێکدا هیتلەر بەپێچەوانەوە لەپێشبوون و باڵاتربوونی نەتەوە یان جەماوەری بەسەر دەوڵەتدا سەلماند: "خاڵی دەرچوونی تێزی ناسیۆنال ـ سۆسیالیزم جەماوەر یان (نەتەوە) یە نەك دەوڵەت". لەراستیدا جەماوەر (یان نەتەوە)یە کە شکڵ بە دەوڵەت دەدات، نەك بەپێچەوانەوە. بەڵێ دەوڵەت "ئۆرگانیزمێکە لەنەتەوەوە هاتووە" یان وردتر بڵێین "ئۆرگانیزمێکی زیندووە کە نەتەوە دەستی بە پێکهێنانی کردووە". هیتلەر دەوڵەت تەنها بە شکڵێکی سادە یان چوارچێوەیەکی بەتاڵ دادەنێت و لەدیدی ئەوەوە جەوهەر یان ناوەڕۆکی دەوڵەت هەمان جەماوەر نەتەوە یان نەژادە. لێرەوە "دەوڵەت هۆکارە نەك ئامانج". چونکە دەوڵەت ناتوانێت ئامانجێك بێت لە خۆیدا، کەوابوو بە ئامێرێك بۆ خزمەتی جەماوەر دادەنرێت. دەوری دەوڵەت کورت نابێتەوە بۆ پاراستنی رێکخستنی باش، بەڵکو بریتیە لە بەرگری لە جەماوەر و زامنکردنی پەرەسەندن و گەشەکردنی. هیتلەر هەروەها باڵاتربوونی و لەپێشبوونی نەژادی بەسەر دەوڵەتدا راگەیاند و دەوڵەتی خستە خزمەتی نەژادەوە و ئەم تێڕوانینە رێنمای هیتلەری کرد بۆ پێشنیارکردنی دەوڵەتێکی نەژادپەرست کە ئامانجی سەرەکی پاراستنی نەژادی ئاریایی ـ وەك مەرجی بنەڕەتی شارستانێتی مرۆڤایەتی ـ بوو: "ئامانجی ئەم دەوڵەتە هەمان پاراستن و ئاسانکردنی گەشەسەندن و پەرەسەندنی کۆمەڵێك مرۆڤە کە لەرووی جەستەیی و رۆحیەوە یەکجۆرن (...) ئامانجی غائی دەوڵەتێکی نەژادپەرست دەبێ چاودێریکردنی ئەو ئەرکە بێت کە نوێنەرانی نەژاد.. (واتە بڵاوکەرەوەکانی شارستانیەت) بپارێزرێن".

سەرەڕای ئەمە ناسیۆنال سۆسیالیزم نەتەوە لەسەر بناغەی نەژاد پێناسەدەکات و لەگەڵ نەژاددا بە یەکشتی دادەنێت. وەك دەزانین تێڕوانینی ئەتنی ـ کلتوری بۆ نەتەوە لە دێرزەمانەوە بەقوڵی لەئەڵمانیادا رەگ و ریشەی هەبووە. لەراستیدا ئەڵمانیا لەتێڕوانینی سیاسی بۆ نەتەوە دووربوو، لەم وڵاتەدا نەتەوە یان جەماوەر یان بە پێکەوەبوونێك دادەنا بە خاڵی دەرچونی نەتەوەی، زمانی و کلتوریەوە. بەهۆی فرەیی دەوڵەتەکانەوە لە کۆمەڵگای ئەڵمانیادا و هەروەها درەنگ کەوتنی یەکێتی ئەڵمانیا، ئینتیمای نەتەوەیی گرنگتر لە رێکخستنی سیاسی دەردەکەوت و لێرەوە نەتەوە لەپێشبوون و باڵاتربوونی خۆی بەسەر دەوڵەتدا پاراست. ناسیۆنال سۆسیالیزم بە پشتبەستن بەم پێدراوە بنەڕەتیە و بە بنیادنانی نەتەوە لەسەر بناغەی نەژاد (و نەك کلتور) لەراستیدا هەنگاوێکی بەرزتری نا "نەتەوەییبوون یان باشتر وایە بڵێین نەژاد بەستراوە بە خوێنەوە نەك بە زمانەوە". هیتلەر تێڕوانینی کلتوری بۆ نەتەوە خستە لاوە و تێڕوانینێکی نەك ئەتنی بەڵکو نەژادپەرستانەی خستە جێی. ئەو شێت و شەیدای نەژاد بوو. نەژادپەرستی رەهای دەپەرست. نایەکسانی نەژادەکانی دەسەلماند و لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە نەژادی ئاریایی لە نەژادەکانی دی باڵاترە و دەبێ

بەسەریاندا زاڵ بێت. بەڵی لەدیدی هیتلەرەوە نەتەوەی ئەڵمانی لە نەژادی ئارییایی بوو، و لێرەوە دەبوو بۆ بەرگری لەم نەژادە و پاراستنی پاکێتی ئەم نەژادە راپەڕێت و رێگەی گەشەکردن و پەرەسەندنی هەموار بکات. لێرەوە دەبێ نەتەوەی ئەڵمان بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا کە لەم نەژادە نین و مەترسیان بۆی هەیە ـ بەتایبەتی یەهودیەکان ـ بالادەست بێت و تەنانەت لەناویان بەرێت. بەمشێوەیە نەژادپەرستی بەشێوەیەکی لۆژیکی دژایەتیکردنی یەهودی و لەناوبردنی یەهودیەکانی بەدوای خۆیدا هێنا. لەڕاستیدا ناسیۆنال سۆسیالیزم تێروانینی ئەتنی بۆ نەتەوەی گەیاندە ئەوپەڕی توندڕەوی.

لەم دیدەوە دەوڵەت تەنها لەخزمەت نەتەوە و نەژادا نیە، بەڵکو خۆشی دەبێت بە دەوڵەتێکی نەژادی و نەژادپەرست. هەروەها بناغەی هاوڵاتیبوون لەسەر خوێن بونیادنراوە: "بۆ هاوڵاتیبوون ئینتیمای دینی بایەخێکی ئەوتۆی نیە، گرنگ بوونی خوێنی ئەڵمانیە و لێرەوە هیچ یەهودیەك ناتوانێت بە هاوڵاتی دابنرێت". کەوابوو لە ئەڵمانیادا دەوڵەت دەبێ پارێزگاری لە نەژادی ئارییایی و پەرەسەندنی، پارێزگاری لە پاکی خوێن بکات و تێکەڵبوون رەد بکاتەوە و دواجار رێگەی چاکسازی نەژادی بگرێتە بەر. بەڵێ دەبێت لەم ئاستەدا باشترین رەگەزەکان پەرە پێبدرێت و رەگەزە کەموکوڕەکان (ئەو نەخۆشانەی چارەسەر ناکرێن، پیرەکان و دوژمنانی سیاسی و..) لەناوبەرێت. دەوڵەت دەبێ فەزای پێویست بۆ پەرەسەندن و گەشەپێدانی نەژادی ئارییایی، واتە فەزای زیندووی) *lebensarum)* نەتەوەی ئەڵمانیا، دابینبکات. سەرەڕای ئەمە دەبێت هەموو ئەڵمانیەکان کۆبکاتەوە، روونە کە خواستێکی وا پێویستی بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر زەوی دی هەیە. هەروەها دەوڵەت دەبێت بە دابینکردنی سەروەری ئەڵمانیا بەسەر ئەوروپا و سەرتاسەری جیهاندا، بەدیهاتنی بالاتربوونی نەژادی ئارییایی بکاتە ئامانجی خۆی.

بەمشێوەیە ناسیۆنال سۆسیالیزم بە پێناسەکردنی نەتەوە لەسەر بناغەی نەژاد و بە کەمتر دانانی دەوڵەت لەبەردەم نەتەوەدا، لەراستیدا لەجەمسەری دژ بە مۆدیرنەی سیاسیدا جێگەی گرت و تێڕوانینێکی ئەتنی و نەژادپەرستانەی بۆ نەتەوە دەرخست کە زۆر لە تێڕوانینی کلتوری کە لەکۆمەڵگای ئەڵمانیدا رەهەندێکی کلاسیکی هەبوو، جیاواز بوو. ئەم خاڵە گرنگە کە ئینتیما بۆ نەتەوە بە خەسڵەتە بایەلۆجیەکان و خوێنەوە دیاریدەکرا و لێرەوە نە پەیوەندی بە ئیرادە و ویستی مرۆڤەکانەوە هەبوو، نە بە ئینتیمای کلتوریانەوە. لەئەنجامدا تاکەکان بەخەسڵەتە نەژادیەکانیان پێناسەدەکران و کورتبونەوە بۆ بەشەکانی هەمەکیەکی نەژادی و بەمشێوەیە چارەنوسیان بە چارەنوسی نەژادەکەیانەوە بەسترایەوە. ئەو کەسانەی لەم نەژادە نەبوون نە دەیانتوانی بەشێك لەنەتەوە بن و نە بەهاوڵاتی دەژمێرران ، جگەلەمەش وەك مەترسیەك بۆ پاکی نەژاد تەماشا دەکران و لێرەوە دەبوو دەرکرێن یان تەنانەت لەناوببرێن. لەم ئاستەدا سەرەتا یەهودیەکانیان لە دامێنی نەتەوە کردەوە و لە مافی هاوڵاتیبوون بێبەشیان کردن (یاساکانی نۆرمبێرگ لەساڵی *1935* دا) پاشان لە بەڕێوبەرایەتیە دەوڵەتیەکان و هەندێك کاری ئازاد دەریانکردن. بەمشێویە یەهودیەکانیان ناچار بە دورخستنەوەکرد و دواجار (بەپێی بڕیاری کونفرانسی فەرەنسا *wansee* لە ژانویەی *1942*دا) بەبەرفراوانی لەناویان بردن. دەوڵەتی نازیش وەك نەتەوە بە پێکەوەبونێکی نەژادی دادەنرا و

گوێڕایەڵی ناعەقڵانیانەی نەژاد و پەیڕەوی خواستە شێت ئاساکانی گێڕانەوە بۆ نەژاد بوو.

دواجار ناسیۆنال سۆسیالیزم وەك فاشیزمی ئیتاڵی بەو مانایە تۆتالیتار بوو کە جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای کردو قبوڵنەدەکردو و خەسڵەتی نەژادپەرستانە و شێوازە دیکتاتۆری ئاساکانی، خەسڵەتی تۆتالیتاریانەی ئەوەندەی دی زیادکرد. لەراستیدا دەوڵەتی نازی دەیویست تا کۆی کۆمەڵگا و پانتایی چالاکیە جیاوازەکانی وەك ژیانی سیاسی، ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان، ئابوری، پەروەردە، راگەیاندن و ناوەندەکانی هەواڵ، کلتور و . . . بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و سەرپەرشتی بکات. لەو روەوە کە حیزبەکانی دی قەدەغە کران یان هەڵگیران، حیزبی یەکتا لەم مەسەلانەدا دەورێکی سەرەکی بینی. ئەم حیزبە بەپێی یاسای ساڵی*1933* بەشێوەیەکی تەنگاو تەنگ لەگەڵ دەوڵەتدا بوو بە یەکشت. ئەم یاسایە رایگەیاند "حیزبی کرێکاری ناسیۆنال سۆسیالیزمی ئەڵمانیا نوێنەری بیری نەتەوەیی ئەڵمانییە و بەشێوەیەکی جیانەبۆوە بە دەوڵەتەوە گرێدراوە". رژێم هەروەها پۆلیسێکی سیاسی ترسناکی بەناوی گشتاپۆوە لەدەستدابوو کە دوژمنانی دەستگیر دەکرد، زیندانی لەناودەبرد. سەرەڕای ئەمە بۆ ڕێکخستن و کونترۆڵکردنی تاکەکان، بەتایبەتی لاوان و کرێکاران و رۆشنبیران، دەستیکرد بەدروستکردنی ڕێکخراوگەلێکی جەماوەری. لە ساڵی*1933* دا سەندیکاکانیان هەڵگرت "بەرەی کاری ئەڵمانیا"ی لەبری دانا کە لەڕووی نمونەی پۆلەکانەوە بەجۆرێك ڕێکخراو بوو تا جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکان داپۆشێت و ڕێگە لەهەموو جۆرە روبەروبونەوەیەکی چینایەتی بگرێت. دەوڵەت دەستی لە بواری ئابوریشەوە دەدا و سیاسەتێکی ئابوری ڕێنمایکەری پەیڕەو دەکرد و هەروەها دەستیکرد بە بەرنامەڕێژی بەرهەمهێنان بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی و بەتایبەتی لە زەمینەی چەکسازیدا پاڵی پێوەدەنا.

لەدیدی هیتلەردا پەروەردە بە ئامانجی پەروەردەکردنی "ئەندامانی سودمەند بۆ کۆمەڵگا" دەبێ لەدەست دەوڵەتدا بێت. لەم ئاستەدا ماف گشت و دەوڵەت بەسەر ماف تاك و خێزاندا زاڵە، چونکە باسی پاراستنی جەماوەر و پارێزگاری لەنەتەوە لە ئارادایە. لێرەوە حیزب چاودێری فێرکاری لاوانی دەکرد کە لە ڕێکخراوی لاوانی هیتلەریدا کۆبوبونەوە. رژێم هەروەها هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی (بڵاوکراوەکان، رادیۆ و سینەما)ی کۆنترۆڵدەکرد و دەستی بە پڕوپاگەندەی مەنهەجی دەکرد. بەڵی ئازادی دەربڕین بوونی نەبوو، وە هەر چالاکیەك لەم بوارەدا بە وردی دیسپلین دەکرا. یاسای ساڵی *1933* بڕیاری دا کە "هاوکاری(...) لەنوسینی رۆژنامەکان و گۆڤارەکان و هەفتەنامەکاندا(...) بەچالاکیەکی گشتی دادەنرێت کە ئەم یاسایە مافەکان و ئەرکەکانی دەست نیشاندەکات". دواجار رژێم دەیویست شێوە جیاوازەکانی کلتور ڕێکبخات و کۆنترۆڵبکات و لەمڕووەوە لەساڵی*1933* دا یاسایەکی دی "ژوری کلتور" یان بەقسەیەکی وردتر ژوری "پۆلە فەرمیەکان"ی بونیادنا کە ئەندامانی بەشە جیاوازەکانی کلتوری لەخۆیدا کۆدەکردەوە. بەمشێوەیە بە ریز شەش ژور بۆ نوسەران، بڵاوکراوەکان، رادیۆ، موسیقاژەن و موسیقازانەکان، شانۆ و هونەرە بەرجەستەیەکان، دروستبوون. حقوق و زانستەکانیش بوون بە ملکەچی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنال سۆسیالیزم و جیهانبینیەکەی. رژێم هەروەها توانی بە بەدەستهێنانی پشتیوانی کەمتازۆر بەرفراوان لە

پرۆتستانەکان (بەهاوکاری کەنیسەی مەسیحی ئەڵمانی) بە ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەیەك لەگەڵ ڤاتیکاندا (لە ژوئیەی ساڵی1933دا) دینیش بێلایەن و کۆنترۆڵبکات.

ئاشکرایە لەهەلومەرجێکی وادا نە دەوڵەتی مۆدێرن دەیتوانی بوونی هەبێت کە بەپێناسە پێکەوەبوونی هاوڵاتیانە و نە کۆمەڵگای مەدەنی کە بەمانای فەزای ئازادیە. ناسیۆنال سۆسیالیزم زیاتر لە فاشیزمی ئیتاڵی جیابونەوەی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای لەناوبرد و هەر لەبەر ئەم هۆ بنەڕەتیەش هەم تۆتالیتار بوو و هەم مۆدێرنەی سیاسی بەشێوەیەکی کامڵ ڕەددەکردەوە. لەمڕووەوە دەکرێت دەوڵەتی نازی بە ئەنتی تزی کامڵبووی دەوڵەتی مۆدێرن بژمێرێت. دەوڵەتی نازی وەك دەوڵەتی پێشمۆدێرن پەیدابوو کە دەست بۆ شێوازەکانی دیکتاتۆرئاسایانە و تەکنیکە مۆدێرنەکان دەبات. ئەم شێوازانە کە تەنها بوونە هۆی زیادبوونی توانای سەرکوتکردن و توندبوونی گەندەڵی ئەم دەوڵەتە، نابێت خەسڵەتە راستەقینەکەی بشارێتەوە. بەڵی ئەو خاڵەی کە ناسیۆنال سۆسیالیزم تا ساڵی 1943 خاوەن پشتیوانیەکی بەربڵاوی خەڵکی ئەڵمانیا بوو، بە باشی پیشانیدەدات کە خەڵکی ئەم وڵاتە بەئاسانی نەبوونی مۆدێرنەی سیاسیان قبوڵکرد و ملیان بۆ کۆیلەیەتیەکی خۆویستدا. دەرکەوتنی ناسیۆنا سۆسیالیزم دەبێ بە دابڕانێك توند لە گۆڕانی سیاسی ئەڵمانیا و تەنانەت پاشەکشێیەکی کارەسات ئامێزانە بۆ وڵاتێك بزانرێت کە بە بەرپابوونی کۆماری ڤایمار پێی نابووە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە. ئەڵمانیا پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دوهەم و روخانی نازیزم توانی بەراستی دەستی بە مۆدێرنەی سیاسی بگات. ئەو گۆڕانە بنەڕەتیەی پاش ساڵی 1945 لە ئەڵمانیادا رویدا، هەمان ماڵئاویکردن بوو لە نەتەوە ئەتنی کلتوری و گۆڕانی بۆ نەتەوەی سیاسی.

## 3- کۆمنیزمی سۆڤیەت و چین

کۆمۆنیزمیش بە شێوەیەکی گرنگی تری تۆتالیتاریزمی سەدەی بیستەم و رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی، دەناسرێتەوە. بەڵام رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی لەم حاڵەتەدا بەشێوەیەکی تەواو جیاواز دەرکەوت. چونکە نە وەك فاشیزم دەرئەنجامی ستایشی دەوڵەت بوو و نەك وەك نازیزمیش دەرئەنجامی پەرستنی نەتەوە و نەژاد. دەکرێ رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی لە یەکێتی سۆڤیەتدا بگەڕێنینەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی کە یەکێکیان مێژوویە و ئەویدیان ئایدۆلۆژیە. یەکەم شۆڕشی ئۆکتوبەری 1917 لەوڵاتێکدا رویدا کە هێشتا پێی نەخستبووە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە و جگە لەمەش هێشتا زۆر بەسەر روخانی رژێمی تزاریدا تێنەپەڕی بوو. هەرچەندە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە و بەتایبەتی لە ساڵی1905 وە ئازادیەکانی تاك کەمتازۆر دەرکەوتبوون، بەڵام بەگشتی زۆر سنوردار بوون. گەرچی شۆڕشی فۆریەی 1917 رێگەیەکی کردەوە کە دەیتوانی بە مۆدێرنەی سیاسی بگات، بەڵام شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە توندوتیژی تەواوەوە ئەم رێگەیەی گرت. لەئەنجامدا ئەو دەوڵەتەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دروستیکرد سەرەڕای هەموو روکەشەکانی وەك دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن مایەوە کە درێژەی بە رژێمی پێشوو لە شکلێکی نوێدا دا. بەدەربڕینێکی دی روسیا لە ساڵی1917 دا هەلێکی مێژووی لەدەستدا کە بۆ پێخستنە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە هاتبووە بەردەمی. ئەم دۆخە پاش ماوەیەکی دی

ئەگەری لادانی بەرەو تۆتالیتاریزم ئامادەکرد کە بە بالآدەستی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا دەناسرێتەوە.

دوهەم ئایدۆلۆژیای مارکسیزم لینینیزمیش رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی روندەکاتەوە. وەك پێشتر بینیمان رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی لەبیری مارکسدا هەبوو. لینینیش ئەم تێروانینەی قبوڵکرد، چونکە دەوڵەتی مۆدێرنی لەگەڵ دەوڵەتی بۆرژوازیدا (کە دەبێ لەناو ببرێت) بەیەکشت دەزانی و سەرقاڵی بنیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی سەربەخۆش نەبوو. لە راستیدا مارکسیزم لینینزم پتر گرنگی بە پێکهاتە ئابوریەکان دەدات تا بە دەزگای سیاسی و ئەگەرچی تیورەیەکی دەربارەی دەوڵەت هەیە، بەڵام ئەم تیورەیە هەم کورت و چرە و هەم وەك پێویست پەروەردە نەکراوە. بەکورتی ئەم تیۆرەیە تەماشای دەوڵەت وەك ئامێرێك دەکات کە بەدەست چینی بالآدەستەوەیە و لەئەنجامدا بڕوایوایە پرۆلیتاریا دەبێت ببێ بە چینی حوکمڕان و کۆنترۆڵی دەوڵەت بگرێتە دەست خۆی. پاش ئەمە دەوڵەت بۆ بەدیهێنانی گۆڕانە ئابوری و کۆمەڵایەتیە پێویستەکان بەکاردەهێنرێت. لێرەوە دەوڵەت دەورێکی ئامێری هەیە و نەك هەر لە کۆمەڵگای مەدەنی جیا نیە، بەڵکو رێنمایکردن و دروستکردنی کردووە بەئامانجی خۆی. ئاشکرایە لەم هەلومەرجەدا مۆدێرنەی سیاسی ناتوانێت ئامانجێك بێت کە دەبێ هێواش هێواش بەدەست بهێنرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە بۆ دابینکردنی بالآدەستی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا، دەبێ راستەوخۆ رەد بکرێتەوە. ئەمەش هەمان ئەو رێگەیەیە کە مارکسیزم لینینزم بە ئامانجی بونیادنانی کۆمەڵگای سۆشیالیستی، گرتیەبەر.

ئەم دوو هۆکارە مێژووی و ئایدۆلۆژیە پێکەوە رێگەیان لە بەدیهاتنی مۆدێرنەی سیاسی لە یەکێتی سۆڤیەتدا گرت و ئەم وڵاتەیان بەرەو تۆتالیتاریزم برد. گەرچی تۆتالیتاریزم لەرەوتی حەوت دەیەی رژێمی سۆڤیەتدا گۆڕانی بەسەردا هات و لەقۆناغە جیاوازەکاندا شێوەی جیاوازی بەخۆیەوە گرت و بەهەورازو نشێودا رۆیشت، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی بە بالآدەستی گشتی و بەردەوامی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا دەناسرێتەوە. تازە حیزبی کۆمۆنیست کە ماوەیەك نوێنەری پرۆلیتاریای کرێکاری و جوتیاری بوو، کۆنترۆڵی دەوڵەتی خستبووە دەست خۆیەوە. بەهەرحاڵ بالآدەستی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا بەشێوەی جۆراوجۆر بەکارهێنرا و لەپراکتیکدا کامڵ و تەواو *totale*بوو.

سەرەتا دەسەلآتی سیاسی هەوڵیدا تا بە سەپاندنی تاکە حیزبێك، قەدەغەکردنی حیزبەکانی دی، بەرپاکردنی سانسۆر، کۆنترۆڵی بڵاوکراوەکان، پێکهێنانی پۆلیسی سیاسی و پەنابردن بۆ تۆقاندن (تیرۆر) بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ بێت. پاشان تۆقاندن لە سەردەمی ستالیندا زیادی کرد و ئۆردوگاکانی کۆلاگی پێکهێنا (رێژەی ژمارەی زیندانیەکان لەنێوان ساڵی *1937* تا ساڵی *1953*نزیك دوو ملیۆن کەس بوو). دەوڵەت هەروەها سەرپەرشتی کۆی ئابوری چ لە بەشی پیشەسازی و چ لە بەشی کشتوکاڵیدا بە سۆشیالکردنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان (لەوانە زەویەکانی کشتوکاڵی) و بە بەرنامەرێژیەوە دەکرد. دەستوری ساڵی *1936* کە بەشی یەکەمی بەر لە باسکردنی دەزگای دەوڵەت، بۆ باسی رێکخستنی کۆمەڵگا تەرخانکراوە،بڕیاری لابردنی موڵکایەتی تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و جێگرتنەوەی بە موڵکایەتی سۆشیالیستانەی لە شکڵی موڵکایەتی دەوڵەتدا (ماڵ و داراییەکانی هەموو خەڵك) و

مولّكايەتی هەرەوەزی و كەلخۆزی (سەر بە سەندیكاكانی هەرەوەزی یان كۆلخۆزەكان)دا (مادەی 45 و 15). گەرچی مولّكايەتی تایبەتی شتە شەخسی و ئابوریە بچوكەكانی جوتیاران و پیشەوەران قبولّكرا، بەلاّم سیستەمی ئابوری سۆشیالیستی شێوەی بالاّدەستی ئابوری ولاّت بوو (مادەكانی9 و 10). ئەم بڕیارانە لە دەستوری سالّی *1977*دا هەروا پارێزرا و ئەم یاسایەش جارێكی دی مولّكايەتی سۆشیالیستانەی ئامێرەكانی بەرهەمهێنانی لە شێوە جیاوازەكانیدا، سەلماند.

دەولّەت دەیویست شكلّ بە كۆمەلّگا بدات و سەرپەرشتی چالاكیە جۆراوجۆرەكانی بكات. كۆمەلّگا ژیانێكی سەربەخۆی نەبوو، لەنێوان هاولاّتی و تاكدا هیچ جیاوازیەك نەبوو. لەراستیدا یەكێتی سۆڤیەت تەنها هاولاّتیانی بە فەرمی دەناسی و تاكەكانی فەرامۆشدەكرد. بەمشێوەیە مرۆڤ بوونێكی شەخسی نەبوو و كورت بوو بۆوە بۆ ئەندامێكی كۆمەلّ. هەرچەند دەستورەكانی سالّی *1936*و*1977* ، بەپێچەوانەی دەستوری*1924* وە زۆرێك لە مافە بنەڕەتیەكان دەسەلمێنن، بەلاّم ئەم مافانە بە هاولاّتی دەبەخشن نەك بە تاكەكان. لێرەوە نەك مافەكانی مرۆڤ وەك تاك، بەلّكو ماڤ هاولاّتیان (ئەگەر بە روكەشیش بێت) بە فەرمی ناسرا. لەئەنجامدا تاك وەك تاك بوونی نەبوو، بەلّكو تەنها هاولاّتیان . وەك ئەندامانی دەولّەت . بوونیان هەبوو. بەمشێوەیە تاك خاوەنی ئازادی راستەقینە نەبوو، لە ئینتیما سروشتیەكانی . وەك خێزان . جیا بوو بۆوە لەناو هەمەكیەكدا توابۆوە كە بەتەواوی پەیوەست بوو پێوەی. دەولّەت و حیزب چاودێری و كۆنتڕۆلّی هەموو لایەن و رەهەندەكانی ژیانی تاكیان دەكرد و ئاشكرایە كارێكی واش رێگەی لە فۆرمەلەبوونی كۆمەلّگایەكی مەدەنی سەربەخۆ دەگرت. بەلّی ماڤ مرۆڤ فەرامۆشكرا و بەئاشكرا دەستدرێژی كرایە سەر. لەئەنجامدا كارەكە راكێشرا بۆ بەربەریەت و دیسپۆتیزم كە هاوكات بوو لەگەلّ گرتنەكان، و رەوانەكردن بۆ ئۆردوگاكان و لەسێدارەدانی بەرفراوان. ئایدۆلۆژیای فەرمی بانگەشەی سەرپەرشتیكردنی زانست و زانین و هونەر و كلتوری دەكرد و لەم ئاستەشدا جێگەیەكی بۆ ئازادی نەدەهێشتەوە و بەتایبەتی رۆشنبیران خاوەن ئازادی بیر و دەربڕین نەبوون و وا دەردەكەوت كە تەنها دین لەدەستدرێژی دەسەلاّت رزگاری بوویێت. چونكە ئازادی بیروڕا و ئازادی ئاینە مەزهەبیەكان سەلمێنرا و كەنیسە لە دەولّەت جیابوو بۆوە(دەستوری *1936* مادەی *124* و دەستوری سالّی *1877* مادەی 52). دیارە پروپاگەندەی خوانەناسیانە و دژە دینیش ئازاد بوو. بەلاّم لەكردەوەدا گەرچی هەندێكجار دینیان لەراستیشدا كەنیسەی ئەرۆزێكس . دەخستە ژێر فشارەوە و هەندێكجار دەیانخستە خزمەت رژێمەوە، بەلاّم رژێم هەمیشە چاودێری و كونتڕۆلّی دەكرد.

دەستوری سالّی*1977* تا ئەو شوێنە رۆیشت كە تەنانەت دەولّەتی لەگەلّ كۆی كۆمەلّگادا بەیەكشت دانا. لەكاتێكدا دەستوری *1936* یەكێتی سۆڤیەتی بە "دەولّەتی سۆشیالیستی كرێكاران و جوتیاران" پێناسدەكرد"(مادەی یەكەم)، دەستوری سالّی *1977* یەكێتی سۆڤیەتی بە "دەولّەتی سۆشیالیستی هەموو خەلّك" ناونا(مادەی یەكەم) و ئەوەشی كە لەسەرەتای شەستەكانی میلادیەوە قبولّكرابوو، بەمشێوەیە گۆڕی كە قۆناغی دیكتاتۆری پرۆلیتاریا كۆتایی پێهاتووە و "دەولّەتی سۆڤیەت بووە بە دەولّەتی هەموو خەلّك"(پێشەكی). ئەم تێڕوانینە بە ئاشكرا بەمانای نەفیكردنی جیاوازی نێوان دەولّەت و خەلّك و لێرەوە رەدكردنەوەی جیابونەوەی

دەوڵەت لە کۆمەڵگای مەدەنیە، چونکە وابیریان دەکردەوە کە هەنوکە بونیادنانی کۆمەڵگای سۆشیالیستی لە چوارچێوەی دەوڵەتی سۆڤیەتدا، ئەنجامدراوە.

سەرەڕای ئەمە دەوری حیزبی کۆمۆنیست لە زاڵبونی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا چارەنوسسازانە بوو. لە دەستوری ساڵی *1936* دا (مادەی 126) حیزبی کۆمۆنیست وەك "ڕێبەری هەموو ڕێکخراوە کرێکاریەکان لە ڕێکخراوە کۆمەلأیەتیەکانەوە بگرە تا ڕێکخراوە دەوڵەتیەکان" پێناسەکراوە. واتە حیزب ڕێکخراوە کۆمەلأیەتیەکان (سەندیکاکان، یەکێتیە هەرەوەزیەکان، ڕێکخراوەکانی لاوان، وەرزشی و کلتوری و..) و هەروەها ئۆرگانە دەوڵەتیەکان لەهەموو ئاستەکاندا سەرپەرشتی و کۆنتڕۆڵدەکات. کاتی دیاریکردنی پێگەی حیزب لە ساڵی*1961* دا دەوری ڕێبەرایەتیکردنی حیزبیان لەپەیوەندیدا بە کۆی کۆمەڵگاوە سەلماند. لە پێشەکی ئەم دەقەدا هاتووە کە حیزب "هێزێکە ڕێگە پیشانی کۆمەڵگای سۆڤیەت دەدات و ئاراستەی پێدەبەخشێت" و "سەرپەرشتی چالاکی داهێنەرانەی خەڵکی سۆڤیەت دەکات". دەستوری ساڵی *1977* بە هێنانەوەی فۆرمەکانی پێشوو لەمادەی شەشدا، بەهایەکی یاسایی پێبەخشین و سەرلەنوێ جەختی لەسەر "دەوری ڕێبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیست" کردەوە: حیزب "هێزێکە ڕێنمایی کۆمەڵگای سۆڤیەت دەکات و ئاراستەی پێدەبەخشێت، بە ناوکی سیستەمی سیاسی و هەموو ڕێکخراوەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەژمێرێت. حیزب ڕوانگەی گشتی پەرەسەندن و گەشەکردنی کۆمەڵگا دیار *(...)*و چالاکیە داهێنەرەکانی خەڵکی سۆڤیەت ڕێنماییدەکات".

یەکێتی سۆڤیەت لەسەرتاسەری ژیانی خۆیدا و سەرەڕای ئەو گۆڕانانەی بەسەریدا هات، هەروا نامۆبوو بە مۆدێرنەی سیاسی و بەردەوامی بە دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن لەشکڵێکی نوێدا دا. تۆتالیتاریزمی سۆڤێت بەدەر لە توندی و لاوازیەکانی لەقۆناغە جیاوازەکاندا، بە ڕەدکردنەوەی جیابونەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت، خواستی فۆرمەلەکردنی کۆمەڵگا بەپێی ئایدۆلۆژیای فەرمی دەناسرێتەوە. بەڵێ زاڵبوونی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا دەسبەسەراگرتنی ئابوری و نەبوونی ئازادی فەردی، بەروونی دەریدەخات کە یەکێتی سۆڤیەت مۆدێرنەی سیاسی بەشێوەیەکی کامڵ ڕەد کردۆتەوە و ڕوبەڕوی هەموو شتێك دەوەستایەو کە دەیتوانی بەرەو مۆدێرنەی سیاسی بڕوات.

بەلأم لەدوا ساڵەکانی ژیانی یەکێتی سۆڤیەتدا تاکەکان بوون بەخاوەنی هەندێك ئازادی و ژیانی تایبەتی دەستیکرد بەگەشەکردن و پەرەسەندن و ئەمەش ڕێگەی بۆ پەیدابوونی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەڵگای مەدەنی خۆشکرد. ئەم گۆڕانە بووە هۆی دوو گۆڕانی بنەڕەتی واتە قبوڵکردنی فرەیی حیزبە سیاسیەکان و مافی موڵکایەتی تایبەتی کە لە مارسی ساڵی*1990* دا لە گۆڕانی دەستوردا ناویبرا. بەمشێوەیە لەلایەك تاکە حیزب و دەوری ڕێبەرایەتیکردنی ڕزگاربوو، وە حیزبەکانی دی لەپاڵ حیزبی کۆمۆنیستدا ڕێگەی چالاکیان پێدرا و لەڕاستیدا هاولأتیان بوونە خاوەن مافی کۆبونەوەی ئازاد (مادەکانی6 و 51). لەلایەکی دیەوە واز لە موڵکایەتی سۆشیالیستانەی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان هێنرا و لەپاڵ "موڵکایەتی گشتی دەوڵەتدا"، "موڵکایەتی هاولأتیانی سۆڤیەت" سەلمێنرا. موڵکایەتیەك کە دەتوانێ پەیوەندی بە هەموو کالأ مەسرەفیەکان و بەرهەمهێنانەکانەوە

هەبێت، بۆ "دەستبەكاربوونی سەربەخۆی چالاكیە ئابوریەكان" سودی لێببینرێت (مادەكانی10 و 11). ئەم دوو گۆڕانە گرنگە جیابونەوەی دەوڵەت لە كۆمەڵگا و لێرەوە كرانەوە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی لەگەڵ خۆیدا هێنا. پاش لەناوچوونی یەكێتی سۆڤیەت و روخانی كۆمۆنیزم ئەگەری گەیشتن بەم ئامانجە رەخسا. دیارە گەیشتن بەم ئامانجە پێویستی بەرێكخستنی دەوڵەتێكی واقعی و شكڵگیری كۆمەڵگایەكی سەربەخۆیە لەو وڵاتانەدا كە لە ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت هاتونەتە دەرێ و بەدیهاتنی روبەروی كۆمەڵێك كێشەی بەرچاوە و بێگومان زەمەنێكی درێژی دەوێت.

هەلومەرجی وڵاتە كۆمۆنیستەكانی ئەوروپای ناوەندی و رۆژهەڵاتی لەمڕووەوە بەشێوەیەكی هەستپێكراو لەیەكجیابوو. زۆرێك لەم وڵاتانە بەتایبەتی پۆڵەندا و چیكۆسلۆڤاكیا و مەجەرستان لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە. یان لایەنیكەم پاش جەنگی جیهانی یەكەم . پێیان خستبووە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە و لەگەڵ بوونی دژواریە جدیەكاندا، دەوڵەتانێكی مۆدێرنیان هەبوو كە بەشێوەیەكی دیموكراتیانە كاریاندەكرد. جگە لەمە كۆمەڵگایەكی سەربەخۆ هەبوو كە ئەو توانایەی بە تاكەكان دەبەخشی كە خاوەن ئازادیە بنەڕەتیەكان بن. بەڵام پاش جەنگی جیهانی دوهەم یەكێتی سۆڤیەت كۆمۆنیزمی بەسەرئەم وڵاتانەدا سەپاند. كومۆنیزم لەناكاو كۆتایی بە جوڵەی ئەم وڵاتانە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی هێنا و بۆ ماوەی چلساڵ كردنییە كۆیلەی رژێمێكی تۆتالیتاری. بۆ ئەم وڵاتانە تۆتالیتاریزم تەنها بەمانای راوەستانی گۆڕانی سیاسییان نەبوو، بەڵكو بەمانای پاشەكشێیەكی كارەسات ئامێز بوو، بەو شێوەیە كە دەوڵەت كۆنترۆڵی كۆی كۆمەڵگای بەدەستەوەگرت و هیچ جۆرە ئازادیەكی بۆ تاكەكان بەجێنەهێشت. ئەم وڵاتانە پاش رمانی كۆمۆنیزم یەكسەر جوڵەی خۆیان بەرەو مۆدێرنەی سیاسی دەستپێكردەوە و كەم تازۆر بەخێرایی خەریكی بەدیهاتنین، هەرچەندە كە هەندێكیان وەك رۆمانیا و بولغارستان روبەروی چەندان كێشە بونەتەوە.

هەلومەرجی چین سەرەڕای تایبەتمەندی و ئاڵۆزیەكەی وەك هەلومەرجی یەكێتی سۆڤیەتە. ئەم وڵاتە بە روخاندنی رژێمی ئیمپراتۆری و راگەیاندنی رژێمی كۆماری لەساڵی*1911*دا دەیتوانی پێ بنێتە ناو رێگەی مۆدێرنەی سیاسیەوە، بەڵام لەبەر چەند هۆیەكی جیاواز (وەك ئاژاوە ناوخۆیەكان، شەڕەكانی ناوخۆ، داگیركردنی ژاپۆن، ململانێی ناسیۆنالیستەكان لەگەڵ كۆمۆنیستەكاندا) لەم رێگەیەدا سەركەوتوو نەبوو. سەقامگیر بوونی كۆمۆنیزم لە ساڵی*1949* دا بۆ ماوەیەكی درێژ چینی لە مۆدێرنەی سیاسی دورخستەوە. تۆتالیتاریزمی چینی وەك یەكێتی سۆڤیەت دیارە لەرێگەی جیاوازەوە، كۆمەڵگای بەست بەدەوڵەتەوەو جیابونەوەی ئەو دوانەی لەناوبرد. دەستورەكانی چین بە فۆرمۆلی جیاجیا، بەردەوام یەكێتی دەوڵەت و خەڵك . واتە پرۆلیتاریای كرێكاری و جوتیارانی . دەسەلماند. چین بەپێی دەستوری ساڵی *1954*"دەوڵەتێكی دیموكراتی جەماوەریە" كە "چینی كرێكار رابەرایەتی دەكات و بناغەكەی لەسەر یەكێتی كرێكاران و جوتیاران دامەزراوە" (مادەی یەكەم). دەستورەكانی ساڵی *1957* و *1978* جەختیان لەسەر ئەو خاڵە كردبوو كە چین "دەوڵەتی سۆشیالیستی دیكتاتۆری پرۆلیتاریا"یە(مادەی یەكەم). دەستوری ساڵی *1982* بە تێكەڵكردنی دوو فۆرمۆلەكەی پێشوو چینی وەك "دەوڵەتی سۆشیالیستی دیكتاتۆری دیموكراتی جەماوەری"

پێناسەکرد (مادەی یەکەم) و لەپێشەکیەکەیدا جەختی لەوە کردووە کە ئەم دیکتاتۆریە "لەجەوهەری خۆیدا دیکتاتۆری پرۆلیتاریایە". لێرەوە لەنێوان دەوڵەت و خەڵك (یان پرۆلیتاریادا) جیاوازیەك نەدەبینرا و لەروی تیوریەوە خەڵك یان پرۆلیتاریا رابەرایەتی دەوڵەتیان دەکرد. گەرچی دەکرێ لەم خاڵەوە ئەو دەرئەنجامە وەربگرین کە دەوڵەت بەملکەچی کۆمەڵگا دانراوە، بەڵام لەراستیدا پێچەوانەی ئەمە راستە. چونکە کۆمەڵگا بەتەواوی ملکەچی دەوڵەت بوو، تازە حیزبی کۆمۆنیست کە بەنوێنەری هەموو خەڵکی دادەنرێت، رابەرایەتی دەوڵەتی گرتبووە دەست.

ئەوە بەبیر دێنینەوە کە لە پێشەکی دەستوری ساڵی*54* دا "دەوری بەڕێوبەرایەتیکردنی حیزبی کۆمۆنیست" لەپەیوەندیدا بە دەزگاکانی دەوڵەتەوە سەلمێندرا بوو. پاشان دەستورەکانی ساڵی *1975* و ساڵی *1978*بە جەختکردن لەسەر دەوری رێبەرایەتیکردنی حیزب . لەبەشی یەکەمدا کە تەرخانکراوە بۆ بنەما گشتیەکان "مادەی*2*". هەنگاوێکی زیاتریان هەڵهێنا: حیزب "بە ناوکی رێبەرایەتیکەری هەموو خەڵکی چین" دەژمێرێت و چینی کرێکار بەهۆی کۆمیتەی پێشڕەوی خۆیەوە واتە حیزبی کۆمۆنیست، ئاراستە وەرگرتنی دەوڵەت دیاریدەکات. هەرچەندە لە ساڵی*1982* دا ئەم خاڵانە بەچاو نابینرێت، بەڵام لەپێشەکیەکەیدا باسی بنەمای رابەری کراوە و جگە لەمەش حیزب بەپێی هەلومەرجەکەی لە ساڵی *1982*دا وەك "ناوکی رابەریکەر لەپێناوی ئامانجی سۆشیالیزم لە چیندا" پێناسکراوە.

حیزبی کۆمۆنیست لەپراکتیکدا سود لەدەوڵەت بۆ رابەرایەتی کۆمەڵگا وەردەگرێت. دەوڵەتیش دەستدەخاتە ناو هەموو زەمینەکانەوە لە ئابوری و پەروەردە و زانستەکان و تەندروستیەوە بگرە تا راگەیاندن و کلتور و ئەدەبیات و هونەرەکان و بەمشێوەیە کۆی کۆمەڵگا فۆرمەلە و کۆنترۆڵ دەکات.
موڵکایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بەناچار گشتیە و دەتوانێ دوو شێوەی جیاواز لەخۆ بگرێت: موڵکایەتی هەموو خەڵك و موڵکایەتی گشتی جەماوەری زەحمەتکێش: یەکەم شێوەی موڵکایەتی بە بناغەی ئابوری دەوڵەتی دەژمێرێت کە بە وتەی مادەی*7* ی دەستوری ساڵی*1982* "هێزی رابەرایەتیکەری ئابوری نەتەوەی"یە. دەکرێ شێوەی دوهەم لە کۆمۆنە جەماوەریەکان، هەرەوەزیەکانی جوتیاری و ئابوری هەرەوەزیدا بدۆزرێتەوە. بەمشێوەیە موڵکایەتی تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و زەوی ناتوانێت بوونی هەبێت. بونیادی ئابوری لەسەر بناغەی سیستەمی موڵکایەتی گشتی دامەزراوە و دەوڵەت بەرنامەڕێژی ئابوری دەکات. دیارە نوسینگە دەوڵەتیەکان "لەبواری سودوەرگرتن و بەڕێوبەرایەتیدا سەربەخۆن" بەو مەرجەی کە سەرپێچی لە "رابەرایەتی یەکتای دەوڵەت" نەکەن و هەموو "ئامانجەکانی بەرنامە بهێننە دی" (دەستوری ساڵی*1982*، مادەی 16) گەرچی ئابوری فەردی، وەك "تەواوکەری بەشی سۆشیالیستی" لە شار و شارۆچکەکاندا قبوڵکراوە، بەڵام دەبێ لەژێر سەرپەرشتی و کۆنترۆڵی دەوڵەتدا بێت و لەو سنورەدا بمێنێتەوە کە یاسا دیاریکردووە (مادەی 11). ئاشکرایە لەم هەلومەرجەدا نە کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ دەتوانێت بوونی هەبێت و نە ئازادی شەخسی راستەقینە. بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەت لەئاراستەی بونیادنانی سۆشیالیزمدا، بەسەر کۆمەڵگا و تاکەکاندا باڵادەستە و بۆ ئەم مەبەستە هەموو توانا پێویستەکانی لەدەستدایە و

دەست بە سەرکوتی سیاسی و "فێربوون لەرێگەی کارەوە" دەکات.

لێرەشدا وەك یەکیتی سۆڤیەت جیاوازیەك لەنێوان هاوڵاتی و تاکەکەسدا نیە. لەراستیدا چین تەنها هاوڵاتیان بەفەرمی دەناسێت و حساب بۆ تاکەکان ناکات و ئەم تێڕوانینەش رەدکردنەوەی کامڵی مافەکانی مرۆڤ لەم وڵاتەدا روندەکاتەوە. دەستوری ساڵی *1982* وەك دەستوری ساڵی *1975* و ساڵی *1878*زۆرێك لە مافە بنەرەتیەکان بۆ "هاوڵاتیان" بە فەرمی دەناسێت، نەك بۆ تاکەکان. هەرچەندە ئەم زاراوەیە] واتە تاك [لە دەستوردا فەرامۆشنەکراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بۆ دەربڕینی قەدەغەکراوەکان بەکارهێنراوە و لەراستیدا بە بینینی تاك وەك گوناهکارێکی بەزەبر ]بالقوە[ هەوڵیانداوە تا هەموو جۆرە بەهایەکی لێ دابماڵن.

بەڵێ گەرچی "ئازادی تاکەکەسی هاوڵاتیان" و "رێزگرتن لە کەرامەتی شەخسیان" لە مادەکانی *37* و*38* ی ئەم دەستورەدا سەلمێنراوە، بەڵام] هەموو ئەمانە پەیوەندیان [بە "هاوڵاتیانەوە" هەبوو، وە هیچ مافێك بۆ تاك نەسەلمێنراوە. لێرەوە مافەکانی هاوڵاتیانیان لەرووی تیوریەوە بە فەرمی ناسی، بەڵام باسی مافەکانی مرۆڤیان وەك تاك نەهێنایە ئاراوە. لەئەنجامدا تەنها هاوڵاتیانی سەر بە دەوڵەت بوونیان هەیە و تاك وەك تاك بەڕاستی بوونی نیە.

پاش مردنی ماوتیسۆنك لەوڵاتدا گۆڕانێکی هەستپێکراو ـ بەتایبەتی لەبواری ئابوریدا. رویدا و تەنانەت باسی "دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی" هاتە ئاراوە. لەراستیدا لە سەرەتای ساڵەکانی *1980*دا چاکسازی زەویوزار بووە هۆی داماڵینی سۆشیالیزم لە لادێکاندا و جوتیاران بوونە خاوەنی هەندێك سەربەخۆیی دارایی. دروستکردنی "ناوچە ئابوریە تایبەتەکان" لە ساڵی*1979* شدا توانا و هەلی بۆ سەقامگیربوونی کارخانە تێکەڵەکانی چینی ـ دەرەکی رەخساند. دەیەیەك دوای ئەوە کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیست (لە ئوکتوبەری*1992* )دا چەمکی "ئابوری بازاڕی سۆشیالیستی" قبوڵکرد کە کەمێك دوای ئەوە لەدەستوریشدا چەسپا(مادەی 15). لەراستیدا ئەم روداوە تێڕوانینێکی نوێی بۆ ئابوری هێنایە ئاراوە. بەڵێ لەدوای ئەمەوە ئابوری پشتی بە بەرنامەرێژی بەستبوو و لە چوارچێوەی سۆشیالیستیدا، رویکردە یاساکانی بازاڕ. دواجار لە ساڵی*1999* دا لەئەنجامی پیاچونەوەیەکی تازەدا، دەستور بەشی تایبەتی بە "پارچەیەکی گرنگی پەیکەری" ئابوری سۆشیالیستی ئەژمار کرد. گەرچی ئەمجۆرە هەنگاوانە نەرمیەکی واقعی بوو کە هەندێك ئازادی لە بواری ئابوریدا هێنایە ئاراوە، بەڵام هەر لەم بوارەدا مایەوە و رەنگدانەوەیەکی لەبواری سیاسیدا نەبوو.. سەرکوتکردن و حوکمدانی نەیارەکان و ناڕازیەکان (بەتایبەتی لەکاتی روداوەکانی مەیدانی"تیان ئان من" لەساڵی *1989*دا) پیشاندەرێتی.

هەرلەبەرئەمە سەرەڕای گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییە، چین هێشتا روی نەکردۆتە مۆدێرنەی سیاسی و رەدکردنەوەی بەردەوامی رەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ لەم وڵاتەدا، ئەم راستیە دەسەلمێنێ. جگە لەمەش لەروەوە کە چین لە دێرزەمانەوە رێگەیەکی سەربەخۆی لە وڵاتە کۆمۆنیستەکانی دی گرتبووە بەر، لەبەرئەوە روخانی کۆمۆنیزم لە یەکێتی سۆڤیەتدا هیچ کاریگەریەکی لەسەر نەبوو. دیارە نابێ ئەوە لەیاد بکەین کە چین دواجار رێکەوتننامەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانی لەبارەی مافەکانی ئابوری، کۆمەڵایەتی و کلتوری و لە ئوکتوبەری*1997* دا و رێکەوتننامەی مافە

مەدەنیەكان و سیاسیەكانی لە ئۆكتۆبەری*1998* دا ئیمزاكرد كە خۆی بە ئاماژەیەكی روونی كرانەوە دەژمێرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و سەرەڕای پەیدابوونی تاكباوەڕی و بەدواداچونی چاكسازیە ئابوریەكان (بە یەكەم هەنگاوەكانی تایبەتیكردن) ئەم وڵاتە لەژێر دەسەڵاتی ئایدۆلۆژیای كۆمۆنیستی و كلتورە تایبەتیەكەیدا، هەروا درێژە بە رەدكردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی دەدات.

لەم روانگەیەوە وڵاتە كۆمۆنیستەكانی دی وەك ڤیتنام، كۆریای باكور، كوبا و. . . لەهەلومەرجێكی هاوشێوەدا دەژین. گەرچی گۆڕانیان جیاواز و تۆتالیتاریەكەیان لاوازترە. ئەم وڵاتانەش وەك یەكێتی سۆڤیەت و چین هەرگیز تامی مۆدێرنەی سیاسیان نەكردووە و لەراستیدا كۆمۆنیستی ئەم وڵاتانە رێگەی لە پێخستنە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە گرتووە.

بەڵی دەكرێ بەسەرنجدان لە شێوە جیاوازەكانی تۆتالیتاریزم كە لەسەدەی بیستدا رویاندا، ئەم سەدەیە بەسەدەی پاشەكشێیەكی بەرفراوانی مۆدێرنەی سیاسی بزانین. ئەم پاشەكشێیە دوو رێگەی جیاوازی گرتە بەر: یا ئەو مۆدێرنە سیاسیەی وەلاوە نا كە هەبوو یان لە دۆخی سەقامگیری و خۆ قایمكردندا بوو (نمونەی فاشیزم و نازیزم) یان ئەگەری دەركەوتنی لەو وڵاتانەدا لەناوبرد كە هێشتا پێی ئاشنا نەبوو بوون (نمونەی كۆمۆنیزم سۆڤیەتی و چینی). بێگومان ناكۆكی ئەم سەدەی ئاسن و خوێنە لەو راستیەدا حەشار دراوە كە گەرچی ئەم سەدەیە لە پەرەسەندن و گەشەكردنی زۆرێك لە زانستەكان و زانین و تەكنیكەكانی مۆدێرندا سەركەوتوو بووە و توانای كار لە زۆرێك لە بوارەكاندا رەخساند، بەڵام دەكرێ بگوترێ كە لە سەقامگیركردنی مۆدێرنەی سیاسی لەوڵاتە گەورەكاندا بۆ ماوەیەكی زۆر، سەركەوتوو نەبووە. وەك چۆن پێشتر كۆتایهاتنی فاشیزم و نازیزم پیشانیدا و بەتازەیش كەوتنی كۆمۆنیزم سەلماندی، بەدیهاتنی ئامانجێكی وا تەنها بە لەناوچوونی تۆتالیتاریزم مومكینە. بەڵێ ئەركی سەدەی بیست و یەك بریتیە لە پاڵ پێوەنانی دوو وڵاتی گرنگی روسیا و چین بەرەو مۆدێرنەی سیاسی كە هەردوكیان هەنوكە بۆ پێخستنە ناو ئەم رێگەیەوە، روبەروی چەندان دژواری بونەتەوە.

## سەرچاوە

وەرگێرانی فەسڵی پێنجەمی ئەم كتێبەی خوارەوەیە:

-مۆریس بارییە: مدرنیتەی سیاسی- ت عبدالوهاب احمدی، تهران، اگە، 1383.

# مۆدێرنە: مۆراڵ و سیاسەت

ئەلعەلەمی ئیدریسی رەشید

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**1-مۆدێرنە، چەمك و مێژوو:**

هەر لە سەرەتاوە دەتوانین بڵێین دیاریکردنی چەمك و مێژووی مۆدێرنە کارێکی گرانە.. لە رووی مێژووییەوە هەندێك باس لە مۆدێرنەی (دیموکراسی ئەسینا) دەکەن لە مێژوی کۆندا و هەندێکی تر قسە لە مۆدێرنەی سۆفیستەکان و فیکری رۆشنگەری دەکەن. لەلایەکی ترەوە کەسانێك هەن مۆدێرنە بەو قۆناغە فیکرییە تایبەتە دیاریدەکەن کە لەسەدەی شازدەهەمدا و لەگەڵ سەرهەڵدانی فەردانیەتدا هاتە ئاراو تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو. پاشان لەو قۆناغانەی ئەوروپا دوچاری قەیران هات و بزاوتگەلێکی نیهلستی و نەژادپەرستی وەکی نازیزم سەریان هەڵدا، مۆدێرنە ئاوابوو. بەڵام دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەسەر ئاستی فیکر و واقیع جارێکی تر مۆدێرنە هاتەوە ئارا..

مۆدێرنەچی دەگەیەنێت؟ ئایا بریتیە لە تەکنۆلۆژیا، پیشەسازی، ئامێر، مەعریفەی زانستی، دامودەزگا، دیموکراسی، مافە سیاسی و مەدەنیەکان؟ یان سەروەختێك ئێمە دەمانەوێت مۆدێرنە لە واقعی خۆماندا چێبکەین، مەبەستمان لەو پرۆسەیە چییە؟ ئەی نابێت هەر لە سەرەتاوە جیاوازی لە نێوان مۆدێرنەو نوێخوازیدا بکەین؟ چەمکی نوێخوازی لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردودا سەریهەڵدا، لەو کاتەدا بوو کە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێهەم لە هەوڵی پەیڕەوکردنی سیاسەتی پەرەپێدان و گەشەسەندندا بوون. مۆدێرنە وەك چەمکێکی گشتی دەچێتەوە سەر چەندین چەمکی جۆراوجۆری وەك: (خود، ئەقڵ، مێژوو، بازاڕ، ماف، دیموکراسی). دەکرێت لێرەدا پێناسەیەکی سەرەتایی مۆدێرنە بکەین: (مۆدێرنە واتە بڕوابوون بە توانا و هێزی مرۆڤ کە دەتوانێت لە ڕێی بەکارهێنانی ئەقڵەوە جڵەوی ئاراستەی مێژوو بکات و بونیادی کۆمەڵگەش بگۆڕێت، بە مەبەستی بەدیهێنانی دیموکراسی و پاراستنی ماف و ئازادییەکان). شایەنی باسە هوشیاری مرۆڤ بە خودی خۆی و بەهێزو تواناکانی بۆ گۆڕینی

کۆمەڵگە، وەرچەرخانێکی مەزنی لە فیکری مرۆڤایەتیدا دروستکرد.

## 2-مۆدێرنە، بونیادێکی ناکۆك و دژبەیەك:

ئەو پێناسە سەرەتاییەی لە سەرەوەدا بۆ مۆدێرنەمانکرد، ڕووبەڕووی گۆڕانی زۆر ترسناك دەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی مۆدێرنە مانا و دەلالەتی دیکە وەربگرێت.. لێرەدا هەوڵدەدەین تیشك بخەینە سەر ئەم مەسەلەیە. پرسیارێك کە هەر لە سەرەتاوە بە مێشکماندا بێت ئەوەیە: ئایا یەك مۆدێرنە هەیە، یاخود چەندین مۆدێرنەی جۆراوجۆر و جیاواز لە یەکمان هەیە؟

**یەکەم**/لەسەر ئاستی چەمك، چەمکگەلێکی وەك: (ئەقڵ،خود، تاکەکەس، ئازادیو هتد)، کەلە چەمکە سەرەکیەکانی مۆدێرنەن،لای ئەدیبان و فەیلەسوفان هەر یەکەیان ماناو دەلالەتی جیاوازیان هەیە.

**دووەم**/ لەسەر ئاستی واقیع، دەتوانین بەپێی قۆناغ و سەردەم چەندین مۆدێرنە دیاری بکەین: مۆدێرنەی سەرەتا (سەدەی شانزە و حەڤدە)، مۆدێرنەی سەردەمی ڕۆشنگەری، مۆدێرنەی پاش ڕۆشنگەری، مۆدێرنەی سەدەی نۆزدەهەم، مۆدێرنەی بەراییەکانی سەدەی بیستەم و.. هتد.

لەسەر ئەم دوو ئاستەش، واتە ئاستی فیکر و بەها لەلایەك و ئاستی واقیع لە لایەکی تر، لەیەك قۆناغی مێژوییدا، جیاوازی و دژایەتیەکی گەورە و گران دەبینین. بۆ نمونە، مۆدێرنەی تۆلێرانس و جیاوازیمان هەیە، کە دوو چەمکی سەرەکی ڕۆشنگەرین، بەڵام لە بەرامبەریاندا پاوانخوازی و کۆلۆنیالیزم و ئافەرۆزکردنی کلتورە جیاوازەکانیش هەیە. لەلایەکی دیکە مۆدێرنەی بەشداریکردنی سیاسی هەیە، بەڵام بەرامبەر بەوە تەریککردن و هەڵاوێرد لە نێوان هاوڵاتی چالاك و هاوڵاتی پاسیڤدا هەیە. مۆدێرنەی پەیمان و ڕێککەوتنی سیاسی هەیە، لەبەرامبەردا دوورکەوتنەوە و جیاوازی لەنێوان ناوەندچێتی دەوڵەت و پەراوێز کەوتنی کۆمەڵگەدا هەیە. پرۆسەی پەیمانی کۆمەڵایەتی، پرۆسەیەکە دەوڵەتی مۆدێرنی لەسەر دروست دەبێت، هاوکات کۆمەڵگەی مەدەنیشی لەسەر دروستدەبێت، ئەمەش ناکۆکیەکی گەورە لە نێوان هەوڵەکانی دەوڵەتو خواستەکانی کۆمەڵگەدا دروستدەکات، چونکە وەکیەك هەردووکیان خاوەنی هەمان شەرعیەتی سیاسین. ئەم ناکۆکیەش بەسەر کۆمەڵگەدا دەشکێتەوە، لەبەرئەوەی دەوڵەت دەتوانێت مافی پەنابردنە بەر توندوتیژی شەرعی بۆ خۆی پاوانبکات. هەروەها مۆدێرنەی پێشکەوتنی ئابوریمان هەیە، بەرامبەر بەو تێئاوارەبوون و چەوساندنەوەو هەژاری هەیە. مۆدێرنەی کۆمەڵگەی مەدەنی هەیە، کە بەرامبەرەکەی چەمکی ئەبستراکتی دەوڵەتە. "مارکس" پێیوایە دەوڵەت پێکهاتەیەکی ئەبستراکت و موتەعالیەو لەسەرو چینە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە و ئەمەش خەسڵەتێکی دیار و تایبەتی مۆدێرنەی سیاسیە.

لێرەوە تێدەگەین مۆدێرنە لە مانا پۆزەتڤی و ئایدیالستیەکەیدا دەچێتەوە سەر فیکر و بەها و لە مانا نێگەتیڤیەکەشیدا دەچێتەوە سەر واقیع. واتە کۆمەڵگە دوچاری دادڕانێك بووە لە نێوان فیکرێکی ڕۆشنگەرو ئەقڵانی و دیموکراسی لەگەڵ واقعێکی تراژیدی و ناهەموار و مەسخبودا.. دواجار چەمکی مۆدێرنە لە هەناوی خۆیدا هەڵگری بونیادێکی ناکۆك و بزۆکە و هەڵگری چەندین ئاقاری دژبەیەکە.

## 3-فاوست و مۆدێرنە:

شانۆنامەی (فاوست)ی "گۆتە" تەعبیرێکی شاعیری و درامییە لەو بونیادە ناکۆك و دژبەیەکەی

هاوشانی مۆدێرنەیە. مۆدێرنە بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجەکانی کە ئامانجی پیرۆزن وەك گەشە و پەرەسەندن، رەنگە قوربانی بە ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤ بدات. ئەفسانەی فاوست باس لە چیرۆکی مرۆڤێك دەکات ویژدانی دادڕاوە و هەوڵدەدات کاری نمونەی و بەرزو جوان بکات، بەڵام ناچارە لەو پێناوەدا دەست بخاتە دەستی ئەهریمەن و کاری نابەجێ و ناشایستە بکات. "بێرمان" دەڵێت: (قارەمانێتی پاڵەوانەکەی گۆتە لەوەدایە وزەیەکی بێئەندازەی مرۆڤایەتی ئازاد دەکات کە چەپێنرابوو، ئەم وزەیەش هەر بە تەنها لە ناخی خۆیدا ناتەقێنێتەوە، بەڵکو لە هەموو ئەوانەشدا کە پەیوەندیان لەگەڵ دەبەستێت و دواجار لە تێکڕای ئەو کۆمەڵگەیەشدا کە لە چوارچێوەیدا دەژی. بەڵام ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر ئاستی فیکری و مۆراڵی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دروستی دەکات، باجی ئینسانی زۆر و زەوەندی دەوێت. ئەمەش بریتیە لە پەیوەندی فاوست بە ئەهریمەنەوە: ناتوانین پەرە بە هێز و تواناکانی مرۆڤ بدەین تەنها لە ڕێی ئەو هێزانەوە نەبێت کە مارکس بە هێزی ئەهریمەنی ناودێری کردبوون و بریتین لەو وزە تاریك و ترسناکانەی هێزێکی هێندە خورافیان هەیە کە بە هیچ شتێك کۆنترۆڵ ناکرێت. شانۆنامەی فاوست زمانی تراژیدیای یەکەمین گەشە و بەرەوپێشچونەو تا هەنوکەش هەروایە).

## 4-مۆدێرنە لە نێوان مەکیاڤیللی و تۆماس مۆردا :

"مەکیاڤیللی" و "تۆماس مۆر" سەر بە هەمان قۆناغی مێژووین، واتە سەدەی شازدە، بەڵام جیاوازی فیکری نێوانیان مایەی سەرسوڕمان و شوێن پرسیارە. لە کاتێکدا ڕیالیزمی سیاسی "مەکیاڤیللی" فەزایەکی سیاسی ترسناکمان بۆ ئاشکرا دەکات، دەبینین "تۆماس مۆر" بەرەو ئاسمانی یۆتۆپیا پەلکێشمان دەکات و باسی شاری نمونەیمان بۆ دەکات، شارێك کە باڵاترین بەهای مرۆڤانەی تێدا باڵادەستە.. زۆرێك لە ڕەخنەگران پێیان وایە ئەو شارەی "مۆر" زۆر دوورە لە واقیع و ئەگەری بەرجەستەبوونی بە فیعلی مەحاڵە. ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات بپرسین: (ئەگەر شارە نمونەییەکان وەك ئەوەی لە نوسینەکانی ئەفلاتۆن و فارابی و تۆماس مۆردا هاتووە، تەنها خەو و خەیاڵ بێت و نەتوانێت کاریگەری لەسەر ژیانی مرۆڤ جێبهێڵێت، ئەی کەواتە ئەوە چۆن لێکبدەینەوە کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە جەماوەر بە دروشمی شۆڕشەوە پەیوەست بوون، ئەو شۆڕشەی بانگەشەی بۆ کۆمەڵگەی کۆمۆنستی دەکرد و لە ڕێی ئەم کۆمەڵگەیەشەوە مرۆڤایەتی سەردەم و ڕۆژگاری زێڕینی لە دەستچوی بۆ دەگەڕێتەوە). بۆچی "مەکیاڤیللی" جێی سەرسامیە و خەڵکی بە بایەخەوە لێی دەڕوانن، لە کاتێکدا "تۆماس مۆر" بەهێند وەرناگیرێت و تەرێزی لێدەکرێت؟ تۆ بڵێی لەبەرئەوە بێت مرۆڤایەتی، جیهانی "مەکیاڤیللی" بە هەموو ناهەمواری و خراپەکاریەکانیەوە بەجیهانی ڕاستەقینەی خۆی بزانێت، نەك جیهانە نمونەی و تۆتۆپیەکەی "تۆماس مۆر"؟ مرۆڤ هەر کە باسی لە جیهانی نمونەی و جیاواز لە جیهانی واقعی کرد، ئافەرۆز دەکرێت یاخود دژایەتی دەکرێت و توندوتیژی لە بەرامبەردا بەگەڕ دەخرێت.

## 5-خەسڵەتە سەرەکیەکانی مۆدێرنە :

### 1-فەردانیەت و ئارەزوی کۆنترۆڵکردن:

دۆزینەوە زانستیەکان بۆ مرۆڤیان ئاشکرا کرد حەقیقەت لە هەناوی سروشتدایە، نەك شتێکی

ترانسندنتالی بێت کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو. هاوکات بەهۆی ئەقڵەوە دەکرێت پەی بە یاساکانی سروشت و یاسا مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکان بەرین، چونکە ئەقڵ دەچێتە ناو جەوهەری شتەکانەوەو بونیادە شاراوەکانیان ئاشکرا دەکات. بەڵام داخۆ مەبەست لە پرۆسەیەکی وا چییە؟

ئەو حەقیقەتەی مرۆڤ لە سەردەمی مۆدێرنەدا عەودالّیەتی شتێکی هەڕەمەکی یان پوچگەرانییە، بەڵکو حەقیقەتێکە لە پێناو کۆنترۆڵکردنی سروشت و ئاڕاستەکردنی مێژوو و دیسپلینکردنی کۆمەڵگەدا بەکاردەهێنرێت.. ئەقڵ لای "ئەفلاتۆن" بە کەڵکی حیکمەت و فەزیلەت دەهات و لای "فارابی"ش بۆ چاکە و بەختەوەری بەسوود بوو. بەڵام ئەقڵی مۆدێرن مانای کۆنترۆڵکردنی شتەکانی دەگەیاند و بەچالاکی و سودگەرایییەوە گرێ درابوو. ئەقڵ لەسەردەمی مۆدێرنەدا بوو بە ئامرازێکی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانجگەلێکی دیاریکراو. بەمجۆرە ئەقڵ بووە ئەقڵێکی ئامێری و خرایە خزمەتی سود و بەرژەوەندییەوە. سودمەندیش بەها سیاسیەکان دەگۆڕێت بۆ هەڵبژاردنی ستراتیژی کە بە پێی هەلومەرج و بارودۆخ گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەم بۆچوونە لە دەوڵەتانی تازە پێگەیشتودا خەسڵەتێکی درامی وەردەگرێت، لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتانە وەهایان لێدێت وەك ئەوەی بە بەردەوامی لە نێوان سیاسەتێکی شێوە دیموکراسی و سیاسەتێکی دەسەڵاتخوازیدا بن.

## 2-مۆدێرنەی مۆراڵ، قازانج:

"هنری سیرویك" لە کتێبەکەیدا (میتۆدەکانی مۆراڵ)، جیاوازی دەکات لە نێوان مۆراڵی کۆن و مۆراڵی نوێدا، بەو پێیەی مۆراڵی کۆن لەسەر چەمکی چاکە دامەزرا بوو، بەڵام مۆراڵی نوێ گرنگی بە چەمکی دادپەروەری دەدات. فیکری ئەرزشخوازی دێرین، خەسڵەتێکی سەرنج ڕاکێشی دەدایە پاڵ مۆراڵ، لە کاتێکدا فیکری مۆدێرن خەسڵەتێکی ئیلزامی پێدەبەخشێت. چاکە لای پێشینان لەسەر فەزیلەت دادەمەزرا و دەبووە مایەی دروستکردنی هەماهەنگی ڕوحی و بەختەوەری. دەتوانین بڵێین "کانت" ئەو کەسەیە کە ئەم دیدگا مۆدێرنە بۆ مۆراڵ لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا فۆرمەلە دەکات، لەبەرئەوەی پێیوابوو چاکە و دادپەروەری بەشێوەیەکی پێشوەخت دیاری ناکرێن، بەڵکو بەشێوەیەکی پاشوەخت و بە گوێرەی ئەوەی یاسا بڕیاری لێدەدات. چونکە بە بۆچونی "کانت" بەختەوەری هەڵگری چەندین مانایە و بەپێی خەسڵەت و سروشتی مرۆڤەکان دەگۆڕێت. واتە ئەو پێیوایە دەبێت مۆراڵ لەسەر ئەرك دامەزرابێت، ئەو ئەرکەش لە هوشیاریەکی ئەخلاقیەوە کە هاوشانی ئەقڵی ئینسانییە، سەرچاوەی گرتبێت.

بەڵام ئاقارگەلێکی دی کە باس لە تیۆریای بەها دەکەن، پێیان وایە ئەستەمە مرۆڤ ناچار بکرێت پەیڕەوی ئەخلاقێك بکات، ئەگەر سود و قازانجێکی تێدا نەبینێت، لێرەوە پێویستە مۆراڵ بە قازانجەوە گرێ بدرێت. لە نوسینەکانی "داڤید هیوم" و "جێرمی بنتام"دا دەربارەی مۆراڵ، بەها قودسیەتی خۆی لە دەست دەدات و وایان لێدێت وەك ئەوەی بەرهەمی پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی دیارییکراوبن و دەبنە بەها گەلێکی شێوە ئابووری. چونکە ئەمان پێیان وایە مرۆڤ پێودانگی ئەقڵانی و خودپەرستی ئاڕاستەی دەکات، چونکە مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆی دەگەڕێت. بەو پێیەشی بەرژەوەندی هەر مرۆڤێك بە پێویست

**لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوانی دیدا ناکۆك نایەتەوە، کەواتە دەچێتە خزمەت بەرژوەندی گشتیەوە. چونکە جیاوازی بەرژەوەندی دەبێتە مایەی دروستکردنی کێبڕکێ و ململانێ لە نێوان مرۆڤەکاندا و دواجار دەبێتە مایەی بەرەوپێشچونی ئابووری.**

***3-سێ شەپۆلەکەی مۆدێرنە و پاشەکشەی فەلسەفەی سیاسی:***

**"لیوستراوس" پێیوایە مۆدێرنەی فیکری و سیاسی بە سێ قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕیووە:**

**أ- قۆناغی یەکەم بە ناوی "مەکیاڤیلی و هۆبس" ناوزەد دەکرێت:**

**لەسەرەتاکانی سەردەمی مۆدێرنەدا، فیکری ئینسانی لە هەوڵی ئەوەدا بووە بوون لە ئەرکی بوون نزیك بکاتەوە، بە واتایەکی دی ئایدیا (ئەرکی بوون) لە مرۆڤی واقعی نزیك بکاتەوە. سروشت لای دێرینەکان، بۆ مرۆڤ هەڵگری مانا و ئاماژەی جۆراوجۆربوو، لەبەرئەوەی هارمۆنی و پەیوەندییە و مرۆڤ لە ژیانیدا و لە سستمی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، لە هەوڵی ئەوەدابووە لاسایی سروشت بکاتەوە. ئەم ئاقارە لە فیکردا، ناکۆتاگی و بێسنور بووە، چونکە سروشت و گەردوون دەچنەوە سەر نمونەی ڕەها. "ئەفلاتۆن" کاتێك باسی لە مرۆڤی ڕەها دەکرد، مانای ئەوە ناگەیەنێت ئەو مرۆڤە خاوەنی سیفەتگەلێکی دیاریکراوە، بەڵکو بەو مانایە دێت کە مرۆڤی هوشیار پێیوایە مرۆڤبونی ئەو ناکۆتاگیە و بەردەوام دەکرێت لە نمونەی ئایدیالی نزیکبکرێتەوە. لەو قۆناغەدا مرۆڤ پێوەری هەموو شتێك بووە و هەموو بیرکردنەوەیەکیش لە سیاسەت، پێویستی دەکرد کە لە نمونەی باڵای مرۆڤ بوونی مرۆڤەوە دەست پێبکات و خۆی لێ نزیك بکاتەوە. بەڵام لە سەردەمی مۆدێرندا سروشت بۆ مرۆڤ شتێکی وای نەدەگەیاند و کرایە هاوتای ئاشوب و بێمانایی، لێرەو مرۆڤ لە هەوڵی ئەوەدابوو کۆنترۆڵی بکات و دەستی بەسەردا بگرێت.**

**سروشت کە لە سەرەتادا نمونەیەك بوو لاسایی دەکرایەوە و شوێن پێیهەڵدەگیرا، بووە مادەیەك کە بۆ خواست و مەبەستەکانی مرۆڤ بەکاردەهێنرا. لێرەدا ئاستی کاریگەری فەلسەفەی "مارتن هایدگەر" لەسەر "لیۆستراوس" دەبینین، چونکە "هایدگەر" پێی وابوو مرۆڤ وەك ئەوە نەماوە کە پێوەری هەموو شتێك بێت، بەڵکو بۆتە ئاغا و سەرداری هەموو شتێك. لەم قۆناغەدا مێژوو ڕۆڵی ئەوەی دەگێڕا کە بوون و ئەرکی بوون لێکدی نزیك بکاتەوە، لەبەرئەوەی نمونەی بوون لە ڕێی خواست و ئارەزووی مرۆڤەوە و بە بێ ویستی خۆیان، دەستەبەر دەبێت. (فێڵی مێژوو)ش لێرەدایە. ڕەنگە کارو کردەوەی مرۆڤ سوك و بێ مانا بێت، بەڵام پێویستە بە ناچاری قبوڵی بکەین و سەرزەنشتی نەکەین، لەبەرئەوەی پێدەچێت لە واقیعدا لە بەرژەوەندی ئاڕاستەی مێژوی مرۆڤایەتیدا بێت. ئەم بۆچونە خەسڵەتێکی سودگەرا و پراگماتی بە مۆراڵ بەخشی و ئەمەش لە نوسینەکانی "مەکیاڤیلی و تۆماس هۆبس"دا ڕەنگیاندایەوە. "مەکیاڤیلی" لای خۆیەوە پێی وابوو دەبێت کێشە ئینسانیەکان، بەشێوەیەکی سیاسی و واقعی و پراگماتی چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە.**

**دێرینەکان پێیان وابوو سۆراخکردن لە سستمێکی ئایدیالی، پێویستی بە کارێکی بەردەوام و لێنەبڕاوانە هەیە کە ئەستەمە کۆنترۆڵ بکرێت و ئاڕاستە بکرێت، ئەم پرۆسەیەش ڕێگری زۆری دێتە بەردەم و ڕەنگە روداوگەلێکیش هاوشانی بن کە بە**

ڕێکەوت دروست دەبن. بەڵام "مەکیاڤیلی" پێیوایە نابێت دەرفەت بۆ کاری ڕێکەوت بهێڵینەوە، چونکە هێزی سیاسی دەتوانێت جڵەوی هەموو شتێك بکات. ئەمەش مانای وایە "مەکیاڤیلی" نمونەی ڕژێمە ئایدیالستیەکانی لە مێشکی خۆی دەرکردووە و ئەوەی بۆ ئەوە گرنگ بووە، ئەوە بووە کۆنترۆڵی کۆمەڵگە بکات و چارەسەر بۆ قەیرانەکان بدۆزێتەوە و ڕێگا لە دابەشبون و کەرتبونی کۆمەڵگە بگرێت. بە کورتیەکەی لەم قۆناغەدا سیاسەت مانایەکی تەکنیکی و ئامێری وەرگرت و بووە ئامرازێك بۆ دیسپلین و هەژمونگەری. ئەم بۆچونە لای "تۆماس هۆبس"یش دەبینین، "هۆبس" بایەخی بە ڕێگا چارەی سیاسی دەدا تا لە ڕێیەوە کۆتایی بە دۆخی (جەنگی هەموان لە دژی هەموان) بهێنێت. ئەم تیۆریایانە بە مێژوگەرایەتی گەیشتن و بوونە مایەی ئافەرۆزکردنی فەلسەفەی سیاسی، بەمجۆرە فەزیلەت وەك ئامانجی سیاسەت نەمایەوە، بەڵکو بوو بە خزمەتکاری کۆمار. کۆمار پێویستی بە فەزیلەتە، لەبەرئەوەی فەزیلەت بۆ مانەوەو بەردەوامێتی کۆمار پێویستە، کەواتە ئیتر نەدەکرا بە تەنها و لە دەرەوەی کۆمەڵگەی سیاسی، بیر لە مۆراڵ بکرێتەوە. مۆراڵ هەر بە تەنها مەرجێکە لە مەرجەکانی کۆمار، ئەمەش مانای وایە میر دەتوانێت لاف فەزیلەت لێبدات بیٚ ئەوەی بڕوای پێی هەبێت.

**ب-قۆناغی دووەم بە ناوی "ژان ژاك ڕۆسۆ" ناودێر دەکرێت:**

"ڕۆسۆ" لەسەرەتادا کەوتە ڕەخنەگرتن لە بۆچونە فیکرییەکانی شەپۆلی یەکەمی مۆدێرنە و پێیوابوو دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لای دێرینەکان و کەلەپوری کۆن زیندو بکەینەوە و بانگەشە بۆ یاسای سروشتی بکەین. لە ڕاستیدا "ڕۆسۆ" خەسڵەتێکی ڕادیکاڵی بەخشی بەو ئاقارە مێژوییەی لای "ماکیاڤیللی" و "تۆماس هۆبس" هەبوو. "هۆبس" پێیوابوو ناکرێت سەر لە بەر یاسای سروشتی وەلاوە بنرێت، بەڵکو دەبێت ئامادەی بکەینەوە و تاوتوێی بکەین. یاسای سروشتی لە کۆندا ئاماژە بوو بۆ نمونەی باڵاو ئامانجی مرۆڤی نمونەی بەدوور لە هەموو واقعێکی تایبەت. یاسای سروشتی لای "هۆبس" مەبەست لێی قۆناغی سەرەتایی بوو، واتە یەکەمین قۆناغی مێژوویی مرۆڤ. "هۆبس" دواجار دەگاتە ئەوەی بڵێت یاسای سروشتی حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرمان لای مرۆڤ بۆ ئاشکرا دەکات، ئەویش ئەوەیەکە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا حەزو ئارەزوو بەسەریدا زاڵە. بە بڕوای ئەو ئەوەی لەم قۆناغەدابەسەر مرۆڤدا زاڵە (ترسە لە مردن و لەناوچاون بە دەستی ئەوانی دی).. "رۆسۆ" ئەگەرچی واخۆی نیشاندا کە دژ بە بۆچونەکانی "هۆبس"ە، بەڵام بۆچونە سەرەتاییەکانی سەلماند و ڕایگەیاند یاسای سروشتی ئاماژەیە بۆ دۆخی سروشتی (دۆخێك کە بەر لە هاتنە ئارای دەوڵەت هەبووە)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت "ڕۆسۆ" بڕوای بە میسالیەتی یاسای سروشتی و ماهیەتی ئامانجداری ئەو یاسایە نەبووە.. هەروەها "ڕۆسۆ" پێیوایە مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتایدا هیچ هوشیاریەکی ئەخلاقی نەبووەو نەیتوانیووە جیاوازی لە نێوان چاکەو خراپەدا بکات، واتە مرۆڤێکی دڕندە بووە و بەشێوەیەکی خۆڕسکانە ژیاوە. لەمبارەیەوە "لیۆستراوس" دەڵێت: (مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا لە خوار مرۆڤەوەیە یاخود مرۆڤێکە بەر لە مرۆڤ). لەم سەروبەرندەدا "هۆبس" پێیوایە دۆخی سروشتی ئەو مافانەمان بۆ ئاشکرا

دەکات کەمرۆڤ لەو قۆناغەدا بەهرەمەند بووە لێیان و لە قۆناغی ئێستاشدا پێویستە دەوڵەت ئەو مافانە بپارێزێتو فەرامۆشیان نەکات.. ئەخلاقیش لای "هۆبس"ئەو ئەرکانەیەپێویستە لەسەر مرۆڤ ڕێزیان لێبگرێت، گەر بیەوێت بە ئاشتی و دڵنیایی بژی.

"رۆسۆ" لە هەوڵی ئەوەدا بووە لەو خەسڵەتە پراگماتیەی مۆراڵ دورکەوێتەوە، وەکو ئەوەی بە نوسینەکانی "تۆماس هۆبس"ەوە دیارە. بە بڕوای "ڕۆسۆ" ئەو ئەرکانەی بە یاساوە پەیوەستە لە مافە سەرەکیەکانەوەو بە تایبەتیش لە ئازادیەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام بابپرسین ئەمە چۆنە؟ مرۆڤی سەرەتایی بەو پێیەی لە مرۆڤ کەمترە، ئەوا مرۆڤبونی خۆی لە ڕێی مێژووەوە، واتە لە ڕێی کۆمەڵگەوە بەدەست دێنێت. بەمجۆرە مێژوو شوێنی سروشت دەگرێتەوە، بەڵام ناکرێت مێژوو ببێتە بنەماو پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. ئەی کەواتە چۆن دەکرێت بڵێین مرۆڤ بە ئاقاری ئیجابیدا دەڕوات یان بە ئاقاری سلبیدا؟

ئەمە "ڕۆسۆ"ی ناچار کرد پەنا بۆپێوەرێك بەرێت لە دەرەوەی مێژوو، ئەم پێوەرەش لە دۆخێکی سروشتی گریمانە کراوەوە هەڵێنجراوە. ئەو یاسا سروشتیەی کە لەدۆخی سروشتی بەر لە دەوڵەتدا هەبووە، ئەو پێوەرە بەرز و باڵایەیە کە مانایەك بە ڕەوتی مێژوو دەدات. مرۆڤ ئەگەرچی لە دۆخی سروشتیدا دڕندەبوو، بەڵام لە هەموو کۆت و بەندێك بە دوور بوو. خاوەنی ئازادی و سەربەخۆیی تایبەتی خۆی بوو، بەپێی ئەوەش ئازادی بووە تاکە پێوەرێك کە بشێت لەسەر بنەمای ئەوە سستمێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی، هەڵبەسەنگێنرێت. بەڵام ئازادی لای "ڕۆسۆ" سنوردارو دیاریکراو نییە، کەواتە مەبەست لە ئازادی چییەو چۆن دەکرێت لەبەرەڵڵایی جیابکەینەوە؟ "ڕۆسۆ" پێیوایە ئازادی سەر لەنوێ و لە ستایلێکی پرۆفیشناڵدا، لە کۆمەڵگەیەکدا دێتەوە ئارا کە لەسەر ئیرادەی گشتی دامەزرابێت، ئیرادەی گشتیش گوزارشت لە خواست و ئارەزووی هەموان دەکات. واتە تەعبیرە لە چاکەی هاوبەش، کەواتە ئیرادەیەکی وا دیموکراسی و ئەقلانییە و لە هەڵە بەدوورە. لێرەدا دەپرسین: پێوەری ئەقلانییەت لای "ڕۆسۆ"چییە؟ بە بۆچونی ئەو ئەقلانیەت دەرگیری دیموکراسی و بەشداری کردنی سیاسیە، لەبەرئەوەی لە یاساگەلێکدا بەرجەستە دەبێت کە گوزارشت لە ئیرادەی گشتی دەکات، واتە بەبێ هیچ جیاوازییەك تەعبیر لە بەرژەوەندی هەموان دەکات، بەڵام ئەقلانییەت لای پێشینان پەیوەست بوو بە کامەرانی و بەختەوەری مرۆڤەوەو لەو نمونە ڕەهایەی مرۆڤبونی مرۆڤەوە بیریان لێدەکردەوە. نمونەیترین یاسا لای "ڕۆسۆ" ئەوەیە کە سەرجەم هاوڵاتیان لەداڕشتنیدا بەشداری دەکەن، بەڵام لەسەردەمانی کۆندا نمونەیترین یاسا ئەوەبووە کە لاسایی سروشتی بکردایەتەوە، چونکە سروشت هەڵگری بەرزترین بەها ئینسانیەکان بووە.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین تیۆریا سیاسیەکان گرنگیان بەو بۆچونە ئەنسرۆپۆلۆژیانە دەدا کە لە خەسڵەتە گریمانە کراوو واقعیەکانی مرۆڤەوە سەرچاوەیان دەگرت. لە کاتێکدا ئەنسرۆپۆلۆژیای فەلسەفی لای پێشینان، لە مرۆڤی ڕەهاوە سەرچاوەی دەگرت، ئەو مرۆڤەی کە خۆی لە هەموو پۆخڵاواتەکانی واقیع قوتار کردبوو.

### ج-قۆناغی سێیەم، بەناوی "نیچە"وە ناودێردەکرێت:

لە کاتێکدا "ڕۆسۆ" پێیوابوو ئیرادەی گشتی کۆمەڵگە بەرەو ئەوە دەبات بە ئارامی لەگەڵ

سروشتدا بژی و دڵنیایی و ئارامی لە ناخی مرۆڤدا دروست بکات، "نیچە" بۆچونێکی تری هەبوو کە پێیوابوو ناکرێت کێشەکانی مرۆڤ لە ڕێی سیاسەتەوە چارەسەر بکرێت. بە بڕوای "نیچە" بوون هەستی ترس و دڵەڕاوکێ لە مرۆڤدا دروست دەکات زیاد لەوەی هەست بەدڵنیابونی بداتێ. ئەم دڵەڕاوکێ ویژدانیەش پەیوەستە بە تراژیدیای ژیانەوەو ئەم کێشەیەش کێشەیەکی ئەزەلی مرۆڤەو هیچ سستمێکی سیاسی ناتوانێت چارەسەری بکات.

زۆربەی زۆری فەیلەسوفەکان لە سروشت و خەسڵەتی مرۆڤەوە دەستیان پێکردووە، بەتایبەت ئەو مرۆڤەی لەسەردەم و زەمانی خۆیاندا لە ئارەدا بووە و ویستویانە لەسەر ئەوە تیۆریاگەلێکی سیاسی فۆرمەلە بکەن کە لاف جیهانی و گەردونگەرای لێبدات، بەلاّ لە واقیعدا ئەو فەیلەسوفانە لە گرنگی و بەهای مێژوو نەگەیشتبون. نێوانی "ڕۆسۆ" و "نیچە" سەد ساڵێکە، لەو ماوەیەشدا مێژوو بە هەموو ئەو ماناو دەلالەتانەی هەڵگریەتی، لە نوسینەکانی "هیگڵ"دا بەدیارکەوت. بە فیعلی "هیگڵ" پێیوابوو بونگۆڕینی مێژوویی بەشێوەیەکی حەتمی بەرەو پێشکەوتنی بەردەوام و بەرەو دەوڵەتی ڕەها دەچێت کە هاوکات بریتییە لە کۆتایی مێژوش. لای "هێگل" مۆدێرنە خەسڵەتێکی زەمەنی بە ئاینینی مەسیحی بەخشی، بەلاّم ئەو بەریانە فیکریەی پاش "هیگڵ" هاتە ئارا، بۆچونەکانی ئەوی پێپەسەند نەبوو. بۆ نموونە "نیچە" پێیوایە مێژوو هەربەبێ مانا دەمێنێتەوە و هیچ کاتێک ناتوانین پێشبینی ئەوە بکەین چۆن ڕێدەکات. مێژوو بەشێوەیەکی حەتمی بەرەو پێش ناچێت، ڕەنگە بە فیعلی بەرەو پێش بچێت، بەلاّم ئەو پێشکەوتنە لە کارو کردەوەی مرۆڤ و ئیرادەی هوشیار و ئازاد و ئەفراندن و پرۆژەکانی و ئەو بەهایانەی بڕوای پێیانە، سەرچاوە دەگرێت. ئەو بەهایانەش بەردەوام پەیوەست دەبن بە کلتورو ناسنامەی ئەو میللەتانەی بەرهەمیان دێنن، لێرەوە ناکرێت باس لەبەهای جیهانی و گەردونگەرایی بکەین کە بۆ تەواوی میللەتان بگونجێت. بە بڕوای "نیچە" مۆدێرنە خەسڵەتێکی ئەبستراکتی کردە بەر بەها ئەخلاقیەکان.. لە ڕاستیدا وەکو "نیچە" پێی وایە، بەها بە ژیان و ویژدانی مرۆڤەوە گرێدراوە و بۆ خۆشی بەرهەمی کۆمەڵگەیە لە ساتەوەختێك لە ساتەوەختی مێژویدا و پەیوەستە بە کلتوری و بیروباوەڕی ئەو کۆمەڵگایەوە، لێرەوە بەها ئەخلاقیەکان بە پێی هەلومەرجی کات و شوێن دەگۆڕێن. ئەم تێڕوانینە ڕێژەگەرایە دەرهەق بە بەها ئەخلاقیەکان بە بۆچونی "لیوستراوس"، دواجار بە نیهلیزم کۆتایی دێت و لە رووی مێژووییشەوە بەوە دەگات کە بزاوتی نازیزم لە ئەڵەمانیدا بێتە ئارا. سەرەنجام دەتوانین بڵێین تێزەکانی "لیۆستراوس"، ئەگەرچی شایەنی ئەوەیە لە هەندێ ڕووەوە ڕەخنە بکرێت، بەلاّم لەگەڵ دەرەنجامەکانی فەیلەسوفێکی دیدا کە سەر بە ئاقارێکی فیکری تەواو جیاوازە یەکدەگرێتەوە، ئەو فەیلەسوفەش "یۆرگن هابرماس"ە.

### 4-جیاکردنەوەی سیاسەت لە فەلسەفە:

لە سەدەی بیستەمداو وەکو درێژە پێدانی (فیزیای کۆمەلاّیەتی) کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا هاتە ئارا، تیۆریا گەلێك پەیدابوو کە داوای دەکرد سیاسەت لە فەلسەفە جیابکرێتەوە، هاوکات مەعریفەی سیاسی بەکۆمەڵێك پێوەدانگەوە ببەسترێتەوە کە لەوپەڕی تۆکمەیی زانستیدا بێت و

سەرچاوەی لە زانستە سروشتیەکانەوە گرتبێت. کتێبەکەی "کارل پۆپەر" (کۆمەڵگەی کراوەو دوژمنانی)، نمونەی ئەو تیۆریا و بۆچونانەیە. سیاسەت لای کەسانی وەك: (ئەفلاتۆن، ئەرستۆ، فارابی، وەك نمونەیەك)، بە درێژکراوەی فەلسەفە دەدرایە قەڵەم و تەنانەت زۆر بە توندیش پێیەوە گرێدرابوو. بەڵام مۆدێرنەی سەدەی بیستەم داوای کرد سیاسەتو فەلسەفە لێك جیابکرێنەوە و بەمجۆرەش سیاسەت لە دەوڵەت و دامودەزگاکان و پارتە سیاسیەکاندا قەتیسکراو لە کێشە ئینسانیە گرنگەکان دابڕکرا. لێرەوە سیاسەت دەچووەوە سەر کۆمەڵگەیەکی تایبەت (کەپێی دەوترێت کۆمەڵگەی سیاسی)، ئەم کۆمەڵگەیەش لە کۆمەڵگەیەکی دیکەی نا-سیاسی (کەپێی دەوترێت کۆمەڵگەی مەدەنی) جیاوازترە. کەواتە دوو کۆمەڵگە لە کۆمەڵگەیەکدا. لە یادکردنی بوون کە "هایدگەر" باسی لێدەکرد، هەر بەتەنها تایبەت نییە بە فەلسەفە، بەڵکو لە زۆر زووەوە فیکری سیاسی مۆدێرنیش دەگرێتەوە.

فیکری سیاسی بەوپێیەی خواستی بوو بە گەیشتن بەمەعریفەیەکی جێگیروزانستیو لە هەوڵی لاسایکردنەوەی میتۆدەکانی زانستە سروشتیەکاندا بوو، ئیتر وای لێهات سەرقاڵی گەڕان بوو بە دوای ئەو بوارانەدا کەئەگەری تاقیکردنەوە و سەلماندنیان تێدایە و دەشێت ئامار بکرێن و بەشێوەیەکی ماتماتیکی ئەژماریان بکات، بەمجۆرەش فیکر سیاسی لە ئەقڵی عەمەلی دوور کەوتەوە و وایلێهات توێژینەوەی سیاسی خەسڵەتێکی تایبەت و دابڕاو لە کایەکانی تر وەرگرێت.

**5-کەنارگیرکەوتن و پاشەکشەی سیاسەت:**

**یەکەم/ لەسەر ئاستی فیکر:**

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە زۆرێك لە فەیلەسوفان لەسەردەمی مۆدێرنەدا هەوڵیانداوە بەشێوەیەکی ئەندازەیی و ماتماتیکی بیر لە سیاسەت بکەنەوە، ئەمەش زۆر بە ڕوونی بە تیۆریاکانی "تۆماس هۆبس و لایبنتز و کۆندرسێ"وە دیارە، بەڵام پێدەچێت هیچ یەك لەمان ئاگادار نەبووبن لەوەی ئەمە بەوێرانکردن و پایەماڵکردنی سیاسەت کۆتایی دێت. ئەم بۆچوونە لە تیۆریا شیکارییە هاوچەرخەکاندا چەسپی، ئەو تیۆریایانەی پشت بەو میتۆدانە دەبەستن کە سەرچاوە لە (سبرنیتیك)ەوە دەگرن، وەك تیۆریاکانی "ئیاستۆن و ئالمۆند و بارسۆن".

**دووەم/ لەسەر ئاستی واقیع:**

سیاسەت کە لە جەوهەردا بریتییە لە گفتوگۆ و مشتومڕ و کۆمینیکاسیۆن، لە ئەسینای دیموکراسی و ڕۆمای کۆماریدا سەریهەڵداو پاشان ئاوابوو، تەنها لە قۆناغە شۆڕشگێڕیەکاندا و لەو چرکەساتە مێژووییانەدا نەبێت کە لە دوای ئەو قۆناغە دێت، جارێکی تر نەهاتەوە ئارا. لەم بوارەدا نوسینەکانی "هانا ئارنت" لەوپەڕی گرنگیدایە، لەبەرئەوەی پێیوایە کە دیالەکتیکی ونبوون و دەرکەوتنەوە جڵەوی سیاسەت دەکات. سستمی ئەسینا کەسیاسەتێکی کۆمینیکاسیۆنی و هەماهەنگی لێکەوتەوە، جیاکاری لە نێوان فەرمانڕەواو خەڵك و خودا ناکات و ئەمەش دنەی خەیاڵدانی سیاسی چەندین فەیلەسوفیدا کەسەر بە ئاقاری فیکری جۆراوجۆر بوون، وەك: "کارل مارکس و هانا ئارنت و یۆرگن هاپرماس". گەشەی سیاسەت بەمانا "ماکیاڤیللیی"یەکەی (فێڵ و تەڵەکەو توندوتیژی..) و بەردەوامێتی ئەم ئاقارەش لای "کارل سمێس و جولیان فرۆند" (کاریزما،

سەرکردە، ملکەچی، توندوتیژی)، گوزارشت لە قەیرانی فیکر و مۆراڵ دەکات و بەڵگەی ئەوەشە کە ماهیەتی ڕاستەقینەی سیاسەت ئاوابووە.

لەبەرئەوەی لەسەردەمی مۆدێرندا خودگەرایەتی زاڵبوو لەگەڵیشیدا ئەقڵ ئامێری باڵادەستبوو، هەروەها ئیرادەی هێز پەلیهاویشت، تێکڕای ئەمانە وایانکرد سیاسەت وەرگۆڕێت و ببێت بە تەکنیکو بە تەکنۆلۆژیایەك بۆ دیسپلینی کۆمەڵایەتی. سەرەنجام ئەمە بووە مایەی سەرهەڵدانی دیاردەی زۆر توندوتیژی مەترسیدار، لە پای ئەمەشدا ئەوە دروستبوو کە "هانا ئارنت" بە(شەڕی پەتی) یاخود (شەڕی ڕادیکالی) ناودێری دەکات و نازیزمی لێدەکەوێتەوە. مۆدێرنەی توندوتیژی بریتییە لەم بەڵا سیاسیەی لە مێژوودا بێوێنەیە، چونکە بەشێوەیەکی ترسناك لەلایەن هێزێکی بیرۆکراسی و تۆتالیتاریەوە کە پێی دەڵێن (زانست)، پلانی بۆ دانراوە و نەخشەی بۆ کێشراوە. نازیزم لە ئەڵەمانیا بۆ پاساودانەوەی سیاسەتەکانی خۆی، پشتی بە تیۆریاکانی گەشەسەندن بەستبوو کە لە نوسینەکانی "داروین"ەوە سەرچاوەیان گرتبوو، ئەو تیۆریایانەش باس لە جیاوازی ڕەگەز و خوێن پاکی دەکەن. پاکتاوکردنی زانستی جولەکەکان، زۆر سروشتی و ئاسایی سەیر دەکراو هیچ جۆرە دڵەڕاوکێیەکی ویژدانی لای سەرکردەی نازیستەکان و ئەوانەی دەستیان لەگەڵدا تێکەڵکردبوون، دروستنەکرد. پێدەچێت سەدەی بیستەم ئەفسانەی (فاوست)ی جێهێشتبێت، لەبەرئەوەی زانست بە تەواوەتی تێکەڵ بە ئایدیۆلۆژیا بووە و سستمی حوکمڕانیش دەست هێزێکی بیرۆکراسی کەوتووە کە بەردەوام لە هەڵکشان و زیادبووندایە، هاوکات مرۆڤ دوچاری نامۆبوون بووە و سیاسەتیش ئاوا بووە.

لە ڕۆمانی (*Le Silence Des Sirenes*)ی "فرانز کافکا"دا، (*Ulysse*) دەبینین کە ئاماژەیە بۆ سیاسەت، لە نێو شەپۆلەکانی دەریادا وێڵ و سەرگەردانە، دواجار (*Ulysse*) بەیەکجاری ڕێگا هەڵە دەکات و ناتوانێت بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. لای "کافکا" لە سەردەمی مۆدێرنەدا، چارەنوسی سیاسەتیش بەم شێوەیە، لەبەرئەوەی سیاسەت بۆتە تارماییەك بەسەر سەری ئەو کۆمەڵگایاندا دێت و دەچێت کە حەز بە چارەی ناکەن. لێرەدا دەکرێت بڵێین: سیاسەت بێ شوێن و بێ وڵات و بێ پانتایی ماوە؟ ئەگەر ئەدیب و فەیلەسوفانی ئەوروپا باس لە تێئاوارەبوون و پێواری سیاسەت بکەن لە کۆمەڵگە دیموکراسیەکانی خۆیاندا، ئەی ئەبێت ئێمە دەرهەق بە سیاسەت لە کۆمەڵگاکانی خۆماندا چی بڵێین کە زۆربەیان سستمی ستەمکار و دیکتاتۆری تێیاندا حوکمڕانە؟

**6-گەڕانەوە بۆ بنەماکانی مۆدێرنە :**

ئایا دەبێت مۆدێرنەڕەتکەینەوە و بە تەواوەتیش لە سەرجەم ئەو کۆمەڵگایانەی دوورخەینەوە کە خواستیان ئازادی و سەرفرازییە، دوور لە بەندوباوی ئایدیۆلۆژیا چەواشەکارەکان؟ دەتوانین سەرنجبدەین کە لای زۆرێك لە ڕۆشنبیران هەوڵێك هەیە بۆ ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنەو تاوانبارکردنی بە کۆمەڵە تاوانێکی ترسناك، هەموو ئەمانەش بە پشتبەستن بەچەند ئەزمونێکی مێژوو، بەڵام نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت کە زۆربەی ئەو ئاقارە فیکری و سیاسیانەی نەیاری مۆدێرنە بوون، هاوکات لەگەڵ دیموکراسیشدا نەیاربوون، بۆ نمونە (ڕێبازی ڕۆمانسی لە ئەڵمانیا، ڕێبازی ناسیۆنالستی و ڕەگەز پەرستی لە فەرەنسا..)، هەروەها نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت کە گەشە و برەوسەندنی

فاشیزم لە ئەوروپا، پەیوەندی بەو تێزانەوە هەبووە کە لە یەککاتدا دژایەتی مۆدێرنەو دیموکراسیان کردووە. ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە بەشێوەیەکی ڕادیکالانە، ڕەنگە بە لەناوبردن و وێرانکردنی دیموکراسی کۆتایی بێت. لێرەدا پێویستە ئەو بۆچونەی "هاپرماس" لەبەرچاوبگرین کە داوا دەکات جیاوازی بکەین لە نێوان بەهاکانی مۆدێرنە و واقعی مێژووی مۆدێرنەدا کە پێکهاتەی کۆمەلایەتی و سروشتی چینە بالا دەستەکان ئاراستەی دەکەن.

## سەرچاوە

گۆڤاری (فکر و نقد) – ژمارە (25).

# تیۆرەی دەسەڵاتی رەها : تۆماس هۆبس

شاهۆ سەعید

**پاشاگەردانی و ترس لە سەردەمی هۆبسدا :**

تۆماس هۆبس (1679–1588) لەسەردەمێکدا ژیاوە کە ئەوروپا بەگشتی و زێدی وی، ئینگلتەرا بە تایبەتی، بە وەرچەرخانێکی گرنگ و هەستیار و مەترسیداردا تێدەپەڕی. جۆرج لیۆن لە کتێبی (فەلسەفەی هۆبس)دا کە ساڵی 1893 نوسیویەتی فەلسەفەی سیاسی هۆبس دەبەستێتەوە بە دۆخی سیاسی ئەو دەمەی ئینگلتەراوە کە ترس و نیگەرانییەکی قووڵ، هاوزەمان لەگەڵ کارەسات و نائارامی سیاسییدا، باڵی بەسەر یەك بەیەکی هاووڵاتییە ئینگلیزەکاندا کێشابوو، بە جۆرێك کەس لە چارەنوسی خۆی و لە چارەنوسی وڵاتەکەی دڵنیانەبوو[1].

هۆبس لە ژیانی خۆیدا ترسێکی گەورەی لە پاشاگەردانی هەبوو، ئەو ترسە لە تیۆرە سیاسییەکەیشیدا ڕەنگی داوەتەوە، کە لە ڕێگەیەوە هەوڵێکی بێ وچان دەدا بۆ فۆرمەلەکردنی سیستمێکی سیاسی کە لەسەر بنەمای ئارامی سیاسی و پابەندیی رەهای هاوڵاتیان بە دەسەڵاتی رەهاوە دامەزراوە. هەندێ لە توێژەران هۆکاری ترسی هۆبس لە نائارامی و پاشاگەردانی سیاسی دەبەستنەوە بە باری سایکۆلۆجیی و ژیانی تایبەتی ئەو بیریارەوە کە ژیانێکی سەخت ژیاوە، تەنانەت خاتوو (ترس) بۆتە مامانی، چونکە بەر لەوەدای لەدایکبوونی سروشتی لەدایکبووە کاتێ بەهۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵ و بانگەشەکانی خۆئامادەکردن بۆ جەنگی (ئەرمادا) دایکی توشی ترسێکی لە ڕادەبەدەر دەبێ و بەهۆی ئەو ترسەوە باری تەندروستی تێکدەچێ و بەر لەوادەی خۆی ژان دەیگرێ و تۆماس لە دایکدەبێ. بۆیە تۆماس هۆبس لە یەکێ لە نوسینەکانیدا گوزارشتی لەو دۆخە کردووە کاتێ وتوویەتی "من و ترس دوو برای دوانەین"[2]. بەڵام بەدەر لە ژیانی تایبەتی و دۆخی سایکۆلۆجی هۆبس، ئینگلتەرا لەو سەردەمەدا بە دۆخێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناجێگیردا تێدەپەڕی، کە دۆخی وەرچەرخان بوو لەسەر هەموو ئاستەکان، دۆخی داڕمانی بەهاو فەلسەفە و ڕێسا کۆنەکان بوو، دۆخی تێکچوونی هاوسەنگی نێوان گروپە کۆمەڵایەتی و چینە ئابووریەکان بوو، دۆخی ململانێی سەختی نێوان

ئاینزامەسیحیەکان بوو. کە زنجیرەیەك شەڕی ناوخۆی ترسناکی لێکەوتەوە[3].

هەرچەندە پاش مردنی هۆبس دۆخی سیاسی ئینگلتەرا گیرسایەوەو وردە.. وردە سیستمێکی شانشینی پارلەمانی دەستوریی جێگیر بوو، کە لە سایەیدا چینی بۆرژوا رۆڵێکی گرنگی لە پێشخستنی ئەو ولاتەدا گێڕا.. بەلاّم تا ئەو لە ژیاندا بوو ئاسۆکانی ئایندەی ئەو ولاّتە لێڵ بوون و وەرچەرخانە گەورەکان و ململانێ ئاینی و کۆمەلاّیەتی و ئابوریەکان هێشتا بە یاسا رێك نەخرابوون. بۆیە خولیای ترس خولیایەکی بەردەوام بوو لە ژیانی هۆبسدا بە ئەندازەیەك لە کۆی فیکری سیاسی ئەودا رەنگی داوەتەوە، پێداگرتنی بەردەوامی وی لەسەر بنیاتنانی دەسەلاّتی رەها وەك ئاڵتەرناتیڤی پاشاگەردانی و پشێوی سیاسی، زادەی ئەو خولیا بەردەوامەی بوو لە ئاست ترس و ئەگەرە ترسناکەکانی گەڕانەوەی کۆمەڵگا بۆ دۆخی سروشتی و دڕندەیی سەرەتایی.

تۆماس هۆبس لە خێزانێکی ئاینی و خوێندەوار لەدایکبووەو هەر لە منداڵییەوە فێری زمانی لاتینی و گریکی بووە، لە گەنجێتیدا چووەتە زانکۆی ئۆکسفۆرد و پاشان چەند کەسایەتییەکی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی ناسیووە کە گرنگترینیان فەیلەسوفی گەورە (فرانسیس بیکۆن) بووە، ماوەیەکی زۆر سکرتێری بیکۆن بووە و بەشێك لە نوسینەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی لاتینی. پاشان سەردانی فەرەنسای کردووە و لەوێ ماتماتیك و پرنسیپەکانی ئاکلیدسی خوێندووە.

گرنگترین کتێبە فەلسەفیەکانی هۆبس بریتین لە: "پرەنسیپەکانی یاسای سروشتی و سیاسی" کە ساڵی 1640 نوسیویەتی و لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە دەربارەی سروشتی مرۆیی، پەیمانی کۆمەلاّیەتی و هاولاّتیبوون. هەروەها "ئەژدیها یان لێڤیتان *Leviathan*" کە کتێبێکی تری هۆبسە دەربارەی تیۆرەی دەسەلاّتی ڕەها کە بە لێڤیتان شوبهاندوویەتی، ئەو ئەژدیهایەی کە لە کتێبی پیرۆزدا ناوی هاتووە. پاشان دوو کتێبی تری نوسیووە کە یەکێکیان "دەربارەی جەستە"یەو ساڵی 1655 نوسیویەتی، ئەوی تریان "دەربارەی مرۆڤ"ە کە ساڵی 1658 بلاّویکردۆتەوە[4].

### دۆخی سروشتی:

هۆبس لە بنەڕەتدا فەیلەسوفێکی ماتریالیست بوو، لەژێر کاریگەریی فیکری دیموکرایتس و رواقیەکاندا بوو. پێیوابوو (جوڵە) سەرچاوەی جیهانە و سروشت لە دۆخێکی میکانیکی پەتیدا، لە ژێر جڵەوی ئەو هێزانەدایە کە دەستپێشخەری دەکەن لە بزواندن و کرداردا، هەموو کردارێکیش پەرچە کرداری لێدەکەوێتەوە، زنجیرەی کردار و پەرچەکردارەکانیش بەشێوەیەکی میکانیکی درێژدەبنەوە. هەمان یاسا بەسەر ژیانی مرۆیی و کۆمەڵگاکانیشدا جێبەجێ دەبێ، کۆنترین و سەرەتاییترین کردار و پەرچەکرداری مرۆیی بریتین لە: ئارەزوو بوغز (یان حەز و ڕق). حەز ئەنگێزەی بەردەوامی ئەنجامدانی ئەو شتانەیە کە ئارامییەکی جەستەیی و دەرونی دەبەخشن بە مرۆڤ، ڕقیش دەرەنجامی جەستەیی و دەرونی ئەو شکستانەیە کە مرۆڤ لە کاتی خستنەگەڕی حەزەکانیدا تووشی دەبێ. پاشان رۆژبەرۆژ ئەم کردار و پەرچەکردارە مرۆییە پەرەی سەندووە و هاتۆتە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگاوە، بەجۆرێك هەمیشە و لە هەموو پێشهات و گۆڕانێکدا خۆی دووبارە دەکاتەوە بەلاّم لە فۆرم و کلێشەی جیاوازدا. بابەتی حەزی مرۆڤ – بە گوێرەی ناونانی خودی مرۆڤ –

هەمیشە خێرە و بابەتەکانی ڕقیش هەمیشە ناونراوە شەڕ یان خراپە. تا مرۆڤ زیاتر لە خۆشییەوە نزیك بێت زیاتر هەست بە خێر دەکا، تا لە ئازاریشەوە نزیك بێت زیاتر هەست بە شەڕ دەکا، هەر بۆیە گەورەترین خێر ئاسوودەیی و ئاشتییە لە ژیانداو، ترسناکترین شەڕیش مەرگ و شەڕ و کوشتارە.

بەڵام هۆبس بەشێوەیەکی ڕۆمانتیکی ناڕوانێتە ئەو دوا لیزمەیە و پێیوایە ئاشتی و ئارامی دوو دەستەواژەی میتافیزیکی نین و لە ڕێگای نزاو پاڕانەوەوە نایەنەدی، بەڵکو پێویستیان بە کرداری بەرجەستە هەیە، واتە هێز. هەربۆیە لە کتێبی (ئەژدیها)دا دەنوسێ: "من پێم وایە لە دوای هەموو هێزێك مرۆڤ ئارەزوی هێزی زیاتر دەکا (...) نەك لەبەرئەوەی مرۆڤ بڕوای بە دەسەڵاتی میانڕەو نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی ناتوانێ زەمانەتی مانەوەی ئەو شتانە بکا کە هەیەتی و ناتوانێ ببێتە خاوەنی ژیانێکی باش تەنها لە ڕێگای بەهێزبوونی زیاترەوە نەبێ"[5].

بە پێچەوانەی ئەرەستۆوە هۆبس پێیوایە کە مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی نییە و حەز بە گردبوونەوە ناکا، بەڵکو بوونەوەرێکی خۆپەرستە و ئارەزوو دەکا زۆرترین خۆشی و چێژ بۆ خۆی پاوان بکا دوور لەوانی تر. هەربۆیە پێی هەڵەیە کۆمەڵگەی مرۆیی بە شانەی هەنگ بشوبهێنرێ، چونکە هەنگەکان بە غەریزە هاوکاری یەکتر دەکەن و هیچیان لەناو شانەکەدا رکابەری ئەوانی تر ناکەن، بەڵام رکابەریی (منافسە)ی نێوان مرۆڤەکان لە بچوکترین شانەدا دروست دەبێ.

بە گوێرەی ئەم لۆجیکە هۆبس هەوڵدەدا وێنەیەك بۆ دۆخی سروشتی مرۆڤ، بەر لە دروستبوونی کۆمەڵگە، بکێشێ. چونکە لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ بوونەوەرێکی خۆپەرستی پەتییە و تا دوا ئەندازە هەوڵدەدا هەموو چێژ و خۆشیەکان بۆ خۆی پاوان بکا، "مرۆڤ دەچێتە شەڕی مرۆڤ" و "هەموان دەچنە شەڕی هەموانەوە". واتە شەڕ و رکابەریی بەردەوام یاسای بنەڕەتی جووڵەی مرۆڤە لە دۆخی سروشتیدا. هەر بۆیە هۆبس دژی ئەو لۆجیکە ئاینییە بوو کە دەیوت "مرۆڤ برای مرۆڤە"، بەڵکو پێی وابوو "مرۆڤ گورگی مرۆڤە". بەڵام لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ لە دڕندەییەکی بێسنوردا دەژی و هیچ کەس، تەنانەت خاوەن هێزەکانیش، ناتوانن ئارامی و چێژی جەستەیی دەستەبەر بکەن و بۆ ماوەیەکی درێژ پارێزگاری لێبکەن، چونکە هەمیشە لە بۆسەدان بۆ یەکدی و هەمیشە لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوەدان لەیەکتر. واتە مرۆڤ هەست بە ترسێکی بێسنوور دەکا کە تیایدا ژیان کورت و بێ ئایندە و لێڵە. لە کاتێکی وادا پەیوەندیی نێوان کردار و پەرچەکردار هاوسەنگی لە دەستدەدا، چونکە لایەنێکی هاوکێشەکە کە (چێژ و خۆشی و ئارامییە) بە تەواوەتی لەبەین دەچێ و نامێنێ. ئیتر هیچ یاسایەك لە ئارادا نامێنێ تەنانەت یاسای هێزیش، چونکە یاسای هێز هەمیشە پێویستی بە لایەنێکی بەهێز تر هەیە کە دیاردەکان ناوبنێ و شتی ڕەوا لەشتی ناڕەوا جیابکاتەوە "گەر هێزێکی گشتی لە ئارادا نەبێ، یاساش بوونی نامێنێ، کە یاساش بوونی نەما شتێك نامێنێ ناڕەوا یان نادادپەروەرانەبێ"[6]. ئیدی سنوری نێوان موڵکایەتیش نامێنێ و شتێك نامێنێ هی من بێ و شتێك هی تۆ "بەڵکو هەر شتێك هێندە هی مرۆڤە بتوانێ پڕی پێدا بکا، یان بتوانێ پارێزگاری لێبکا"[7]. شەڕی ناوخۆی ئەو دەمەی ئینگلتەرا و واقعی سەختی ئابوریی کە هاوزەمان بوو لەگەڵ دەرکەوتنی بەرژەوەندییە ئابورییە نوێیەکان و

دەرکەوتنی تەماح و چڵێسی لای مرۆڤ، بەجۆرێك هەر کەسە و لای خۆیەوە هەوڵی دەدا زۆرترین دەسەڵات بەسەر بەرامبەردا پراکتیزە بکا و خاوەنی هەموو ئەو شتانە بێ کە بەرامبەر لێیان بێ بەشە.. ئەو دۆخە نالەبارە دۆخی سروشتی دەهێنایەوە یادی هۆبس کە دۆخێکە مرۆڤ دژی مرۆڤ لە جەنگی بەردەوامدایە و هەموان لە جەنگی هەمواندان.

ئەو دەمە سەرەتای دەرکەوتنی چینی بۆرژوا بوو لە ئینگلتەرا، کە سەرەتایەکی موژدەبەخش نەبوو، چونکە چینێکی تەماح بازبوو هێشتا نەبووبوە خاوەنی کولتور و فەلسەفەی تایبەت بەخۆی، هەوڵی دەدا زۆرترین ئازادی ئابوری بۆ خۆی بیچڕێ و رۆڵی دەوڵەت بێ لایەن بکا لە ئاست هەموو پرسە ئابوریەکاندا. نەبوونی هیچ سانسۆرێك لەسەر ئەو چینە تازە پیاکەوتووە، کە هیچ سنورێك نەبوو بۆ چالاکیەکانی ترسێکی گەورەی لەناخی هۆبسدا دروست کردبوو. لۆجیکی بازاڕی ئازاد — لە دیدی هۆبسدا — هەمان لۆجیکی شەریعەتی دارستان و دۆخی سروشتی بوو کە هیچ سنورێك لەبەردەم کێبڕکێ و بەرژەوەندیی تەسکی تاکەکەسیدا نامێنێتەوە و سەرەنجام سەرکەوتن تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە بەهێز تر و تەڵەکەبازترن.

ئەو تابلۆ تاریکەی کە هۆبس بۆ واقعی ئەو دەمەی وڵاتەکەی دەیکێشێت و ئەو نزیککارییەی لە نێوان ئەو دۆخە و دۆخی سروشتی سەرەتایی ئەنجامی دەدا، بە مەبەستی تیۆریزەکردن بوو بۆ دەسەڵاتی رەهای دەوڵەت بۆ ئەوەی دەستوەرداتە هەموو لایەنەکانی کاروباری ئابورییەوە، چونکە گەر دەوڵەت خاوەن دەسەڵاتی رەها نەبێ هیچ بوارێك بۆ ڕکابەریی رەوا نامێنێتەوە. بە مانایەکی تر هۆبس دەیویست "دەسەڵاتی شانشینی رەها بکاتە ئامڕازێکی بنەڕەتی بۆ راگرتنی هاوسەنگی بەرژەوەندیەکان"(8)، بۆ رێکخستنی پەیوەندیی نێوان چین و گروپە جیاوازەکان، واتە هیچ کام لەو چین و گروپانە خاوەنی دەسەڵاتی رەها نەبێ لە ئاست دەسەڵاتی دەوڵەتدا و هەموویان سنوری ئازادی کارکردنی خۆیان بزانن تا وڵات لە پاشاگەردانی و پشێوی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیدا نوقم نەبێ. هەربۆیە هۆبس پێیوابوو دەسەڵاتی شانشینی شیاوترین فۆرمی دەسەڵاتی سیاسییە، چونکە تەنها یەك کەس دەچێتە سەرو یاساوەو تەنها یەك کەس بۆی هەیە یاسا پێشێل بکا، بەلام لە فۆرمەکانی تری دەسەڵاتدا هەرکەسێك بۆی بلوێ دەچێتە سەرو دەسەڵات و یاساوە(9).

### یاساکانی سروشت و یاساکانی کۆمەڵگە :

گەر (حەز و ڕق) دوو بزوێنەری سەرەکی جوڵە و کردەوەکانی مرۆڤ بن لە دۆخی سروشتیدا، ئەوا لە دۆخی کۆمەڵایەتیدا مرۆڤ ئەنگێزەیەکی تر دەدۆزێتەوە کە (ئەقڵ)ە. مرۆڤ لە رێگەی ئەقڵەوە دەستبەرداری برێك لە غەریزە سروشتیەکانی خۆی دەبێ، کە هەمیشە هانی دەدەن بۆ بەکارهێنانی هێز و خۆپەرستی و جیابوونەوە لەوانی تر. ئەقڵ مرۆڤ فێردەکا کە پاراستنی بەرژەوەندییەکان تەنها پێویستی بە بەکارهێنانی هێزی پەتی و گۆشەگیری پەتی نیە، بەڵکو هەندێ جار پێویستی بە سازش و بەکارهێنانی فێڵ و تێکەڵاویکردنی ئەوانی تر هەیە. وەرچەرخانی مرۆڤ لە دۆخی سروشتی پەتییەوە بۆ دۆخی شارستانی وەرچەرخان نییە لە خراپەوە بۆ باشە، بەڵکو وەرچەرخانە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی فۆرمەکانی توند و تیژی، لە یەکەمیاندا توندوتیژی فیزیکی و راستەوخۆیە بەلام لە دووەمیاندا مەعنەوی و ناڕاستەوخۆیە، لە یەکەمیاندا مرۆڤ هێزی پەتی بەکاردێنێ بەلام لە دووەمیاندا تێکەڵێك

لە هێز و فێڵ بەكاردێنێ، لە یەكەمیاندا دەسبەجێ و بەشێوەیەكی دەمارگیرانە تۆڵەی خۆی دەستێنێتەوە بەڵام لە دووەمیاندا بەشێوازیی یاسایی و ئەقڵانی تۆڵەی خۆی لەوانی تر وەردەگرێتەوە.

واتە وەنەبێ لە دۆخی شارستانی و دروستكردنی كۆمەڵگەدا مرۆڤ دەسبەرداری خۆپەرستی ببێ، بەڵكو بە پێچەوانەوە مرۆڤ زیاتر خۆی خۆشدەوێ، هەر لە پێناو مانەوەی خۆیدا ئامادەیە سازش بكاو لە بڕێك لە دەسەڵات و ئازادیی خۆی خۆش ببێ، فێری ئەوە دەبێ دان بە خۆیدا بگرێ و بڕێك لە شەڕەكانی خۆی دوابخا بۆ كاتی گونجاو. واتە یاساكانی كۆمەڵگە هەمان یاسای سروشتی و خۆڕسك نین، بەڵكو یاساگەلێكن بە فلتەری ئەقڵدا تێدەپەڕن، لەمبارەیەوە هۆبس دەڵێ: "ئەقڵ بیرۆكەی یاسای سروشتی، وەك ڕێسایەكی گشتی ئاشكرا دەكا، تا لە ڕێگایەوە خۆی لەو كردەوانەی بپارێزی كە ژیانی لەناودەبەن، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو كەرەستە نوێیانە ئاشكرا بكا كە پاراستنی ژیان دەستەبەر دەكەن"[10].

وەرچەرخان لە دۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی شارستانی وەرچەرخانێكی ڕەمەكی نییە بەڵكو بە گوێرەی یاساكانی گەشەی ئەقڵو پێشكەوتن ڕوودەدا، ئەو یاسایانە بیركردنەوەی مرۆڤ جڵەو دەكەن تا بگاتە ئەو قەناعەتەی كە تەنها لە ڕێگەی هاوكاری ئەوانی ترەوە دەتوانێ پارێزگاری لە موڵكیەت و مافەكانی خۆی بكا. یاسای سروشت و یاسای ئەقڵی مرۆیی ئەوە دەسەپێنن كە لە پێناو مانەوە و پاراستنی ژیانی مرۆڤدا، دەبێ هەر مرۆڤێك پارێزگاری لە ژیانی ئەوی تر بكا تا ئەویش ژیانی ئەو بپارێزێ، واتە مرۆڤ لە دۆخی شەڕی هەمیشەییەوە، شەڕی تاك بەرامبەر تاك و شەڕی هەموان لە دژی هەموان، دەچێتە دۆخی پێكەوە گونجان و سازش. ئەڵبەتە مرۆڤ تا ئەو شوێنە پەنا بۆ سازش و ڕێگەچارەی مەعنەوی دەبا كە بزانێ ناتوانێ پەنا بۆ هێزی پەتی بەرێ، بەڵام لەوە بەدواوە لەو كاتانەدا كە دەزانێ بۆی دەلوێ ئەوا لە بەكارهێنانی هێزی پەتیشدا دوودڵی ناكا.

هۆبس باس لە نۆزدە یاسای سروشتی دەكا، بەڵام زیاتر جەخت لەسەر دوو یاسا دەكاتەوە كە بریتین لە: (بەرگریكردن لە خود) و (گەڕان بە شوێن ئاشتیدا)، یەكەمیان بەندە بە مەیلی بەردەوامی مرۆڤەوە بۆ بەرگریكردن لە خود، كە مەیلێكی غەریزییە، بەڵام رۆژ بە رۆژ لەگەڵ گەشەی كۆمەڵگەدا بەرگی نوێ و فۆرمی تازەتر وەردەگرێ و دەبێتە ئەنگێزەی گردبوونەوەو هاریكاریی زیاتری نێوان مرۆڤەكان. یاسای دووەم، (گەڕان بە شوێن ئاشتیدا)، ئەنگیزەی ئاسایشی تاكەكەسی و ئاسایشی دەستەجەمعییە لای مرۆڤ، سەرەتا یاسایەكی فەردییە بەڵام لەگەڵ پێشكەوتنی فۆرمەكانی گردبوونەوەدا شێوازێكی دەستەجەمعی وەردەگرێ و پەیوەندییەكی میكانیكی و یەكتەواوكەر لە نێوان ئاسایشی تاك و ئاسایشی كۆمەڵگەدا دروستدەبێ، چونكە مرۆڤ دەگاتە ئەو قەناعەتەی كە مەحاڵە بتوانێ ئاسایشی خۆی دابین بكا گەر پێشوەخت ئاسایشی كۆمەڵگە دابین نەكرابێ[11].

ئەم دوو یاسا بنەڕەتییە (بەرگریكردن لە خود) و (گەڕان بە شوێن ئاسایشدا)، سەرەتا دوو یاسای فەردیین. واتە مرۆڤ وەك دوو خواست تایبەت بە خۆی وەك تاكەكەسێكی دابڕاو لەوانی تر پەنایان بۆ دەبا. بەڵام پاشان دەگاتە ئەو قەناعەتەی كە ئەم دوو یاسایە بە تۆڕێكی بەرفراوانی پەیوەندیی یەكتەواوكەردا پەخشدەبنەوە كە تا مرۆڤ (ئەویتر)

هەبێ، هەمان دوو یاسای کۆپی خۆیان لای ئەوانی تر دووبارە دەکەنەوە. ئیدی مرۆڤ دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئازادی ئەو بەندە بە ئازادی ئەوانی ترەوە، واتە هێندەی ئەو ئازادییەی دەیبەخشێ بەوان، ئەویش ئازادیی لەوان چنگ دەکەوێ.

کەواتە مەرجێکی کۆکەرەوە لەناو مرۆڤەکاندا لەدایکدەبێ کە بریتییە لە متمانەی هاوبەش، بەڵام متمانەی هاوبەش نایەتەبوون گەر مرۆڤەکان پێشتر لە دەسەڵاتی رەهای خۆیان خۆش نەبووبن، چونکە ئەگەر بێتو مرۆڤەکان بە یەکسانی خاوەن دەسەڵاتی رەها بن واتە شەڕی بەردەوامی مرۆڤ بەرامبەر مرۆڤ و شەڕی بەردەوامی هەموان بەرامبەر بە یەکتر. بەڵام پاشگەزبوونەوەی مرۆڤ لە دەسەڵاتی ڕەهای خۆی بەرەنجامی ئەنگێزەی خێرخوازی و ئیرادەی هاوبەش نییە وەك خۆشبینەکان تیۆریزەی بۆ دەکەن، بەڵکو بەرەنجامی ترسێکی هاوبەشی هەموان لە ئاست دەسەڵاتێکی دەرەکی ڕەهادا کە کەس ناتوانێ سنورەکانی. ببەزێنێ. واتە مرۆڤەکان ناچارن لەگەڵ یەکتردا ڕێکبکەون کە سنوری یەکتر نەبەزێنن و بڕێك لە ئاسایش بۆ یەکتر دابین بکەن، بەڵام ئایا مرۆڤ چۆن متمانە بەیەکتر دەکا و چۆن زەمانەتی ئەوە دەکا کە بەرامبەرەکەی بەهەمان ڕێکەوتنەوە پابەند بێ، لێرەدا لایەنە ڕێکەوتووەکان پێویستیان بەلایەنی سێیەمە کە بە زەبری هێز هەموان ناچار بکا پابەندی ڕێکەوتنەکان بن، دەبێ ئەو لایەنی سێیەمەش خاوەن دەسەڵاتی رەها بێ کە کەس بۆی نەبێ دەسەڵاتی خۆی بەرێتە ئاستی دەسەڵاتی ئەو، ئەڵبەتە ئەو لایەنە خاوەن دەسەڵاتە ڕەهایە دەوڵەتە، دەبێ دەوڵەت خاوەن دەسەڵاتێکی ئەوتۆ بێ کە کەس و لایەنە ڕێککەوتووەکان ناچار بکا پابەندی ڕێکەوتنەکانیان بن، چونکە هەروەك هۆبس دەڵێ: "ڕێکەوتن بەبێ شمشێر هیچ نیە جگە لە وشەگەلێك"[12]، دەوڵەتیش ئەو بوونەوەرە شمشێر بەدەستەیە کە کەس و لایەنە ڕێکەوتوەکان ناچاردەکا پابەندی وشەکانیان بن.

## پەیمانی کۆمەڵایەتی:

فیکری سیاسی کۆن لە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی ئەرستۆدا پێی وابوو هەموو مرۆڤێك بە سروشت هاووڵاتییە، واتە هەموو مرۆڤێك لە بنەڕەتدا حەزی لە هاریکاری و گردبوونەوەو دروستکردنی کۆمەڵگەیە. بەڵام تۆماس هۆبس بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەوە پێیوابوو مرۆڤ بە سروشت دژی هاوڵاتیبوون و پابەندبوونە بە یاساکانەوە، دژی هاریکاریی و گردبوونەوەیەوە، بەڵام پاشان بە ناچاری یان لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بە هاریکاریی ئەوانی تر رازی دەبێ[13]. ئەو دۆخەش جۆرێکە لە پەیمانی کۆمەڵایەتی، کە لە سایەیدا مرۆڤەکان بە چەند یاسایەکی نوسراو یان نەنوسراوەوە پابەنددەبن بە سەرپەرشتی دەسەڵاتێکی رەها کە دەوڵەتە.

بەڵام ناتوانین بڵێین بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی لای هۆبس بیرۆکەیەکی تەواو تازەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە فیکری سیاسی کلاسیکەوە نییە، چونکە چەمکی دەسەڵاتی دەوڵەت هەر لە کۆنەوە جەختی لەسەر بیرۆکەی پەیمان و ڕێکەوتنی نێوان ئەندامان و گروپەکانی گەل کردۆتەوە بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا ناوی (پەیمان) بێنێ. بۆ نمونە تیۆرەی ئیمپراتۆریای ڕۆمانی لەسەر بنەمای گواستنەوەی دەسەڵات لە گەلەوە بۆ ئیمپراتۆر دامەزراوە.. واتە گەل خاوەنی هەموو دەسەڵاتێکە بەڵام خۆی بە ئارەزووی خۆی لەو دەسەڵاتە خۆش دەبێ بۆ ئیمپراتۆر "هەموو ماف و دەسەڵاتەکانی گەلی ڕۆمانی بە گوێرەی یاسای

*Lex Regia* دەگوێزرێتەوە بۆ ئیمپراتۆر، کە تەنها ئەو مافی دانانی یاسا و مافی شیکردنەوەی یاسای هەیە"[14]. تیۆرەی دەوڵەت لە چاخەکانی ناوەڕاستدا هەمان یاسای ڕۆمانی زیندوکردەوە بۆ چڕکردنەوەی دەسەڵات لە بنیاتێکی مەرکەزیدا و لە پێناو نیشاندانی پەیوەندیی نێوان فەرمانڕەواو فەرمانڕەواییکراو وەک پەیوەندیی نێوان دوو لایەنی ڕێککەوتو کە هەردوو لایان ئەرکیان بەرامبەر یەکتر هەیە.

بەڵام هۆبس مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ ئەو سەرچاوە مێژووییانەدا کردووە و وێنەیەکی تایبەتی بە بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی بەخشیوە، کە پەیوەندییەکی زۆری بە سیاقی مێژویی خۆیەوە هەیە. هۆبس وەک (جان بۆدان) و تیۆرسازە ئاینییەکانی چاخەکانی ناوەڕاست لە سەرچاوەیەکی غەیبییەوە دەسەڵاتی ڕەها نابەخشێ بە دەوڵەت و فەرمانڕەوا، واتە دەسەڵاتی پادشا بە بچوککراوەی دەسەڵاتی یەزدان نازانێ، بەڵکو بە بەرهەمی پەیمانی کۆمەڵایەتی لە قەڵەمی دەدا، چونکە دەسەڵاتی پادشا یان فەرمانڕەوا چەندە بەهێز بێ سەرەنجام هەرەس دێنێ گەر بەرهەمی پەیمانی زەمینی فەرمانڕەواییکراوەکان نەبێ. لێڤیتان یان ئەژدیها ئەو دەوڵەتە بەهێزەیە کە پشتئەستورە بە دەسەڵاتی ڕەها و پەیمانی کۆمەڵایەتی، واتە لەسەر دوو پێ وەستاوە: یەکەمیان هێزی فیزیکی دەوڵەتە کە خۆی لە سوپا و یاسا و دەزگا بەرجەستەکاندا دەبینێتەوە، ئەوی تریشیان هێزێکی مەعنەوییە کە خۆی لە پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕەعیەت و تەواوی گەلدا دەبینێتەوە.

بەڵام بەر لەوەی بڕیار لەسەر پەیمانی کۆمەڵایەتی بدرێ، دەبێ پێشوەخت هێزێک لە هێزەکان، ئەژدیهایەک لە ئەژدیهاکان، بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بووبێ و بە زۆرینەی دەنگ وەک هێزی براوە ئەژمارکرابێ تا وەک لایەنی سێیەم وەک سەرپەرشتیاری گشتی دەستەبەری ئەوە بکا کە هەموان پابەندبن لە ئاست پەیماندا. بە مانایەکی تر هۆبس وەک یاساناسەکان پێیوایە دەبێ هێزێک (وەک دادنوس) سەرپەرشتی پەیمان بکا و توانای ئەوەیشی هەبێ سزای ئەو کەس و لایەنانە بدا کە لە پەیمان پاشگەزدەبنەوە. واتە لە رووی کاتەوە بوونی هێزی ڕەها پێویستترە لە پەیمانی کۆمەڵایەتی، بەڵام هێزی ڕەهاش بەبێ پەیمان مرۆڤەکان دەخاتە بازنەیەکی داخراوەوە کە لە دۆخی سروشتی و دڕندەیی بەردەوامدا دەبن، بە دەربڕینێکی تر ئێمە تەنها ئەو کاتە دەتوانین هێزێک ناوبنێین ڕەها کە توانای پابەندکردنی هەموانی هەبێ لە ئاست پەیماندا. لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشێ: ئایا پابەندبوون لە ئاست پەیماندا پابەندبوونێکی ئارەزوومەندانەیە یان ناچارییە؟ ئەڵبەتە بەشی زۆری تاک و گروپەکان، لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان و پاراستنی ژیان و ئەو موڵکانەی هەیانە، بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە سازش دەکەن و پەیمان دەبەستن. کەسانێکیش وەک پەسەندکردنی دیفاکتۆ (ئەمری واقع) بەشداری پەیمانەکە دەکەن. بەڵام لە هەموو دۆخێکدا کەسانێک یان گروپگەلێک دەمێننەوە کە ئەمری واقع پەسەند ناکەن و بەرەنگاری دەسەڵاتی دەوڵەت و پەیمانی کۆمەڵایەتی دەبنەوە. لێرەدا هۆبس باس لەوەدەکا کە بەکارهێنانی هێز دژی ئەو کەس و گروپانە کارێکی پێویستە، چونکە زەبروزەنگی زۆرینە دژی کەمینەیەک کە لە چوارچێوەی دەزگاکانی دەوڵەتدا ڕام نابێ ڕەوایە[15].

کۆمەڵگەی سیاسی یان (دەوڵەت) زادەی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتیەیە کە تیایدا ئیرادەی جیاوازی

تاك و گروپەكان يەكدەگرێ وەك ئەوەى يەك ئيرادە لە ئارادابێ كە ئيرادەى هەموانە. واتە تەنها هێندە بەس نيە ئيرادەى تاكەكان لە يەكدى بچێ، بەڵكو پێويستە ئيرادەكان لە يەكديدا بتوێنەوە وەك ئەوەى لە سەرەتاوە يەك ئيرادە هەبووبێ و هەموان پەسەنديان كردبێ، پاشان تاكە كەسێك كە پادشايە يان كەسانێك كە ئەنجومەنێكى فەرمانڕەوا پێكدێنن دەبنە بەرجەستەكەرى ئەو تاقە ئيرادەيە هەروەها بەرجەستەكەرى يەكێتى و دەسەڵاتى ڕەهاى دەوڵەت كە قابلى دابەشبوون نييە. بۆ ئەوەى ئەو كارەش مەيسەر بێ دەبێ دەوڵەت لە ئاست تاك و گروپە جياوازەكاندا خاوەن هێزێكى لەبن نەهاتوبێ "هێزێكى مەزن بە ئەندازەيەك كە هەموان لێى بترسن و هەموان ئيرادەى خۆيانى تەسليم بكەن ئەويش لە بەرامبەردا ئاسايش و پەيمان و ئاشتى دەستەبەر بكا"[16]. جڕ بوونەوەى ئيرادەكان لە تاقە ئيرادەيەكدا زامنى يەكپارچەييەكى بەهێزى دەوڵەت دەكا، ئەو يەكپارچەييەى كە بەردەوامى دەبەخشێ بە هەموو پەيمانێك و سەقامگيربوونى هەر كۆمەڵگەيەكى سياسى.

ئەڵبەتە مرۆڤ پێى نەنگ نيە سازش لەسەر ماف و دەسەڵاتەكانى خۆى بكا كاتێ دەبينى ئەو بە تەنها نييە و خەڵكانيش هەمان سازش دەكەن، واتە كۆمەڵگەى سياسى مرۆڤ فێر دەكا كە سازشكردن لە پێناو بەرژەوەنديدا كارێكى ئاساييە و خەسڵەتێكە لە خەسڵەتەكانى مرۆڤى شارستانى بە پێچەوانەى مرۆڤى دڕندەى دۆخى سروشتييەوە كە ئامادەى هيچ سازشێك نييە تەنانەت گەر سەريشى بەخشيبێ. هۆبس بەم ڕستانە گوزارشت لە حاڵەتەكە دەكا و لەسەر زارى بەشداربوانى پەيمانى سياسييەوە دەڵێ: "من لە مافى خۆم پاشگەز دەبمەوە بۆ ئەم پياوە يان ئەم گروپە لە پياوان و سەرپشكيان دەكەم كە نوێنەرى (ئيرادە)ى من بن، بەمەرجێ تۆش بە هەمان شێوە لە مافى خۆت پاشگەز ببيتەوە و هەمان ئەو كەسانە سەرپشك بكەى كە من سەرپشكم كردوون بۆ هەر كارێك كە ئەنجامى بدەن"[17]. كەواتە هەموو ئەوانەى بەو پەيمانە ڕازين كەسانى پابەندن بێجگە لەو كەسەى كە سەرپشك دەكرێ. ئەڵبەتە كاتێ ئەم تيۆرەيە دەخوێنينەوە بۆمان دەردەكەوێ كە هۆبس هێزى دەوڵەت لە هێزى كەسى يەكەمى دەوڵەت (پادشا يان فەرمانڕەوا)دا دەبينێتەوە، پێيوايە تاوەكو پادشا بەهێزبێ و خاوەنى دەسەڵاتى بێ قەيدو مەرج بێ دەوڵەتيش وەك بوونەوەرێكى گەورە زياتر بەهێز دەبێ و زياتر تواناى خۆسەپاندنى دەبێ بەسەر دەوڵەتەكانى تردا. بەڵام ئەم تيۆرەيە لێرەدا كورت دەهێنێ چونكە ڕێككەوتن لەسەر پەيمانى كۆمەڵايەتى، بە گوێرەى هەمان تيۆرە، بەرهەمى بەرژەوەندى هاوبەشى ڕەعيەتە. هەر كاتێكيش ئەو بەرژەوەندييە بەهۆى پراكتيزەكردنى دەسەڵاتى ڕەهاى فەرمانڕەواوە كەوتە بەر مەترسييەوە ئەوە تەواوى پەيمانەكە دەكەوێتە بەر مەترسييەوە. بەڵام ترسى بەردەوامى هۆبس لە پشێوى و پاشاگەردانى هانيداوە تەنها پێ لەسەر ميكانيزمى كاركردن و جووڵەى ئەو كەسانە دابگرێ كە دەچنە پەيمانەوە، ئەو پێداگرتنە زۆرەش ميكانيزمى كاركردن و جووڵەى دەسەڵاتى سياسيى لەياد بردۆتەوە كە ئەويش لۆجيكى خۆى هەيە و كاتێكيش لەو لۆجيكە لادەدا لەبەريەك هەڵدەوەشێتەوە يان بەشێوەيەكى ميكانيكى گۆڕان بەسەر كارەكتەر و پێكهاتەكانيدا دێ. هۆبس لە كتێبى (ئەژديها)دا بوونى هەر پەيمانێكى كۆمەڵايەتى و بگرە هەر كۆمەڵگەيەك دەبەستێتەوە بە تاقە كەسێكەوە كە فەرمانڕەواى ئەو كۆمەڵگەيەيە، بەبێ وى يان بەبێ

ئەو ئەنجومەنەی کە ئەو کەسە ڕابەرایەتییان دەکا ئەوا کۆمەڵگە جگە لە ئەفسانەیەك یان وەهمێك هیچی تر نییە، خاوەنی هیچ بنیاتێکی بەهێزی ئەوتۆ نییە کە بتوانێ کۆمەڵگەی سیاسی یان دەوڵەت دروست بکا. بەڵام ئێستا تیۆرە تازەکان و لێکۆڵینەوەکانی بواری سۆسیۆلۆجیای سیاسی ئەوەیان دەرخستووە کە دەشێ پەیمانی کۆمەڵایەتی بوونی هەبێ بەبێ پەیمانی سیاسی یان بەبێ بوونی دەوڵەت. هەروەها ئەوەیان سەلماندووە کە ئەفسانەی هاوبەش لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا مەرجێکی گرنگە لە مەرجەکانی دروستبوونی کۆمەڵگە و کەسی فەرمانڕەواش هیچ نیە جگە لە نوێنەرێکی کاتی ئەو ئەفسانەیە. هەروەها کولتوری هاوبەش، زمانی هاوبەش و ئاین یان مەزهەبی هاوبەشیش ڕەگەزە بنیاتنەرەکانی هەر کۆمەڵگەیەکن[18].

کاتێ تیۆرەی سیاسی هۆبس دەخوێنینەوە دەبینین زۆر جار پەیمانی کۆمەڵایەتی بەهاوواتای کۆمەڵگەی سیاسی بەکاردێنێ، واتە کۆمەڵگە یەکسان دەکاتەوە بە دەوڵەت و باس لە هیچ کۆمەڵگەیەك ناکا لە دەرەوەی بازنەی دەوڵەت. واتە دەوڵەت ئەو ئەژدیهایەیە کە بەرگری لە کۆمەڵگە دەکا و زامنی پاراستن و مانەوەیەتی لە بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگەکانی تردا. بەڵام ئەم ئەژدیهایە ئاژەڵێکی خوراقی یان غەیبی نیە بەڵکو بوونەوەرێکی مرۆییە کە لەوێنەی پادشایەکدا بەرجەستەدەبێ. پادشاش کەسێکە بە دەستێکی شمشێری دەسەڵات و بەدەستەکەی تری گۆچانی کڵێسای پێیە، واتە کڵێساش هیچ ڕەوایەتیەکی لە دەرەوەی دەوڵەت نیە، چونکە پادشا تەنها نوێنەرایەتی دەسەڵاتی تەخویلکراوی گەل ناکا بەڵکو نوێنەرایەتی ئاینەکەشیان دەکا.

کتێبی لێڤیتان (ئەژدیها)ی هۆبس لێوانلێوە لە تیۆریزەکردن بۆ دەسەڵاتی ڕەهای پادشا وەك نوێنەری دەوڵەت کە قابیلی لێپرسینەوە یان دابەشکردن نیە، بەڵام لە هەردوو کتێبی (ڕەگەزەکانی یاسا) و (دەربارەی هاوڵاتی)دا گەشە بەهەمان بیرۆکە دەدا و دەسەڵاتی مەعنەوی دەوڵەت لە دەسەڵاتی بەرجەستەتە و کاتی پادشا جیادەکاتەوە. لەو دوو کتێبەدا هۆبس باس لە ئەرکەکانی پادشاو سنوری دەسەڵاتەکانی دەکا و پابەندبوون بە ئەقڵەوە دەکاتە مەرجێکی سەرەکی دەسەڵاتی شانشینی، چونکە تەنها بەرژەوەندی گەل یەکسان نییە بە دەسەڵاتی ڕەهای پادشا بەڵکو بەرژەوەندیی پادشاش یەکسانە بە خێری گشتی گەل و کاتێ چارەنوسی گەل دەکەوێتە بەر مەترسییەوە ئەوا بەرژەوەندیی پادشاش دەکەوێتە بەر مەترسی و ئەگەری لەناوچونەوە[19].

## دەوڵەت و مافەکانی هاوڵاتی:

گەر دەوڵەت خاوەنی ماف و دەسەڵاتی ڕەها بێ، ئەی هاوڵاتیان لەبەرامبەردا خاوەنی چ ماف و دەسەڵاتێکن. هاوڵاتیان لە چ کاتێکدا مافی بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتیان هەیە. بە گوێرەی تیۆرەی هۆبس تەنها لەو کاتەدا ئەو مافەیان هەیە کە دەوڵەت نەتوانێ ئاسایشی تەواویان بۆ دابین بکا، چونکە گەر دەوڵەت نەتوانێ هێمنی و ئاسایشی گونجاو بۆ دانیشتوانی وڵات دەستەبەر بکا ئەوە مانای ئەوەیە نەیتوانیوە دەسەڵاتی ڕەها پەیڕەو بکاو ڕێگەی بە فرە دەسەڵاتی داوە. واتە هاوڵاتیان بۆیان هەیە دژی دەسەڵاتە لاوازەکان ڕاپەڕن تا ئەو کاتەی دەسەڵاتێکی بەهێز و خاوەن بڕیاری یەکلاکەرەوە دێتە سەرکار. لێرەدا هۆبس بەناوی مافی بەرەنگاریی هاوڵاتیانەوە ڕەوایەتی

دەبەخشــێ بـەو دەســەڵاتە ڕەهایــەی کــە کــەس لــە ئاسـتیدا توانـای بـەرەنگاریی نیـە. بـە مانایـەکی تـر تاکــە یاســاوی دەســەڵات بــۆ فــەرمانڕەواییکردنی دەوڵـەت خـودی فەرمانڕەواییکردنەکەیـە. کاتێکیش هاولاتیان توانییان ئەو دەسەڵاتە زەوت بکەن مانـای ئەوەیــە کــە شــێوازی فەرمانڕەواییەکــە ســەرکەوتو نـــەبووە، لـــە کەشـــێکی واشـــدا حـــاکم مـــافی دەسەڵاتداریێتی لە دەستدەدا و ڕێگـەخۆش دەبێ بۆ ئـەوەی کەسـێك یـان گروپێکـی تـر بـەختی خـۆی تاقیبکاتەوە.

گـەر فـەرمانڕەوا خـاوەن دەسـەڵاتی ڕەهـا نـەبێ، ئەوا فەرمان و بڕیارەکانیشی شایەنی ڕێزگرتن نابن و کـەس پابەنـدییان نـابێ. لـە کـاتێکی وادا تـەنها دەســـەڵاتدار مافــەکانی خــۆی و یاســاوی مانــەوە لەسـەر حـوکم لەدەسـت نـادا، بـەڵکو هاولاتیـانیش مافــەکانیان لەدەســت دەدەن، ئیــدی دەزگایــەکی یاسادانان و دادوەریـی لـە ئارادا نـامێنن کە توانای یاسـا دەرکـردن یـان حوکمـدان یـان جیاکردنـەوەی ڕەوا لە ناڕەوایان هـەبێ، چونکە تـەنها فـەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵاتی ڕەها توانای ئەوەی هەیە سنور لە نێوان مافـەکانی مـن و مافـەکانی تـۆ، ئازادییـەکانی مـــن و ئازادییـــەکانی تـــۆدا بکێشـــێ. تـــەنها ئـــەو شەرعیەتی ئەوەی هەیە حوکمـەکان هـەڵاوێرد بکا و دیاردەکان ناوبنێ سەبارەت بەوەی کامیـان خـراپ و کامیــان باشــن، کامیــان ڕەواو کامیــان نــاڕەوان. تەنانـــــەت یاســـــا مەدەنیـــــەکانیش بەرهـــــەمی پەیمانبەســتنی هاوولاتیانــە لــە ئاســت دەســەڵاتی ڕەهــای فــەرمانڕەوادا کەســنورەکانی مــاف و ئــەرك دەستنیشـان دەکـا و نـاوی یاسـایی و مـەدەنی لـە دیـــاردەو ڕەفتـــارە جیاوازەکـــان دەنـــێ. یاســـا مەدەنیـەکان لـە دیـدی هۆبسـدا "بـریتین لـەو بنـەما گشـتیانەی کـە دەوڵـەت بڕیاریـان لەسـەر دەدا، جـا

ئیتر ئەو بڕیاردانە لـە شێوەی فـەرمانێکی نوسـراودا بێ یان فەرمانێکی وتراودا بێ، یـان لـە شـێوەی هـەر ئاماژەیەکدا بێ کە گوزارشت لە ئیرادەی فـەرمانڕەوا بکـا، لــە پێنــاو جیاکردنــەوەی شــتە ڕەواکــان لــە ناڕەواکـان"[20]. بـەڵام گـەر فـەرمانڕەوا سەرچـاوەی یەکەمی بڕیاردان بێ لەسەر یاسا مەدەنیـەکان، ئایـا ئەگــەری ئــەوە لــە ئــارادا نیــە کــە ئــەو یاســایانە پێچــەوانەی یاســای سروشــتی بــن؟! هــۆبس وەڵام دەداتــەوە و دەڵــێ ئــەو یاســایانە بەگشــتی کــۆکن لەگەڵ یاسای سروشتیدا چونکە یاسای سروشتی کـە لەسـەر بنـەمای هێـز دامـەزراوە دژی هاوسـەنگی ڕاگــرتن و دادپـــەروەری نییـــە، چـــونکە ئاشـــتی بـەرەنجامی هێـزە نـەك لاوازی، دادپـەروەری زادەی ســـــەرکەوتنە نــــەك شکســـــت. واتـــــە هـــــەموو سەرکەوتنێکی گـەورە و هـەموو پیادەکردنێکی هێـز ئـەو یاسـایانە دەخەنـەوە کـە کـۆکن لەگـەڵ یاسـای سروشتی و یاسای مەدەنیدا، چونکە گـەر ئاسایش و ئاشتی مەرجی پێشوەختی جێگیرکردنی یاساکان بــن، ئــەوا ســەرکەوتن و جێگیرکردنــی دەســەڵات مــەرجی پێشــوەختی ئاشــتی و ئاسایشــن. هــۆبس لەمبارەیـەوە دەنوسـێ و دەڵـێ: "یاسـای مـەدەنی و یاسای سروشتی دژی یەکتر نین، بەڵکو دوو فۆرمی جیــاوازی یاســان: یــەکێکیان نوســراو (مــدون)ەو نـاونراوە یاسـای مـەدەنی و یـەکێکیان نەنوسـراوە و نــاونراوە یاســای سروشــتی. بــەڵام ڕەنگــە مــافی سروشتی، واتـە ئازادی سروشتی مرۆڤ، هەندێجار لە ڕێگەی یاسا مەدەنیەکانـەوە سنوردار بکـرێ. بـە وشەیەکی تر کەسی یاسادانەر هیچ مەبەستێکی نیە لە دانانی ئەو جۆرە سنورانە جگە لەو بنەمانەی کە ئاشتی بەرقەرار دەکەن. مەبەستی دانانی یاساکان لــە جیهانــدا هــیچ نییــە جگــە لــە ســنوردارکردنی ئازادیی سروشتیی تایبـەت بـە تاکـەکان، نـەك تـەنها

لەبەرئەوەی لە ڕێگەی پیادەکردنی ئەو ئازادیانەوە زیان بە یەکتر نەگەیەنن، بەڵکو لە پێناو دەستەبەرکردنی هاریکارییاندا لە نێوان یەکتریدا و یەکگرتنیان دژی دوژمنی هاوبەش"[21].

ڕەنگە یەکێك بپرسێ گەر فەرمانڕەوا شەرعیەتی ڕەهای هەبێ لە دەرکردنی یاسادا ئەوا هەمان شەرعیەتی هەیە لە ڕەتکردنەوەی ئەو یاسایانەدا کە پێشتر دەریکردوون. ئەڵبەتە ئەم پرسیارە ڕاستە، بەڵام فەرمانڕەوا تەنها بۆ گەمەکردن یاساکان دەرناکاو یاساکان پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ئەو یاسایانە دەربکا کە خەڵکی دەتوانن پابەندیان بن. گەر ئەوە نەکا ئەوا ڕێگە خۆشدەکا لەبەردەم پشێوی و نکوڵیکردن لە یاساکان و سەرەنجامیش دژی خۆی یاسا دەردەکا. بۆیە دەبێ فەرمانڕەوا ئەو یاسایانە دەربکا کە بەر لە خەڵك خۆی پابەندیان بێ، چونکە کەسێك خۆی ناپابەند و نادەروەست (نامولتەزیم) بێ ئەوا توانای ئەوەی نییە داوای پابەندبوون و دەربەستبوون لە خەڵکی بکا. بە مانایەکی تر "توانای پابەندکردن خۆی لە خۆیدا توانای پابەندبوونە"[22]. بەڵام فەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵاتی ڕەها خۆی، بە هەڵبژاردنی خۆی، پابەند دەبێ نەك بەپێی دەقێکی یاسایی. ئەوەش جیاوازی نێوان پابەندبوونی ڕەعیەت و پابەندبوونی حاکمە، کە یەکەمیان وەك ئەرکێکی یاسایی پابەندە بەرامبەر دەوڵەت، بەڵام دووەمیان وەك شێوەیەك لە میهرەبانی و بەخشین لە بڕێك لە دەسەڵاتە ڕەهاکانی خۆی خۆش دەبێ. سەرەنجام پابەندبوون لەلایەن هەرکەسێکەوەبێ و هەر ناوێکی لێ بنرێ دەبێ بوونی هەبێ وەك مەرجێکی سەرەکی پایەداربوونی ئاشتی.

ئەڵبەتە هۆبس تیۆریزە بۆ دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەت دەکا لە چاخی مۆدێرندا، لە سەردەمێکدا کە دەوڵەت دەبێتە خاوەنی ئەو هێز و دامودەزگا و کەرەستانەی کە دەتوانێ ئەو بڕیارە یەکلاکەرەوانە دەربکا کە پێشتر نەیتوانیوە دەریانبکا. واتە هۆبس تیۆریزە بۆ دەوڵەتی تۆتالیتاری دەکا، کە فۆرمێکی نوێی دەوڵەتە لە سەردەمی مۆدێرنداو ماف بە خۆی دەبەخشێ لە پێناو سەقامگیرکردنی ئاسایشدا دەستوەرداتە هەموو ئەو شوێنانەوە کە پێشتر بەهۆی لاوازیی دەسەڵاتی ئیجرایی دەوڵەتەوە نەیتوانیوە دەستیان تێوەردا. تەنانەت بۆی هەیە دەستوەرداتە کاروباریی فیکری و پەروەردەیی و ئاینییشەوە کاتێ دەبینی بەرژەوەندیی گشتی ئەوە دەخوازێ. لێرەوە هۆبس تیۆریزە بۆ ئەوە ناکا کە دەوڵەت خاوەن ئایدیۆلۆجیایەکی دیاریکراوبێ، بەڵکو پێی وایە دەبێ بە گوێرەی ئاین و بیروباوەڕی خەڵکی دەوڵەتیش بڕیار لەسەر ئەوە بدا کە چ ئایدیۆلۆجیا و چ ئاین و ئاینزایەك ڕەسمییە و کامیان لە سنوری یاساداین و کامیان لە دەرەوەی یاسادان[23].

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشێ کە ئایا هۆبس لە سایەی ئەم تیۆرە کۆنکرێتییەدا هیچ باوەڕێکی بە ئازادی، بەتایبەتی ئازادی تاکەکەس هەیە. لە وەڵامدا هۆبس دەڵێ لە هەر شوێنێك و لە هەر سیاقێکدا یاسابوونی هەبوو ئەوا ئازادی بوونی نیە یان لە باشترین حاڵەتدا سنوردارە. بەدەر لەوە لەهەر شوێن و سیاقێکدا یاسا بوونی نەبوو ئەوە مانای ئەوەیە ئازادیەکان تا ئەوپەڕی کراوەن. بە دەربڕینێکی تر "ئازادی واتە بێدەنگ بوونی یاسا"[24]. واتە مەرج نیە یاسای دابینکردنی ئازادیەکان هەبێ، چونکە لەو شوێنەدا کە دەسەڵات ئازادی دابین دەکا دەرکردنی یاسا پێویست ناکا بەڵکو بێدەنگبوون پێویست دەکا.

ئەڵبەتە تۆماس هۆبس وەك زۆربەی بیریارانی سەردەمەکەی لە ژێر کاریگەریی (فیزیای نیوتن)دا بوو، کە بڕوای بە جووڵەی بەردەوامی تەنەکان هەیە تا ئەو شوێنەی ڕێگر دروستدەبێ. بۆ نمونە هەسارەکان و تەنە ئاسمانیەکان و دیاردە سروشتیەکان لە جووڵەی بەردەوامدان تا ئەو شوێنەی ڕێگرێکی فیزیایی دەیانوەستێنێ یان ڕەوتی جووڵەیان دەگۆڕێ. مرۆڤیش بوونەوەرێکە لە جووڵەی بەردەوامدایە و لە هەوڵی ئەوەدایە پراکتیزەی ئازادی ڕەهای خۆی بکا تا ڕێگر دروستدەبێ کە لە جووڵەی دەخا، واتە دەیکوژێ، یان ناچاری دەکا ڕەوتی جووڵەی خۆی بە ئاراستەیەکدا بەرێ کە کێشە بۆ خۆی و بەرامبەرەکەی دروست نەکا. مرۆڤی شارستانی کەسێکە دەزانێ کە ڕێگرییەکان زۆر لەوە زیاترن کە ئەو بتوانێ بوونەوەرێکی ئازاد بێ، واتە مرۆڤی شارستانی –لە دیدی هۆبسدا– بوونەوەرێکی ئازاد نیە، بەڵکو بوونەوەرێکی دەربەست و پابەندە لە ناو تۆڕی دەزگا و یاسا مەدەنیەکاندا، تەنانەت بەڕاشکاوی دەڵێ: "ئازادی زیاتر لەگەڵ ئیرادەی دڕندەکاندا دەگونجێ نەك ئیرادەی هاولاتیاندا"[25].

بەڵام سەرباری ئەم هەقیقەتەش، ئەو ئازادییە ڕێژەیی و سنوردارەی کە لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا هەیە باشترە لەو ئازادییە ڕەهایەی کە لە دۆخی سروشتی و دڕندەییدا هەیە، چونکە بەردەوامترەو زامنی مانەوەی مرۆڤ دەکا وەك بوونەوەرێکی بایۆلۆجی. بە مانایەکی تر ئازادی لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا لە رووی چۆنایەتییەوە بچووك و کەمە بەڵام لە رووی چەندایەتی و کاتەوە زۆرتر و درێژترە، بە پێچەوانەی ئازادی لە دۆخی سروشتیدا کە ڕەهایە بەڵام زۆر کورت و بێ ئەنجامە.

هەر لە ژێر کاریگەری لۆجیکی فیزیای نیوتندا، هۆبس پێیوایە دەوڵەتی مەدەنی دەوڵەتێکی پتەوتر و میکانیکی ترە تا دۆخی سروشتی کە دۆخێکە هیچ یاسایەکی دیاریکراو جڵەوی ناکا. چونکە پەیوەندیی نێوان تاك و تاك، تاك و گروپ، گروپ و گروپ ودەوڵەت و هاولاتیان پەیوەندییەکی میکانیکییە، پەیوەندیی نێوان: هۆکار و هۆ ئەنجام (علە و معلول)ە. هەرچەندە لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ دەتوانێ هۆکار (علە) دروست بکا، بەڵام چاوەڕێی ئەنجامی کارەکانی ناکا و بەمجۆرە پەیوەندییەکی ناهاوسەنگ لە نێوان کردار و پەرچە کرداردا دروست دەبێ و مرۆڤ یان لەناودەچێ یان لە دۆخێکی زۆر سەخت و نالەباردا دەژی. لەبەر رۆشنایی ئەم دیدە دەکرێ بڵێین: هۆبس جیاوازی لە نێوان ئاژەڵان و دیاردە سروشتیەکاندا دەکا بەوەی لە سروشتدا پەیوەندیی نێوان هۆکار و هۆئەنجام پەیوەندییەکی خۆڕسك یان غەریزییە، بەڵام لە مرۆڤدا ئەنجامی تێگەیشتن و شیکردنەوەی لۆجیکییە. بۆ نموونە رەوتی ئاو رەوتێکی سروشتی و بەردەوامە تا ئەو شوێنەی بەربەستێك یان بەنداوێك دێتە پێش.. لەو کاتەدا هۆکارێك دێتە پێش کە هۆئەنجامەکەی ئاشکرایە، یان ئاوەکە دەگەڕێتەوە یان هەوڵدەدا ڕێگرەکە تێپەڕێنێ، یان هەوڵدەدا کەلێنێکی تر بۆ تێپەڕبوون بدۆزێتەوە. بە هەمان شێوە کردار و پەرچەکردار لە ئاژەڵاندا ملکەچی هەمان لۆجیکی هۆکار و هۆئەنجامە، بۆ نمونە ئەو ئەرکانەی هەنگ لە شانەدا جێبەجێیان دەکا بە گوێرەی یاسایەکی میکانیکی دەڕوا بەڕێوە. بەڵام مرۆڤ بە پێچەوانەوە هەمیشە پێویستی بە دیسپلینی ئەقڵی هەیە تا کردارەکانی بە پەرچەکرداری ماڵوێرانکەر و کوشندە کۆتایی نەیەت. ئەڵبەتە ئەم دیدە قابلی مشتومڕە چونکە

هەموو دیسپلینێکی ئەقڵی بەرەنجامی تاقیکردنەوەی هەڵەیەکە کە مرۆڤ پێشتر تێیکەوتووە، مێژوی گەشەی مرۆیی مێژوی هەڵەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانە. گەر ڕێ بگیردرێ لە مرۆڤ هەڵە بکا ئەوا ڕێگەی لێ دەگیردرێ داهێنان بکا، چونکە داهێنان واتە ئەزموونکردنی ئەو کردارانەی کە ئەنجامەکانیان هێشتا ئاشکرانین. واتە بۆ ئەوەی دەوڵەت بوونەوەرێکی میکانیکی پەتی نەبێ و لە گەشەی بەردەوامدا بێ دەبێ هەمیشە مرۆڤەکان هەڵگری بڕێك لە ئازادیی سروشتی و توخمەکانی کۆمەڵی سەرەتایی بن، تا چاوگەکانی ئازادی و داهێنان بە تەواوی کوێرنەبنەوە[26].

دواجار هۆبس بیریارێکە لە سیاقی خۆیدا بیردەکاتەوە و خاوەنی پاساوی واقعییە دژی هەموو ئەو دیدە یۆتۆپیانەی کە بەناوی ئازادییەوە مرۆڤ تووشیماڵوێرانی زیاتر و کوشتاری زیاتر دەکەن. هۆبس فەیلەسوفێکی ماتریالیستە و دیدی بۆ دەوڵەتیش دیدێکی ماتریالی پۆزەتیڤیستە، پێیوایە دەوڵەت بوونەوەرێکی ئەفسانەیی نیە بەڵکو بوونەوەرێکی واقعی و مادییە کە یاسای میکانیکی جڵەوی دەکا و دەبێ مرۆڤ بەشێوەیەکی واقعی پێکهاتەو جووڵەکانی بخوێنێتەوە تا ئەنجامی واقیعی دەست بکەوێ و پلانی واقعی پێشنیار بکا.

## پەراوێزەکان

(1) تاریخ الفكر السياسي الحديث، د.عبدالرضا حسين الطعان. بغداد: دار الحكمة، 1992، ص106.

*(2)Samuel I. Mintz, The Hunting of Leviathan: Seventeenth-Century Reactions to the Materialism and Moral Philosophy of Thomas Hobbes. England, Cambridge: Cambridge University Press, 1970, p,1.*

(3) تاريخ الفكر السياسي الحديث، ص106-107.

هەروەها بڕوانە:

*Thomas and the Political Philosophy of Glory. Gabriella Slomp. England; Houndmills: Macmillan, 2000, p.58.*

(4) تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم، بيروت: دار القلم، ص51-52.

(5) تطور الفكر السياسي، جورج سباين. ترجمة راشد البراوي. الكتاب الثالث، القاهرة- نيويورك: مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، 1971، ص628.

(6) تاريخ الفكر السياسي الحديث، سبق ذكره، ص113.

(7)المصدر نفسه، ص113.

(8) الصدر نفسه، ص116.

(9) تاريخ الفلسفة الحديثة، مصدر سبق ذكره، ص56.

(10) تطور الفكر السياسي، جورج سباين، ص631.

(11) بڕوانە: تاريخ الفكر السياسي الحديث، سبق ذكره، ص117-118.

(12)وەرگیراوە لە: جورج سباين، تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث، ص634.

(13)بڕوانە: جان توشار، تاريخ الفكر السياسي. ت: د. علي مقلد. ط1، بيروت: الدار العالمية، 1981، ص262.

(14) وەرگیراوە لە: تاريخ الفكر السياسي الحديث، د. عبد الرضا حسين، ص120.

(15) بڕوانە: المصدر نفسه، ص121-122.

(16) المصدر نفسه، ص123.

(17) کتێبی ئەژدیها (لیڤیتیان) وەرگیراو لە: جورج سباين، المصدر السابق، ص634.

(18) بۆ نموونە دەکرێ سۆسیۆلۆجیای سیاسی لای ماکس فیبەر بخوێنینەوە کە پێی وایە "مرۆڤ بونەوەرێکە وابەستەی ئەو تۆڕی مانایانەیە کە خۆی بۆ خۆی

دەچنێ"، واتە پابەندبوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی تەنها پابەندبوونێکی زۆرەملێ نیەو تەنها لەژێر کاریگەریی جەبرە فیزیاییەکاندا روونادا، بەڵکو زۆرجار ئارەزوومەندانەیەو بەرهەمی پرسە رەمزی و کولتورییەکانی مرۆڤە. جان فرانسۆ بایار کتێبی (وەهمەکانی شوناس) بەو قسەیەی فیبەر دەست پێدەکاو لە نەسکی دووەمی هەمان کتێبدا باس لە ئەفسانەی هاوبەش و ئاین و کتێبی پیرۆزی هاوبەش دەکا وەك فاکتەرێکی دروستبوونی ستراکتوری نەتەوەیی. بڕوانە: جان فرانسوا بایار، أوهام الهویة. ت: حلیم طوسون. ط1، القاهرة: دار العالم الثالث، ص5، 81-89.

(19) بڕوانە: جان توشار، تاریخ الفکر السیاسي، ص263.

(20) تاریخ الفکر السیاسي، د. عبدالرضا حسین، ص126-127.

(21) تۆماس هۆبس، وەرگیراوە لە: المصدر نفسە، ص127-128.

(22) تۆماس هۆبس، وەرگیراوە لە: المصدر نفسە، ص128.

(23) بڕوانە: المصدر نفسە، ص130-131.

(24) المصدر نفسە، ص131.

(25) تۆماس هۆبس، وەرگیراوە لە: المصدر ذاتە.

(26) دەربارەی کاریگەریی نیوتن لەسەر تێزەکانی هۆبس بڕوانە: المصدر نفسە، ص132. هەروەها بڕوانە: امیل برهییە، تاریخ الفلسفة- القرن السابع عشر، الجزء الرابع. ت: جورج طرابیشي. ط1، بیروت: دار الطلیعة، 1983، ص178-180.

# ڕۆژێك لە ئەسینای دێرین
# -5-

ولیەم داڤیز

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

## دابونەریتی ئەسینا

### پۆشاکی باوی ئەسینایییەکان

لە هەموو سەردەمێکدا، جلو بەرگ تایبەت بووە بە ژنان. ئەمە بۆ ئەسیناش دروستە، وەلێ دواتر ئەمە گۆڕا. تا ئەمڕۆش ئافرەتی یۆنانی ڕەنگی "کەتانی نەرم پەمەیی" پەسەند دەکات کە زۆر درێژترە لەوەی هاوسەرەکەی دەیپۆشێت، ئیتر یەکێك لە پرسیارە هەرە گرنگەکانی کەسێکی ئەسینایی ئەوەیە "چۆن خۆم بگۆڕم؟"

دیسانەوە ژینگەی ئەسینا وەکو فاکتەرێك بەشداریی دەکات، ئەم جارەیان لە گرفتی سندوقی پۆشاکدا. دوو شێوازی پۆشاك پۆشین جیهانی کردبوو بە دوو بەشەوە، ئەو پۆشاکانەی لەبەردەکرێن‌و ئەوانەی لەخۆوە دەئالێنرێن. شێوازی نێوداری چاکەت‌و پانتۆڵ‌و پێچ‌و پەڕپەڕەکانی لای ئەسینایییەکان بەتەواویی نەناسراو نیە، دوژمنە دێرینەکانیان، فارسەکان، ئەوانەیان پۆشیوە[1]. وەلێ ئەو پۆشاکە ناهەموارو ناجۆرانە بەچاوی سووك سەیریان دەکراو بە پۆشاکی بەربەرییەکان دادەنران. ئەو پۆشاکانە هەر بە شتێکی بیانی‌و سەمەرە سەیریان نەدەکراو بەس، بەڵکو لە حاڵەتەکانی کتوپڕی‌و ناکاوییدا بە زەحمەت دادەکەندران‌و بواریان نەدەدا مرۆڤ بە ئاسانی کارێکی خانەدانانە بکات. ئەسینایییەکان ئەو شێوازەیان پێڕەو دەکرد کە جلەکان لە خۆوە دەئالێنران، کە دواجار یەکێك یان دوو پارچەی خڕ بوون لێزانانە بە دەوری لەشدا بادەدران‌و بەهۆی چەند گیرەیەکەوە چەسپ دەکران کە لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا لێدەدران. بێشك ئەم نەریتە پاساوی خۆی هەیە، چونکە دەتوانرێت بە سانایی بکرێت بە چارۆکەو دەشتوانرێت بکرێت بە بوخچە، یان بە شێوەیەکی لێزانانەو بە چەند جووڵەیەك وای لێبکرێت ببێت بە پۆشاکی کار. بە سانایی دەتوانرێت وەها لێبکرێت کە جوان بنوێنێت، ئەوەی کە تەواوی ئەسینایییەکان بەلایانەوە گرنگەو

بایەخی پێدەدەن. ڕاستە ڕۆژە ساردەکانی ناوەڕاستی زستان دەبینرێن بەوێدا دەڕۆن و دەلەرزن، بەڵام لە ئاتیکای هەواخۆشدا ڕۆژانی سارد کەمن و ڕۆژە گەرمەکان زۆرن[2].

ئەم نەریتە سادەیە چەند سەرەنجامێکی زۆر گرنگی لێکەوتۆتەوە. لەڕاستیدا ئەسینا بەرگدرووی لێنیە، ئەوەی هەیە بازرگانی پۆشاك، جل شۆر زەڕەنگەریان هەیە. پاشان مۆدێلەکان (لانیکەم لە بڕینی پۆشاکدا) بە دەگمەن دەگۆڕێن. جبەیەك لە سەردەمی ئەڵسابایدێسدا دروستکرابێت (با بڵێین 420 پێش زایین) دەتوانرێت زۆر بە سانایی لە ساڵی (360 ی پێش زایین) دا بپۆشرێت، بەو مەرجەی ئەوەندە نەپۆشرابێت کە دابخورێت و ڕەنگەکەی بڕوات یان مۆرانە تێینەدابێت.. شتێکی زۆر ئاسایی دەبێت ئەمساڵ پۆشاکەکانی پار بپۆشیت کە کەمێك تەسکبوونەتەوە یاخود کورت بوونەتەوە بە بەرت، مەسەلەکە مەسەلەی گۆڕینی جێگای دەرزی و سنجاقەکانی سەر کەمەرە.

لە ئاکامدا مرۆڤی ئەسینایی بە دەگمەن خەمی قاتەجلی بەهار یان زستانی دەخوات. پۆشاکە خورییە سادەکەی ماوەیەکی زۆر بەرگەدەگرێت و زۆرجاریش ژنەکەی و کۆیلە کچەکانی پینەوپەڕۆی دەکەن و بۆی دەدورنەوە. بێشك تەنانەت پیاوێکی نەداراش هەر هەوڵ دەدات کەمێك گۆڕانکاریی لە پۆشاکیدا بکات، شتێکی زبرو ناخۆش کە ڕۆژانە لەبەری دەکات، بیگۆڕێت بە خورییەکی نەرمترو ڕەنگێکی کراوەتر بۆ فێستیڤاڵە تایبەتی و گشتییەکان بیپۆشێت. پیاوی دەوڵەمەند سندوقێکی زۆر گەورەی پۆشاکی دەبێت و شانازیی بەوەوە دەکات کە بە یەك جلەوە زۆر نابینرێت. بەڵام تەنانەت لێرەشدا زۆرجار سەروسیمای لەگەڵ ئەو پۆشاکانەدا نایەنەوە کە دەیانپۆشێت.

## چیتۆن و هیماتۆن و چلامیا

پۆشاکی پیاوانەی ئەسینا تەنها دوو پارچەیە چیتۆن و هیماتیۆن دەپۆشن. دەتوانین بە سادەیی بڵێین چیتۆن بریتیە لە پارچە خورییەکی ڕێسراوی لاکێشەیی کە بەشی ئەوەندە دەکات لە خوار ئەستۆوەو تا دەگاتە ئەژنۆکان بپێچرێت. بەشی سەرەوەی بە گیرەیەکی جوان قاییم دەکرێت کە لە زێڕ یان زیو دروستکراوە. لە لای چەپییەوە دەلاقەیەك هێڵراوەتەوە بۆ ئەوەی قۆڵی پێدا بکرێت. کەمەربەندیش دەبەسترێت و ئەگەر کەسێك پێیخۆش بێت دەتوانێت دامەنی چیتۆنەکەی پێدا هەڵبکیشێتەوەو بەودیودا شۆڕی بکاتەوەو وەکو بلوسێکی لێبکات. پیاوی وریاو وریاو تەڕدەست، سەرباز، گەشتیار، کارگەر بەباشی کەمەری خۆیان دەبەستن، چیتۆنەکانیشیان هەڵدەکێشن. بەڵام پیاوی پیری وریاو کاوەخۆ کە بە نازێکەوە بە ئاگۆرادا خۆی ڕادەنێت، گفتوگۆ لەسەر هونەری شیعر یان بەڕێوەبردنی شار دەکات، ئەوە چیتۆنەکەی خۆی تا دامەن بەردەداتەوە. بە دەگمەن ڕێکەوت دەکات ئەم پۆشاکە سادەیە سەردەستیشی بۆ زیادبکرێت، ئەو سەردەستانە بە کردەوەیەکی ژنانە لەقەڵەم دەدرێن و بە شتێکی لایەق سەیر ناکرێن. ئەگەر کەسێك دەستی سەرمای بوو دەتوانێت بە هەڵکێشانی دامەنەکەی و پێچانی لە قۆڵیەوە خۆی گەرم بکاتەوە.

پیاوێکی خانەدانی ئەسینایی کاتێك لە ماڵەکەی خۆیدابێت، جگە لە چیتۆنەکەی هیچی دی ناپۆشێت، زۆرجاریش لەسەر شەقام دەبینرێت کە

لەوە زیاتری نەپۆشیوە، وەلیّ بەشێوەیەکی گشتی جبەیەکی دەرەکیش دەدات بەسەریدا — واتە هیمەیشنەکەی. هیمەیشن تەنانەت لە چیتۆنیش سادەترە. زیاتر لە شالێکی لاکێشەیی خورییە، گەلێك ڕێگا هەیە بۆ پۆشینی بە پێی ئەو بۆنەیەی لەگۆڕێدایە، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی بەبێ دەرزی دەپۆشرێت، ئەویش بە لولدانو پێچانی بەدەوری جەستەدا لەگەل هێشتنەوەی یەکێك لە دەستەکان بە ئازادی بۆ ئەوەی چمکەکەی دیکەی بگرێت، ئەمەش پەیوەستە بەو کەسەوە کە دەیپۆشێت، واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسە پێویستی بەوە نیە کاربکات، بۆیە بەشێوەیەکی جوان دەستەکانی خۆی شەتەك داوە[3]. ڕێکخستنی هیمەیشن هونەرکارییەکی زۆری تێدا دەکرێت. پیاوە دەوڵەمەندەکان کۆیلەی تایبەتییان هەیە کە کاریان ئەوەیە پێچو قەدەکانی هیمەیشن بەجوانی ڕێکبخەن، پێشئەوەی بکەوێتە ڕێ بەرەو شوێنە گشتییەکان، ئەگەر بەجوانی خۆی ساز نەکات وەك کەسێکی کەمتەرخەمو بێموبالات دێتەپێشچاو و شکۆو ویقاری نابێت.

ئەسینایییەکان پۆشاکێکی دیش دەپۆشن. ئەو پیاوە لاوانەی دەیانەوێت زۆر گورجو گۆلّو کاراو گەشتیاری ڕاستەقینە بێنە بەرچاو، ئەوانە کلامیس دەپۆشن کە جۆرە پۆشاکێکی خڕیلانەیە کە بەسەر شانەکانیاندا پێچی خواردووەو بۆ کەشوهەوای خراپ پارێزەرێکی چاکە. ئیتر پۆشاکی پیاوان هەر ئەوەندەیە. کراسیان نییە (جگە لە چیتۆن)، جلی ژێرەوە ناپۆشن. لە نەریتی ئەواندا، وەك لە زۆر شتی دیکەشدا، ئەسینایییەکان، ئەوەش دەبەنەوە بۆ سەرقالّییان بە نیکییەوە.

## پۆشاکی ژنانە

پۆشاکی ژنانیش وەکو هی پیاوان وایە، بەلاّم بێشك لەو ئالۆزترە. ئەوانیش چیتۆنیان هەیە[4]، کە دەسڕەنگینانەتر چنراوە، بەتایبەتی لە هونەرکاریی سەر بلوسەکەیدا، بڕێکی زۆرتر چنینو نەخشکاریی تێدادەکرێت[5]، نەك تەنها لە دەرزیو سنجاقەکانیاندا.

چیتۆنی ژنان ڕێکخستنو ئامادەکردنی زیاتری دەوێتو زۆرجار نیوقۆلّیشە، قۆلّی درێژیش شتێکی دەگمەن نیە. خاتوونی یۆنانی ناتوانێت لاسایی هاوسەرەکەی بکاتەوە بە تەنها چیتۆنێکەوە بچێت بۆ شوێنە گشتییەکان. بەلکو پێویستە هەر ئەوەندەی قاچی خستە ئەودیوی دەرگاکەوە هیمەیشنێکیش بپۆشێت.

ئەمە هەموو پۆشاکی ژنانەیە، دیارە لە چاو هی پیاواندا زیاتر چنینکاریو ڕازاندنەوەو نەخشاندنی دامێنو پەڕپەڕەو شتی وای زیاتری تێدا دەکرێت. خامی ئەسینایی لە ڕێکخستنی پۆشاکەکەیدا، زۆر وابەستە نیە بە مۆدێلە سواوەکانەوە. هەموو جارێکی خۆ ئارایشتدان دەرفەتێکە بۆ ئەوەی بە چەندین شێوە خۆی جوان بکاتو نازو عیشوە بنوێنێت، کە خۆشی چاکی لێدەزانێت. خاتوون هەرئەوەندەی کەمترین بەهانەی دەسکەوت بۆ ئەوەی لە مالّ بچێتە دەرەوە، ئەوە خزمەتکارو لەلەکانی ماوەیەکی باشیان هەیە بۆ ئەوەی کاربکەن، خانمیش لەبەردەستیاندا بە باوەشێنێکی لە پەڕی تاووس دروستکراو خۆی فێنك دەکاتەوە، یەکێکیان بە ڕێکخستنی قژیەوە خەریکە، یەکێکی دی ئاوێنە خڕیلانەکەی لەبەردەمیدا ڕاگرتووە، سێهەمیان سنووقی خشلّو زێڕوزیوەکەی هێناوەوە بۆ ئەوەیخاتوون ئەنگوستیلەو گوارەو بازووبەندی

زێڕین هەڵببژێرێت، ئەو زریزانە دیاری بکات کە دەیانکاتە گەردنیو دەیاندات لە قژی، لەگەڵ ئەو گوڵەدەرزیلە تاییبەتییانەی دەیاندات لە سنگو بەرۆکی تا پۆشاکەکانی بەری پێ ڕاگیر بکاتو توندیان بکاتەوە. کە تەکان دەداتە خۆی بۆ هەستان هیمەیشنەکەی بە دەوریدا بڵاودەبێتەوەو چۆنێتی ڕاوەستانی پۆشاکەکەی کەسێتیو ڕەسەنی دیاری دەکات. ئافرەتێکی بەویقارو سەنگین هیمەیشنەکە بە دەوری خۆیدا لوول دەداتو تا دامێن شۆڕی دەکاتەوە، هەردوو قۆڵیو هەردوو دەستیشی دادەپۆشێت، تەنانەت دەیکێشێتە سەریشەوە بۆ ئەوەی تەنانەت سەریشی بپۆشێتو بە تەنها چاوەکانیو لووتی بەدەرەوە دەمێنن.

ئافرەتە لاوەکان بەجۆرێك لە خۆیانی دەئاڵێنن کەمەرو شانیان بەدەرەوە بێتو جوانییەکانیان بەرچاوبێت. لە گەرمای هاوینیشدا، پۆشاکەکە دەگۆڕێت بۆ شاڵێکی تەنكو بەشلیو ئازادی بەسەر شانیاندا شۆڕدەبێتەوە یاخود جۆرە پەچەیەك کە هەڵدەدرێتەوەو سیما ئاشکرا دەکات.

منداڵانیش هیمەیشنی کورتبۆوەی گەورەترەکان دەپۆشنو فێریش دەکرێن چۆن توندی دەکەنەوەو خۆیان لەسەرما دەپارێزن. لە گەرماشدا دەبینرێن لەو ناوەدا یاریدەکەنو بەحاڵ جلیان لەبەردایە.

## پێ پۆشو سەر پۆش

مرۆڤی ئەسینایی بەگشتی هیچ لەپێ ناکات. بەپێی پەتی بە دەوروبەری ماڵی خۆیاندا دەگەڕێت، جارجارەش بەناو سەوزەگیای دەشتودەردا ڕادەکاتو پێ دەنێت بە خاکی تەڕوبڕی بەهاردا. بەڵام کاتێك لە ئەسینا دەچێتە دەرەوە سەندەڵ دەکاتە پێی، کە جۆرە سۆلێکە بە چەرمێك قاییمدەکرێت کە لە بەینی پەنجەکانەوە دەڕوات. بۆ سەفەری دوور یان بۆ ڕاوشکار شتێك هەیە کە لە بوونی چەرمینی درێژ دەچێت[6]، گومان لەوەدا نیە کە بۆ کاتی ئاسایی دەستنادادتو ناڕەحەتە. وەلێ سەندەل لەگەڵ سادەییشیدا هەندێ نەخشو نیگارو ڕازاندنەوەی تێدا دەکرێت، بە تاییبەتی چەرمی بەستنەکەی بە ڕەنگێکی پرشنگدار ڕەنگدەکرێت.

ئەسینایییەکان پێویستییان بە شتێك هەیە بیکەنە سەریان، گەرچی هێندەی پۆشینی پێیان گرنگ نیە. زۆربەیان قژیان چڕو پڕە، کۆسەیی موسیبەتێکی باو نیە لەوێ، هەمووان وا ڕاهاتوون بە سەری ڕووت بەو ناوەدا بگەڕێن، وەلێ هەندێك کاروپیشە پێویستی بە کڵاو هەیە، بە تاییبەتی سەربازان کە بە کڵاوە بێ لێوارەکانیان دەناسرێنەوە. گەشتیاری خانەدان جۆرە کڵاوێك دەپۆشن کە لێوارەکەی بۆ دەرەوە دەنوشتێتەوە. وەلێ ژنان هیچ شتێك ناکەنە سەر قژە بە سەلیقەو کارامەیی ڕازێنراوەکانیان، گەرچی جارجاریش سەریان پێویستی بە پاراستن دەبێت، وەلێ بە زۆری لەپشتیانەوە ئافرەتێکی خزمەتکار دەڕواتو سایەوانیان بۆ دەگرێت.

## جوانی پۆشاکی یۆنان

پۆشاکی لۆکاڵی یونان، شتێکە بە تەواویی خەسڵەتە تاییبەتییەکانیان دەخاتە ڕوو: هارمۆنی، سادەیی، تاکانەیی. ئاسانە ببینینی ئەو شێوازەی پۆشاك پۆشین بەشێوەیەکی چەند دڵگیرانە لە مۆدێلەکانی پەیکەرسازییدا نمایشکراونەتەوە[7].

وەك لە ئامادەکردنو بەکارهێنانیدا بێقەیدو شەرت بووە، ئاوەهاش هەڵبژاردنی ڕەنگەکەی

بێقەیدو شەرت بووە. گرووپی نێرینەکان بریتی نەبوو لە پێکهاتەیەکی رەشی تۆخ یان قاوەیی یاخود خۆڵەمێشی، وەك گرووهەکانی سەردەمانی دواتر ئاوایان لێهات. بە پێچەوانەوە، رەنگی سپی باوترین رەنگ بوو بۆ هەموو بۆنەیەك‌و بۆ هەردوو رەگەزەکەش[8]، رۆژانی ئاهەنگ تەنانەت پیاوە پیرو بەساڵاچووەکانیش بە چیتۆنی وەهاوە دەردەکەوتن کە دامێنەکانیان بە نەخش‌و دەسترەنگینی رازێنراوەتەوە، هەروەها هیمەیتیای رەنگ سووری تێر، ئەرخەوانی، شین یان زەردیان بەسەردا دەپۆشی. هەروەها لە نەریتی ئارایشتدان‌و رازاندنەوە لە ئاهەنگەکانی زەماوەندا، رەنگی رەش بە دەگمەن بەکاردەهات، ئەو رەنگە زیاتر بۆ ئەو بۆنانە بەکاردەهات کە خەم‌و پەژارەیان پێوە دیار بوو. بۆیە دەشیا لە ئاهەنگەکاندا چیتۆنێکی دامەن پەمەیی بپۆشێت کە لە خوری چاکی ناوچەی میلیسیۆس دروستکرابێت، لەگەڵ هیمەیشنێکی بریقەداری قرمزی، سەندەڵەکانیشی قلیشی شینیان هەبوو، گیرەی زێرین‌و گوڵی وەنەوشەیی لەسەری کێشرابوو. لە کاتی زەماوەندکردندا دەبوو ئافرەت لەوەش زیاتر خۆی تاس‌و لووس بدات‌و سەندەلی سپی گوڵدۆزی لەگەڵ قایشی پیرۆزەیی، یاقوت‌و مرواریپیشی پێوە، ملوانکەی زێرین لە گەردنیدا بە ئەڵقەی قورس‌و بەرین، جۆرەها قەیتان‌و متوموورووی دیکەشی پێوە بوو، گوارەو گوێبەندی سەدەف‌و مرواری، کۆمەڵێك ئەنگوستیلەو خشڵ لە پەنجەکانیدا دەدرەوشانەوە. کۆستمی سەرەکیشی بریتیە لە رەنگێکی زەعفەرانییانەی کاڵ، بەسەر هەمووشیەوە وەکو هەور تارای خۆڵەمێشی بووکێنی دەبریسکێتەوە.

## ئارایشتی یۆنان

ئەگەر بە چاوێکی جوانبینانەوە بڕوانین، دەبینین ئەم نەریتی ڕازاندنەوەو ئارایشتدانە، نەجیبترین‌و شکۆدارترین نەریتە لە جیهاندا بینرابێت. بەشێوەیەکی سروشتی چەند بونەوەرێکی بەدمیزاجیش هەن کە چێژ لە شتە جوانەکانی هاوەڵەکانیان وەرناگرن، یان ئەوانەی هەوڵ دەدەن جیهان‌و خودی خۆشیان فریو بدەن‌و بیانگەڕێننەوە بۆ سەردەمی تاریك‌و ئەنگوستەچاوی پڕ شەڕوشۆڕی هێلینییەکان. بەشێوەیەکی تایبەتی ئافرەتانی ئەسینا (گەرچی پیاوان بەدەرنین لە گەمژەیی) زۆرجار حەزیان لە قژو پرچ‌و شتی دەسکردی لەو بابەتەیە. بە زۆریی حەزیان لە قژی قرمزی بوو، ژمارەیەکی زۆر لە خانمە خانەدانەکان سەروقژی سپی خۆیان بە جوانی دەشوشت‌و خۆیان ئامادەدەکرد بۆ بەکارهێنانی قژی دەسکردی قرمزی. لە دەهەیەکەوە بۆ دەهەیەکی دی شێوازی ئارایشتکردنی مووی سەر دەگۆڕاو گۆڕانکارییەکە لە چاو گۆڕانی پۆشاکدا زۆر خێراتر بوو. جارێك دەبێت بە باو قژیان دەکەن بە پرچ‌و لوولی دەکەن، تاوێکی دی وەکو سایکی قژیان بەردەدەنەوەو بە خاوی جێیدەهێڵن، دەبێت ئەوەش بڵێین کە ژنانی ئەسینا تەنانەت لە سەختترین رەوشیشدا جۆرێك لە هەندام‌و ئەدگاری خۆیان جوان رادەگرن. هێشتا یۆنانییەکان فێری هونەری قژ رێکخستنی فارسەکان نەبوون.

هاوکات شاعیرانیش گاڵتەیان بە لایەنە لاوازەکانی رەگەزی نەرم‌و نیان کردووە[9]. یەکێکیان دەڵێت:

ئەو قژە ئاڵتونییەی بەسەری نیکیلاوەیە

هی خۆیەتی؟ کێ وا بیری لێکردۆتەوە
ئەویش سوێند دەخوات کە قژی خۆیەتی،
سوێندەکەشی ناکەوێت
چونکە من دەزانم لەکوێ کڕیویەتی!
یان:
گۆنات بە ڕەنگی گوڵ ڕەنگ کردووە
قژیشت شوشتووە بۆ ڕەنگکردن
بەڵام ڕەنگ‌و شوشتن هەردوکیان بێهودەن
ناتوانن هەوای لاوی ببەخشن
ئەوە هونەرێکی بێ سەمەرە
کە تۆ زۆر کارامەبوویت تێیدا
تۆ هەرگیز ناتوانیت
هیکۆبای پیر بکەیت بە هێلینی لاو

با ئەوەندە بەس بێت لەم پیاهەڵشاخانانە! چونکە نێرو مێ هەردوکیان سەریانکردۆتە سەر ئەو شتە بێهودانە. با ئێمەش بیر لە نەریتی بە ویقارو سادەو ئیستاتیکییانەی ئەسینابییەکان بکەینەوە کە نمونەیەکی بەرچاوە بۆ سەردەمەکانی دواتر.

## کۆیلەکان

کۆیلایەتی بەشێکی دەرکەوتووی ژیانی یۆنانییەکانە. خانمی ئەسینایی لە ناو ماڵەکەیدا بایەخدەدات بە هەموو شتێك، خۆراك، پۆشاك، وەلێ گەورەترین ئەرکی سەرشانی بریتیە لە بەڕێوەبردنی ژمارەیەکی زۆری کۆیلەکان، کە لە هەموو ماڵێکی دەوڵەمەند یان هەبوودا هەن[10].

کۆیلایەتی لە هەموو شوێنێکە: نەك تەنها وەکو خزمەتکاری ناو ماڵ، بەڵکو لەناو کارگەکانیشدا دەستی کارن، بێشومار دووکان‌و فرۆشگەی بچووك بەڕێوە دەبەن، باری کەشتییەکان دادەگرن، لە کانەکاندا ئیش دەکەن، کێڵگەکان دەکێڵن. لە ئاتیکا لەوانەیە، ژمارەی نێرینە کۆیلەکان زیاترن لە ژمارەی نێرینە ئازادەکان، ئەمە شتێکە زۆر لێی دڵنیا نین. زەحمەتە بتوانین ژمارەکانیان تۆمار بکەین، چونکە ئەوان ناچار نین جۆرە پۆشاکێکی تایبەتی بپۆشن، ناشتوانیت لە چاوگێڕانێکدا بزانیت ئایا ئەو پیاوە بەشێکە لە موڵکەکانی کەسێك یان پیاوێکی هەژارە بەڵام زۆر بەخۆی دەنازێت‌و ئەندامێکی گرنگی شاری ئەسینایە.

هیچ فەیلەسوفێکی دەرکەوتووی یۆنان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە باسی کۆیلایەتی نەکردووەو لێینەکۆڵیوەتەوە. چونکە شتێکی ئاسابییە، نا، وا نیە مەسەلەکە پەیوەندی بەو قۆناغەوە هەیە شارستانێتییەکە پێیدا تێدەپەڕێت. ئەرەستۆی فەیلەسوف، تێڕوانینی باو دەربارەی مەسەلەکە زۆر بە روونی دەخاتە روو "چەشنی خوارەوەی مرۆڤ بە سروشت کۆیلەن، باشتریش وایە بۆ هەموو نزمەکان کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئاغایەکدا بن. بەکارهێنان وایکردووە کۆیلەکان‌و گیانەوەرە ماڵییەکان زۆر لە یەکتریی جیاواز نەبن، چونکە هەردوکیان جەستەیان بۆ خزمەتی پێداویستییەکانی ژیان بەکاردەهێنرێن." "خەڵکی ئەسینایی باڵاو بیرکراوەو خانەدان بەشێوەیەکی سروشتی ئاغان." بەربەرییە گەمژەو نەزان‌و مێشك تەمبەڵەکان "نزمن" ئایا ئەوە بڕیارێکی راشکاوی ئاسمان نیە کە ئەسینابییەکان بۆ ئەوە دروستکراون کە فەرمانڕەوا بن، بەربەرییەکانیش بۆ ئەوەی خزمەت بکەن؟ کەس پێیوانیە ئەم بابەتە پێویستی بە ئارگیومێنتێکی سەختە.

بێگومان ناتوانرێت مامەڵەی کۆیلەیەك وەك مامەڵەی گایەك بکرێت، ئەرەستۆ زەحمەتی ئەوە دەکێشێت پێمان بڵێت بۆ ئەوەی نەهێڵێت

"مێگەلەکەت" بیر لە ئازادی بکاتەوە، ئەمەش تەنها بەوەی وای لێبکەیت باشتر کاربکات، فەیلەسوفە مەزنەکەمان لە دوا ئەندێشەکردنیدا پێنج دانە لە سیانزە کۆیلەکەی خۆی ئازاد دەکات. پاشان ئەوەش بە روونی دیارە کە شتێکی خۆشەویست نەبووە لای ئەوان کە نیری کۆیلایەتی بکەنە ئەستۆی یۆنانییەکان. لە راستیدا ئەوەش کراوە، هەموو شارەکان بەشەڕ داگیرکراون، ئەو دانیشتوانەی کە نەدەکوژران وەك کۆیلە دەفرۆشران[11]. ئەو منداڵانەش کە دایكو باوکیان دەسبەرداریان دەبوون، دەکەوتنە دەستی جامبازەکان، ئەوانیش بۆ بازاڕ گەورەیان دەکردن. هەروەها رفاندنێکی بەربلاویش هەبوو لە ناوچە کەمتر شارستانەکانی یۆناندا وەك ئایتۆلیا. بەڵام هێشتا ژمارەی ئەو کۆیلانەی بوون کەم بوو. زۆربەی زۆریان بەربەری بوون. خەڵکانێك بوون لە دەرەوەی شارستانێتی هێلینییەکان لە دایك ببوون.

## بازرگانیی کۆیلە لە یۆنان

دوو سەرچاوەی گەورەی دابینکردنی کۆیلە لەگۆڕێ بوو: هەرێمی ئاسیای بچووك (لیدیاو فریگیا، لەگەل سوریا لە پشتیەوە)، هەروەها ناوچەی دەریای رەش، بە تایبەتی کەنارەکانی باکووریکە بە سکیسیا ناسرابوون. ئەوێ بە کۆمەڵێك بازرگانی دڵڕەق ناسرابوو کە جەستەی مرۆڤیان بە نرخێکی گران دەفرۆشت بە ئەسینا یان شارەکانی دیکەی یۆنان. بەدوای هەموو وردە شەڕێك یان هەڵمەتێکدا بۆ سەر ئەو وڵاتە بەربەرییانە، یەکسەر فرۆشتنی ئەو نەگبەتانەی بەدوادا دەهات کە دەستگیردەکران، بەو جامبازانەی سواری کەشتییان دەکردنو قۆناغ بە قۆناغ دەیانبردن بۆ ئەسینا. ئەگەر شەڕیش نەبوایە، ئەوە بە رفاندنێکی بەرفراوان یان بە جەردەیی ناو دەریا کۆیلەکان پەیدا دەکران[12]. هاتنی گروپە زنجیر بەدەستەکان بۆ کۆتوپێوەندکردنی بەدبەختەکان لە پیریاوس شتێکە رۆژانە روودەدات, هەندێك لەو بونەوەرانە گوێڕایەڵو رام بوون (یان جۆرە پیشەیەك یان کارێکیان دەزانی)، ئەوانە بە نرخێکی بەرز دەفرۆشران. ئەوانەش کە گێل یان کەللەڕەق بوون، ئەوانە تەنها بۆ کاری سەخت باش بوون، مەگەر مەسرەفیان تێدا بکرایەو مەشقیان پێبکرایە. ئەو گێلو نەزانانە بە زۆری دەفرۆشران بە کانەکان، بۆ ئەوەی تا مردن لای خاوەنکارەکان کاربکەنو بەشێوەیەکی بێبەزەییان وەك ئامێر کاریان پێبکرێت، یاخود دەکران بە کۆیلەی سواڵێدانی ناو کەشتی، کە لەوێش چارەنوسیان هەر هەمان شتە. بەڵام پێویست ناکات بەردەوام بین لەسەر ئەم ترسو بیمە.

ئەوانەش کە دەمانەوە بە زۆری لە کێڵگەکان، کارگەکان یان لە ماڵەکاندا بەکاردەهێنران. شوێنێکی تایبەتی هەبوو لە نزیکی ئاگۆرا بۆ مامەڵەپێکردنی کۆیلەکان. زۆرجار لە مەزاتکردندا دەفرۆشران. نرخەکانیان بە پێی جوانی لەشو شانوشەوکەتیان دەگۆڕا[13]، یاخود بەپێی بەهێزیو ئازاییان، یاخود بە زۆریو کەمییان لە بازاڕدا. ئەگەر ساڵێك شەڕوشۆڕ یان هەڵمەتی دژ بە ئاسیای بچووك کەم بێت، ئەو ساڵە "نرخی کۆیلە بەرزە". زینۆفۆن دەڵێت "هەندێك لە کۆیلەکان بە ئاسانی دوو مینایان دەکرد (نزیکەی 650 دۆلار لە ساڵی 2000دا)، هەندێکی دیکەیان بە حاڵ نیو مینایان دەکرد،تیایاندا هەبوو 5 یان 10 مینایشیان دەهێنا. دەڵێن نیکیاسی کوڕی نیکارێتۆس

تالێنتێك (نزیكەی 18000 دۆلاری ساڵی 2000 ی داوە بە كۆیلەیەك كە لە كانێك بینیوێتی[14]. باوكی دیموستێنێس كارخانەیەكی گەورەی هەبوو، 32 كۆیلەی هەبوو شمشێریان دەبڕی هەریەكەیان بایی 5 مینای بوون، لەگەڵ بیستو دوو تەختی نوستن دروستكەردا (بێشك دەستڕەنگینییان كەمترە) كە هەموویان بەسەریەكەوە بایی 40 مینای بوون. كچێكی جوان كە فلوتژەنێكی زرنگیش بوایە، رۆژانە بەكرێ دەگیرا بۆ ئاهەنگەكانی ئێواران، نرخێكی زۆربەرزی هەبوو، كەدەگەیشتە 30 مینای.

## مامەڵەكردن لەگەڵ كۆیلەكاندا لە ئەسینا

گوزەرانی كۆیلەكان چۆن بوو؟ ئەگەر ببـــرایە بۆ كارگە، ئەوە دەبوو رۆژانە چەند سەعاتێكی زۆر بەرامبەر كەمێك خۆراك كاربكات. لەوشوێنێكی وەك كولانەی سەگدا دەژیا، تاقە دەرفەتی حەوانەوەی رۆژانی پشووە ئاینییە گەورەكان بوو، نەیدەتوانی هاوسەر بگرێتو خێزانێكی ئاسایی پێكبهێنێت. دیارە باری گوزەرانی بەسترابوو بە میزاجی ئەو پیاوە ئازادەوە كە كاری پێدەكات، ئەگەر پیشەیەكی بزانییایە ئەوە مامەڵەیەكی باشتری لەگەڵ دەكرا كە زۆر باشتر بوو لەو مامەڵەیەی دواتر رۆمانەكان لەگەڵ پیشەدارەكاندا دەیانكرد.

كۆیلەی ماڵ لە رەوشێكی باشتردا بوو. هەموو كەسێكی ئەسینایی هەوڵیدەدا لانیكەم كۆیلەیەكی هەبێت، كە هەموو كارو زەحمەتەكان لەئەستۆی ئەو بوو. پیاوی خانەدانی مامناوەند دە یان بیست كۆیلەی بۆ پێویستییەكانی خۆی هەبوو. ماڵی وا هەیە پەنجای هەیە. ئەوانە زیاتر خزمەتكارو گەنجینەدارو كارمەندی خەڵوزدان بوون، كۆیلەی كاری بازاڕ، باربەر، نانەوا، چێشتلێنەر[15]، سیستەر یان پێشخزمەتی خاتونان، یان ئاغا لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ گەڕان (ئەگەر بلوایە كوڕێكی جوانو قۆزی هەڵدەبژارد)، مامۆستای منداڵەكان، خێزانە دەوڵەمەندەكان كۆیلەی ئارایشتكردنو مەشقدانیشیان هەبوو. كاری ئاغاژن ئەوەبوو هەموو ئەو بونەوەرانە بەكاركردنەوە خەریك بكاتو سەرپەرشتییان بكات. ئەگەر كۆیلەیەك گوێڕایەڵو زرنگو چوستو دەستڕەنگینو پیشەزان بووایە، گوزەرانی خراپ نەبوو. كۆیلەكانی ئەسینا بڕێكی زۆری ئازادییان هەبوو، زۆرجار ئەوانەی سەردانی شارەكەیان كردووە ئەوەیان پێخۆشنەبووە. لەوانەبوو كۆیلەیەك زۆر بێبەزەییانە داركاری بكرێت، بەڵام ئاغاكەی نەیدەتوانی بە هەوەس بیكوژێت. كۆیلە نەیدەتوانی بچێت بۆ وەرزشگا، یان بۆ ئەنجومەنی گشتی، بەڵام دەیتوانی سەردانی پەرستگاكان بكات. وەكو ئەندامێكی چارەڕەشی ناو خێزان، پشكێكی كەمی بەردەكەوت لە قوربانیدانەكان بۆ خوداوەندان. وەلێ لانیكەم دووچاری نەگبەتییەكی دیار ببوو. ئەگەر لە دادگا داوای ئەویان بكردایە، ئەوە بە ئەشكەنجەدان لێیان دەپرسییەوە. لە لایەكی دیكەشەوە، ئەگەر ئاغاكەی بەشێوەیەكی ناپەسەند خراپەی لەگەڵ بكردایە، دەیتوانی هانا بباتە بەر پەرستگای پیرۆزی سیسیۆس بۆ ئەوەی داوا بكات بیفرۆشن بە ئاغایەكی دیكە. كۆیلە شتێكی دیكەشی لەگەڵ دەكرا، خاوەنەكەی دەیخەساندو دەیكرد بە غولامی خۆی: گێتا، مانێس، درۆمۆن، سۆسیاس، گزانسیاس، پیرهیاس، ئەمانە كۆمەڵێك كۆیلە بوون كە دانیشتوانەكان دەیانناسینەوە.

## ئاغا دڵڕەقەكانو ئاغا میهرەبانەكان

کۆیلایەتی لە ئەسینا، وەك هەموو شوێنێکی دیکە، زۆر پەیوەستە بە کەسێتی ئاغاوە، زۆربەی ئاغا ئەسینایییەکانیش بەدڵرەق‌و بێویژدان لەقەڵەمنادرێن، چونکی حەزیان لە زەریفی‌و میهرەبانی‌و هارمۆنی‌و مامەڵەی خانەدانانەیە، کە ئەوە نیشانەی هاوشاریبوونی چاکە. وەلیٚ ئاغای واش هەیە کە بەردەوام قامچی بەدەستەوەیەو لە کۆیلە داخکراوە کەللەوشکەکانی دەدات‌و ژیانی کۆیلەکانی خۆی بەتەواویی تاڵ کردووە، وەلیٚ ئەمانە دەگمەنن‌و رای گشتی بە باشی بۆیان ناڕوانێت. لە نێوان ئەسینایییە باشەکان‌و کۆیلەکانیاندا پەیوەندییەکی خۆش‌و هاوڕێیانە هەیە، ئاغاکانیان بایەخێکی باشیان پێدەدەن‌و دەزانن بەوە وا لە کۆیلەکانیان دەکەن پەرۆشی بەرژەوەندییەکانی ئەمان بن.

وەلیٚ سیستمی کۆیلایەتی ئەسینا شتێکی شایستە نیەو لەکەیەك دەدات لە شکۆدارییەی لە کاری دەستیی راستەقینەدا بەدیدەکرێت. کۆمەڵێك دابونەریتی زۆردارانەی لای خاوەن کۆیلەکان دروستکردووە، کۆیلەکانیشی زۆر زەلیل‌و بێچارە کردووە. کۆیلە ئەگەر ئازادیش بکرێت، نابێت بە هاوشارییەکی ئەسینا. ئەو کەسێکی مێتیکە، واتە دانیشتوویەکی بیانییە، پێویستە ئاغا کۆنەکەی یان کەسێکی دیکەی ئەسینایی سەرپەرشتیاری بێت‌و هاوکاری بکات لە هەموو جۆرە کاروبارێکی یاساییدا.ئەمەراستییەکی تاڵە کەحاڵەتی کۆیلایەتی قوربانی دەستی خۆبەپیاوزانین‌و شکۆداریی ئەسینایییەکانە. کەس لەئەسینا خەونبەوەوە نابینێت دەزگای کۆیلایەتی هەڵبوەشێنێتەوە و خۆیان بەراورددەکەن بە جڤاتەکانی دی‌و شانازیی بەخۆیانەوە دەکەن کە سیستمی کۆیلایەتیەکەی ئەوان زۆر مرۆڤانەو میهرەبانە.

## ئەسینای شاری کۆیلەکەکان

ژمارەیەکی زۆری کۆیلەکان لە ئەسینا جیاوازن لەو بونەوەرانەی کە باسمانکردن، ئەوانە هەر بەناو کۆیلەن. جڤاتی ئەسیناش وەکو تاکەکان بۆی هەیە خاوەنی کۆیلەی خۆی بێت، وەك چۆن خاوەنی کەشتی جەنگی‌و پەرستگاکانیشە. کۆیلەکانی ئەسینا "دێمۆسیۆی" چەندین جۆری هەیە. نوسەرانی نوسینگەی گەنجینەکان، پشکنەرانی ئەنجومەنە گشتییەکانیش هەموویان کۆیلەن. جەللادەکان‌و ئەشکەنجەدارەکانیش کۆیلەن. لەناو شاردا جۆرێکی دیکەش لە کارگەرە کۆیلەکان هەیە، ئەوانەی سەرقاڵی لێدانی سکەو دروستکردنی پارەن، خەریکن دراخمای زیوین‌و بەشەکانی بۆ شار دروستدەکەن، یان هەندێکی دیکەیان تیرئەندازن یان کوتەکیان پێیەو بەردەوام بەدوای دادوەرانی شارەوەن. لە ئەسینا 1200 دانە لەم کۆیلانە هەیە، شەوانە بەناو شاردا مەفرەزە دەکەن، خراپەکاران دەستگیردەکەن، بە رۆژیش یاساو رێسا لە ئاگۆرادا دەستەبەردەکەن، بەتایبەتی ئەوکاتەی کە ئەنجومەن کۆدەبێتەوە، یان دادگا پشێویی تێدەکەوێت. لەسەر گردی ئاریۆپاگۆس لەمزیکی ئاکرۆپۆلیسەوە نیشتەجێیەکی تایبەت بۆ ئەمانە دروستکراوە. بێشك ئەمانە هەر بە ناو کۆیلەن، ئەمانە چەشنە دیسپلینێکی سەربازییانە لە شاردا دابیندەکەن. ئەمانە کۆیلەن بەڵام ئیمتیازی زۆریان هەیە. ئاسایشی شار پەیوەستە بە پەرۆشی‌و دڵسۆزیی ئەمانەوە. لە کاتی شەڕەکاندا یاریدەدەرن. بۆیە ژیان لەم هێزە پۆلیسییەدا ناهەموارو دژوار نیە و

تەواوی كارگەرانی ناو كارگەو ماڵەكان ئیرەییان پێدەبەن.

## پەراوێزەكان

1-بێشك فارسەكانیش ئەوكاتەی لە ناوچەی ساردو پڕە ڕەشەبای سەرووی ئاسیادا دەژیان، فێری بەكارهێنانی ئەم جۆرە پۆشاكە بوون، پێش ئەوەی لە باشوری گەرموخۆشدا ئیمپراتۆرییەتەكەیان دابمەزرێنن.

2-بێگومان تەواوی شارستانێتییەكەی ئەسینا لەسەر بنەمای كەش‌وهەوا دامەزراوەو پێویستییەكی ئەوتۆیان بە خۆگەرمكردنەوە نیە. لەوانەیە ئاگردان بەكاربهێنرێت بۆ ڕەواندنەوەی سەرمای ناو ژوورەكان لە ڕۆژانی زۆر سارددا. لای ئەسینایییەكان ئەو كەش‌وهەوایەی پێویستی بەوەیە 8 مانگ لە ساڵێكدا خۆیان گەرم بكەنەوە بەكەڵكی مرۆڤی شارستان نایەت.

3-پیاوانی كارگەر زۆر هیمەیشنیان نەدەپۆشی، جۆرێك چیتۆنیان هەبوو (ئیخۆمیس) كە بەجۆرێكی وەها دروستكرابوو دەستەكانیان بە ئازادی بهێڵێتەوە.

4-هەندێجار لە ئەدەبی هۆمێرییدا ئەم جۆرە ڕۆبە پێیوتراوە پیپلۆس.

5-بەگشتی لە هەموو پۆشاكەكانی یۆناندا سنجاق شتێكی پێویست نەبووەو بایەخێكی ئەوتۆی پێنەدراوە.

6-ئەكتەرەكانیش بووتی چەرمی درێژیان لەپێدەكرد بۆ ئەوەی بالآیان بەرزتر ببێتەوە، ئەمە پێیدەوترا كۆسورنۆس.

7-ئەشیلێس تاتیۆس نوسەرێكی درەنگترە لەو سەردەمە، دەڵێت "چیتۆن ببوو بە ئاوێنەی جەستە".

8-گومان لەوەدا نیە كە وەرزێرەكان‌و پیشەوەرەكانیش پۆشاكی مەیلەو قاوەییان پۆشیوە، یاخود با بڵێین جلە سپییەكانیان زۆر چڵكن دەبوون.

9-لەو وردە پەرەگرافانەیە كە لە سەردەمی ڕۆمانەكاندا وەرگێڕدراون. زۆر ڕێتێدەچێت بگەڕێنەوە بۆ سەردەمێكی درەنگتر لەوەی لێرەدا گریمانەكراوە، بەلآم زۆر گونجاون بۆ ئەوەی گوزارشت لە ڕەوشی سەردەمی 360 ی پێش زایین بكەن.

10-ئەسینایییەكان هەرگیز سوپایەكی بێمانا لە كۆیلەی ناو ماڵیان نەبووە، ئەوەی كە لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا بەرچاودەكەوێت، وەلیٚ هێشتا لە گۆشەنیگایەكی مۆدێرنانەوە، ژمارەی خزمەتكارەكانی ناو ماڵەكانیان هەر زۆر بووە.

11-بۆ نمونە، ئەوانەی لە چەنگی پیلۆپۆنیشدا، دوای داگیركردنی مێلۆس مانەوە.

12-بەشێكی كەم بەلآم بەردەوامی كۆیلەكان لە ئەنجامی دەسبەسەركردنی ئەو كەس‌و خێزانانەوە دابیندەكران كە دەكەوتنە ژێر باری قەرزەوە، خاوەنقەرزەكانیان وەك كۆیلە دەیانفرۆشتن.

13-هیچ بازاڕێكی ئەوتۆ بۆ ژنانی پیرو ئەو پیاوە پیرانەش نەبوو كە تەندروستییان خراپ دەبوو، سودێكی ئەوتۆیان نەدەدا. بازاڕی كوڕان‌و كچان لە تەمەنی فێربوونی پیشەدا زیاتر برەوی هەبوو.

*14-Xenophon, "Memorabilia," ii. 5, § 2.*

15-جارجارە ئاهەنگی نانخواردنی فەرمییان دەگێڕاو پێویستییان بە چێشتكەری شارەزا دەبوو، بۆیە یەكێكیان بەكرێدەگرت.

### ڕونكردنەوەیەك:

لە بەشی پێشووی ئەم كتێبەدا، ناونیشانەكەی بە "ڕۆژێك لە یۆنانی دێرین" هاتووە، دیارە، ئەوە هەڵەیە و هەڵەكەش هی منە، نەك گۆڤاری سەردەم. داوای بەخشین لە خوێنەرانم دەكەم.

وەرگێڕ

# به جیهانیکردن و شوناس له نێوان زانست و ئایدیۆلۆژیادا

**محەمەد عابد ئەلجابری**

**له عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵلا**

قسەکردن لەم ووتارەدا لە بارەی ئەم پرسیارەوە دەسوڕێتەوە: گوتاری بەجیهانیکردن و شوناس سەر بە چ کایەیەك لە کایەکانی زانینە؟ ئایا سەر بە زانستن یان ئایدیۆلۆژیا؟

بەر لەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە پێویستە مەبەستمان لە هەریەك لە زانست و ئایدیۆلۆژیا دیاری بکەین بۆ ئەوەی دەستپێشخەری بکەین لە ووتنی ئەوەی کە ئێمە مەبەستمان لە زانست تێکڕای زانینەکان و لە ئایدیۆلۆژیا تێکڕای بیروڕاکان نییە، بەڵکو یەکەمین و دواهەمین مەبەستمان میتۆدی هەریەکەیانە لە بونیادنانی جیهانی زانینی خۆیدا. توێژینەوەی زانستی لەسەر میتۆدگەلێکی فرە جۆر ڕادەوەستێت، زۆر جاریش فرە جۆرییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بابەتی توێژینەوە، میتۆدی توێژینەوە لە ماتماتیکدا و هی تری لە زانستە سروشتییەکان و هی دیکەشی لە زانستە مرۆییەکان.. حاڵی گوتاری ئایدیۆلۆژیش هەروایە، ئەم گوتارە بە سروشتی خۆی بە پێی فرەجۆری ئەو مەرامانەی کە دەیەوێ بیانسەلمێنێت یان خزمەتیان بکات، گوتارێکی فرە جۆرە، ئەو مەرامانەش زۆرترن لەوەی ئامار بکرێن، لە پێناوی خۆلادانیش لە چوونە ناو کێشە و گرفتگەلێکی نوێوە کە ئەم ووتارە بۆی درێژنابێتەوە، بە مەبەستەوە هەڵدەستین بە بەراوردکردنی نێوان ڕاستیی زانستی و ڕاستیی ئایدیۆلۆژی (لە بری بەراوردکردن لە نێوان توێژینەوەی زانستی و گوتاری ئایدیۆلۆژی)، ئەمەش گواستنەوەیەکی پاساودار و قبوڵکراوە بەو پێیەی مەرامی توێژینەوەی زانستی گەیشتنە بە ڕاستیی زانستییانە، هەروەها ئەو ئامانجەی کە گوتاری ئایدیۆلۆژی بۆی دەچێت سەلماندنی ئەوەیە کە دەیەوێت وەك ڕاستییەك بیسەلمێنێت.

ڕاستیی زانستی دوو کۆڵەگەی هەیە: بابەتیبوون و توانای لێکۆڵینەوە، مەبەست لە

بابەتیبوون مامەڵە کردنە لەگەڵ بابەتی توێژینەوەدا وەك ئەوەی کە هەیە، واتە سەربەخۆ لە بیروڕا و هەست و سۆزمان، ئەمەش بە پلەیەك کە لەگەڵیدا دەتوانرێت رێککەوتن لە نێوان توێژەرەکاندا لەسەر ئەوە بکرێت کە لەگەڵ ئەو بابەتەدا چ شتێك هەیە. لەم ڕووەوە ئەگەر ڕێککەوتنێك لە نێوانماندا لەسەر ئەوەکرا کە ئەو شتەی لە بەردەماندایە فلأنە شتە و شتێکی تر نییە، بۆ نموونە پارچە نان-ێکە و بەرد نییە، ئەوە ئەو دەم دەڵێین پەیوەندیی مەعریفیمان بەم بابەتەوە پەیوەندییەکی بابەتییە، پرسیارەکەش ئێستا ئەوەیە: ئایا دەکرێ پەیوەندییەکی مەعریفی لە نێوانماندا دروست ببێت کە هەموومان گرێبداتەوە بە هەریەك لە بە جیهانیکردن و پرسی شوناس لە شێوەی ئەو پەیوەندییەی کە بۆ نموونە بە هەریەك لە نان و بەردەوە گرێمان دەدات؟

ئەم پرسیارە توێژینەوەی زانستی دەیخاتە ڕوو، هەرچی گوتاری ئایدیۆلۆژییە ئەوە بەرگەی ناگرێت! شوناس و بە جیهانیکردنیش بەرگەی ئەم پرسیارە ناگرن، چونکە قسەکردن لە هەریەکێکیاندا لە بنەڕەتدا گوتارە!..

گوتاریش پەیامێکە لە خودەوە بۆ یەکێکی دی "ڕاستییەك دەگوێزرێتەوە کە داوا لە کەسی وەرگر دەکات نەك تەنها باوەڕی پێ بهێنێت، بەڵکو کاریشی پێ بکات. کەواتە گوتاری ئایدیۆلۆژیش لە بابەتی "بەجیهانیکردن و پرسی شوناس "گوتارێکە گۆشە نیگایەك بۆ وەرگر دەگوێزێتەوە کە خاوەنەکەی بە گۆشەنیگایەکی ڕاستی دەزانێت و داوا لە وەرگر دەکات کاری پێ بکات. دەشێت بۆ نموونە بڵێت: "پێویستە بە جیهانیکردن وەربگرین و بەشداری تێدا بکەین و لە چوارچێوەیدا کار بکەین ئەگەر بمانەوێت لە پاشەڕۆژدا بژین". دەشێت ئەوەشی بخرێتە سەر: "هەرچی شوناسە ئەوە سەر بە ڕابردووە". دەشێت یەکێکی تریش بڵێت: "پێویست بە ڕووی بەجیهانیکردندا ڕابوەستین، چونکە هەڵگری داگیرکارییەکە ئەویتر بەسەرماندا پیادەی دەکات" دەشێت ئەوەشی بخاتە سەر: "ئەوە داگیر کارییەکە ئاستی کالأو ئابووری تێدەپەڕێنێ چونکە کولتوور دەکاتە ئامانج و پاشان شوناس و قەوارە".

ڕوونە ئەم دوو گۆشەنیگایە دەمانخەنە بەردەم گرفتەوە نەك تەنها کێشەوە، ئەوەش کە وایان لێدەکات گوزارشت لە گرفتێك بکەن ئەوەیە کە ئەوەی بڕیاری لێدەدەن لە بابەت ئەمە سپییە و ئەمە ڕەش-ە نییە، ئەوان بە کردەوە گوزارشت لە دوو بیروڕای جیاواز و پێك ناکۆك دەکەن، بەڵام ئەگەر تۆ یەکێکیان وەربگری بە تەواوی ئارام ناگری، بەڵکو ئەوەی دووەم دەمێنێتەوە و گیزوگاز دەخاتە سەر تێڕوانین و ڕاتدەکێشێ بۆ دەریایەك گومانی تەمومژ و بەم جۆرەش لە حاڵەتی گرژییەکی فکریدا دەژی. شتەکە وا دەردەکەوێت کە ئەم دوو بیروڕا دژبەیەکە، بە درێژایی هێڵ، لە یەك کاتدا هەردووکیان پێکەوە ڕاستن. لێرەوە ئەو گرژییەی کە لێیانەوە دەکەوێتەوە لە جۆری ئەو گرژییەیە کە کۆکردنەوەی هەردوو دژبەیەکەکە لە دەروونندا دروستی دەکات.

لەم ساڵانەی دواییدا قسە زۆر لەسەر پێویستی "ڕێنماییکردن"ی بەجیهانیکردن دووبارە دەبێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە چالاکییەکی بازرگانیی جیهانیی و ڕێز لە بەرژەوەندییەکانی وولأتان و تایبەتمەندێتییە هەرێمایەتی و لۆکاڵییەکان بگرێت، ئەو شتەی کە بە مانای داماڵینی مۆرکی هەژموونی ئیمپریالییانە و لیبراڵییانەی وەحشیگەرە لە بەجیهانیکردن هەروەك لەم ساڵانەی دواییدا بەخۆوەی دیوە.

لێرەدا ئەم لایەنەمان بەلاوە گرنگ نییە، بەجیهانیکردن وەك چالاکییەکی ئابووریی "پەتی"

لەو دیاردانە نییە کە لەگەڵ پرسی شوناسدا بەیەکدا بدات، ئەمە وەك سەرەتا، بەڵام ئایا لە سەردەمی ئێمەدا چالاکییەکی ئابووریی "پەتی" هەیە؟ پاشان لە کوێدا "پرسی شوناس" دەست پێدەکات و لە کوێدا کۆتایی پێدێت؟

ئەم دوو پرسیارە لە ناو ئەو پرسیارانەیە کە پەیوەندیی نێوان "بەجیهانیکردن" و پرسی شوناس" دەکەنە پەیوەندییەکی گرفتئامێز بەو مانایەی کە لە ووتاری ڕابردوودا دیاریمان کرد، چونکە مادام ئێمە ناتوانین سنوری دیاردەی بەجیهانیکردن، سنووره ئابووری و کولتووری و میدیاییەکەی و هتد.. بە ووردی دیاری بکەین و، ناشتوانین بۆ "پرسی شوناس" چوارچێوەیەك دیاری بکەین کە لێی تێنەپەڕێ، ئەوە زۆر گران دەبێت ڕێچکەیەك یان ڕێچکەگەلێك بۆ ئەو پەیوەندییەش دابنێن کە دەبێ لە نێوانیاندا دروست ببێت. لەم حاڵەتەشدا هەموو شتێك لەدەست دێت، پاشان ئێمە ناتوانین لە بارەی پەیوەندیی نێوان بەجیهانیکردن و شوناس بگەینە ئەنجامێك لەگەڵیدا بە کردەوە هەست بە سەقامگیرییەکی فکری بکەین، ئەگەر شتێکی لەم جۆرەش ڕوویدات ئەوە بەهۆی غافڵگیرییەوەیە و خێرا لە گرژییەکی گەورەتردا دەردەکەوێتەوە.

فکری نوێی عەرەبی گرفتێکی هاوشێوەی بە خۆوە دیوە کە بۆ چارەسەرێك لە بارەیەوە هیدایەتێکی ئەوتۆی بە خۆوە نەدیوە ئەوەی ئەو پێویستیی پێیەتی، لە سەقامگیریی فکریدا، پێی ببەخشێت. ئەم گرفتە ئەو گرفتەیە کە بە "گرفتی ڕەسەنایەتی و هاوچەرخبوون" ناو دەبراو تا ئێستاش ناو دەبرێت. خەڵکیش هەیە دەشێت بڵێت: ئایا گرفتی "بەجیهانیکردن و پرسی شوناس"یش هەر ڕووکارێك نییە لە ڕووکارەکانی، ئەو ڕووکارە تازەیەی کە گەشەکردن بە سەریدا سەپاندووین؟

وەڵام-یش لێرەدا ئەوەیە کە: هەر بە ڕاستی هاوشێوەییەك لە نێوان هەردوو گرفتەکەدا هەیە، بەڵام تەنها لە ڕووکار و بەس، هەرچی ناوەڕۆکە ئەوە جیاوازە و خودی شێوەی دەربڕینیشی جیاوازە، مەبەستم ئەوەیە جۆری سەرفکردنەکەیشی ئەم جیاوازییە دەردەخات، لەم ڕووەوە "هاوچەرخبوون" کارکردبوونە (مفاعلە) ئەمەش فۆرمۆلەیەکە بەڵگەیە بۆ بەشداربوون. هاوچەرخبوون فۆرمۆلەیەکە باس لەوە دەکات ئێمەین کە داوای هاوچەرخبوون دەکەین و بۆ خۆیشمان پێی هەڵدەستین، واتە هەوڵدەدەین لە بواری فکر و زانست و پیشەسازیدا بەرزببینەوە بۆ ئاستی سەردەمەکەمان. هەرچی بە جیهانیکردنە ئەوە فۆرمۆلە سەڕفییەکەی بە کردەکردنە، ئەمەش باس لەوە دەکات شتێك دەخەیتە سەر دەستەیەکی دیاریکراو: لە ڕووەوە لە قاوغدانی شتێك مانای ئەوەیە دەیخەیتە قاوغێکەوە، هەروەها بە جیهانیکردنیشی بە مانای ئەوەیە دەیکەیتە جیهانی. ئەم جیاوازییە زمانەوانییانەش تەنها تایبەت نییە بە زمانی عەرەبی، بەڵکو لە زۆر زمانی بیانیدا تێبینی دەکەین. لەم ڕووەوە "بەجیهانیکردن" وەرگێڕانی ووشەی ***globalisation***ە کە لە مانا زمانەوانییەکەیدا گشتاندن دەگەیەنێت: گشتاندنی شتێك و کردنی بە شتێکی سەراپاگیر. ئەگەر تێبینی ئەوەش بکەین کە ووشەی ***globe*** مانای گۆ دەگەیەنێت و بە زانینەوە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی بە دیاریکراوی مانای گۆی زەوی (الكرة الارضية) بێت ئەوە دەتوانین بە جیهانیکردن بە ئامانجە ستراتیژییەکەیەوە گرێ بدەین، مەبەستم گشتاندنی تەرزێکە لە ژیان لەسەر هەموو گۆی

زەوی. لێرەوەیە ناوی هاوتا بۆ "بەجیهانیکردن" لە گوتاری بەجیهانیبووی هاوچەرخدا دێتە کایەوە، مەبەستم لەفزی *planetarisation* ە، ئەمەش ئەوەیە کە هەندێکیان بە "ئەستێرەگەرایی" وەریدەگێڕن، مەبەستیش لێی کردنی تەواوی ئەستێرەی زەوییە بە شانۆیەك بۆ تەرزێکی دیاریکراو لە مامەڵەی دارایی و بازرگانی و، پاشان شارستانی کە تەرزی ئەمریکاییە.

ئەمە لەلایەك، لە لایەکی تر پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە ئێمە نین هەڵدەستین بە بەجیهانیکردن و گشتاندن، بەڵکو بە جیهانیکردن پرۆسەیەکە لە دەرەوەی ویستی ئێمەوە بەڕێوەدەچێت تەواو پێچەوانەی ئەوەی کە مانای "هاوچەرخبوون" دەیبەخشێ، هاوچەرخبوونێك کە گریمانەی ئەوە دەکەین ئێمەین کە پێی هەڵدەستین و بە ویستی خۆمان، یان لانی کەم، خەونی پێوە دەبینین. دەشێت ئەم جیاوازییەش بەشێوەیەکی ڕوونتر بەردەست بکەوێت ئەگەر ووریا بین لەو ڕێوشوێنەی کە بە هۆیەوە هەڵوێستی پۆزەتیڤیان لێ وەردەگرین،. هەڵوێستی قبوڵ کردن. لەبەرئەوەی ئێمە دەڵێن: ئێمەن بانگەشە بۆ هاوچەرخبوون دەکەین و ناڵێن "بانگەشە بۆ بەجیهانیکردن دەکەین" بەڵکو دەڵێین: بەشداری لە بەجیهانیکردن دەکەین یان ئامادەباشی دەکەین بۆ چوونە ناو سەردەمی بەجیهانیکردنەوە.

بە دەستەواژەیەکی کورت، لە "هاوچەرخبوون"دا وەکو خود مامەڵە لەگەڵ خۆماندا دەکەین، هەرچی لە "بەجیهانیکردن"ە ئەوە هەست دەکەین ئێمە بابەتی ئەوین. دەشێت ئەمەش جیاوازییەکی سایکۆلۆژی بێت، با وابێت. هەڵوێستی سایکۆلۆژی ڕۆڵێکی گەورەی هەیە کاتێك مەسەلەکە پەیوەست بێت بە شوناسەوە. شوناس پرسی هۆشیارییەو ئەم مەسەلەیەش سە بە پانتایی سایکۆلۆژیایە، بۆیە پەرچەکردار لە شێوەیەی ئەم پرسیارکردنە سەرسەختەدا دەبێت: ئایا ئەوەی وەك خودێکی بکەر مامەڵە لەگەڵ خودی دیاردەکەدا دەکات وەك ئەوە وایە کە وەك بابەتێکی کارتێکراو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات؟

پاشان بەرامبەر وەستان و پێك ناکۆکی لە نێوان "ڕەسەنایەتی و هاوچەرخبوون" لە جۆری بەرامبەر وەستان و پێك ناکۆکیی نێوان "بەجیهانیکردن و شوناس" نییە، چونکە "هاوچەرخبوون" تا ڕادەی نەهێشتن و ڕەتکردنەوە هەڕەشە لە شوناس ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە گریمانەی ئەوەی تێدا دەکرێت کار لەسەر دەوڵەمەندکردن و نوێکردنەوەی بکات.

ڕەسەنایەتیش هێشتا بەشێك نییە لە شوناس، بەڵکو ئەمە ناسینێکە دەشێت پێی بناسرێت. هەرچی "بەجیهانیکردن"ە، بەو پێیەی گشتاندن و لە قاڵبدانە، ئەوە هەڕەشە لە ڕەسەنایەتی و دوای ئەویش لە شوناس دەکا، یان لانی کەم، هەڕەشە لە جۆرێك لە شوناس و جۆرێك لە ڕەسەنایەتی دەکات.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی الاتحادی ئیماراتی ڕۆژی 2005/7/12.

# مێژووی ڕووناکبیری لە فەڕەنسا

رامین جەهانبەگلو
لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی

ئەگەر بمانەوێت مێژووی ڕووناکبیری لە فەڕەنسای سەدەی بیستەمدا بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بەڕای من دەتوانین بەسەر حەوت قۆناغی گرینگدا دابەشی بکەین:

1-قۆناغی یەکەم، لە ساڵی 1898 و بە کێشەی دریفوس دەست پێدەکات، کە دەتوانین بڵێین سەرەتای دەستپێکردنی رووناکبیری فەڕەنسایە.

2-قۆناغی دووەم، کە لە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ بە شۆڕشی روسیەوە باڵادەستی فاشیزم لە ئەورووپادا، دێتە ئاراوە.

3-قۆناغی سێیەم، قۆناغی بەرەی خەڵکی *Front Populaire* شەڕی ئیسپانیا و، پاشان شەڕی جیهانی دووەم لە ساڵی 1939دایە.

4-قۆناغی چوارەم، قۆناغی پاش شەڕی جیهانی دووەم – ساڵەکانی 68 – 1945 – کە ئەتوانین بە "ساڵەکانی سارتەر" ناوی بنێین.

5-قۆناغی پێنجەم، قۆناغێکە کە ئەتوانین بە قۆناغی هزری 68 و بەرزبوونەوەی بیریارانێك، وەك فوکو، دێریدا، لیوتارد و دولۆز ناوی بەرین.

6-قۆناغی شەشەم، قۆناغی فەیلەسوفە نوێکانە، کە لە کۆتاییەکانی 1970ی زایینیەوە تا بە ئەمڕۆ درێژەی هەیە و قۆناغی رەخنەکردنی توتالیتاریزم و سیاسەتەکانی چەپ لە فەرەنسادایە.

7-لە ئاکامدا قۆناغی حەوتەم، کە ئەم قۆناغەیە کە ئێستا لە بارودۆخی تێپەڕاندن دایە، قۆناغی ئاوابوونی بکەری سیاسی و قۆناغی ئاوابوونی رووناکبیر- هاوڵاتیە.

هەرکام لەم قۆناغە، تێڕامانێکی فەلسەفی و کاریگەرییە فەلسەفییە جۆراوجۆرەکانی هێناوەتە ئاراوە، کە دەتوانین پاش تۆژینەوەی مێژووی رووناکبیری لە فەرەنسا، باسیان بکەین.

### قۆناغی یەکەم:

قۆناغی یەکەمی شێوە دروست بوونی رووناکبیری لە فەرەنسا بە کێشەی دریفوس بووە، کە ڕووبەڕووبوونەوەی ئایدۆلۆژیکی نێوان نەریتخوازە ڕاستەکان و مۆدێرنیتەچەکانی لێکەوتەوە. خەبات و بەرکەوتێك کە بە کۆتایی

هاتنی شەڕی نێوان فەرەنسا و پرۆس لە ساڵی 1871دا دەستی پێکرد و بە کێشمەکێش لەسەر کێشەی دریفوس درێژەی کێشا و سەرلەنوێ درزی نێوان نەتەوە خواز و کۆماریخوازەکانی نوێ کردەوە.

لەم قۆناغەدا ڕاگەیەندراوی رووناکبیرەکان، بەدەر لە هەر چەشنە بەرگرتنێکی حیزبی و وەك ناڕەزایی دەربڕینی مۆراڵی بڵاو دەکرێتەوە. لە راستیدا، رووناکبیری بەم راگەیەندراوە بە شوێن وتاری بەناوبانگی ئەمیل زۆلا کە بە ناوی "من تاوانبار دەکەم"دا لە ساڵی 1898دا بڵاوکرایەوە، لەبەردەم رای گشتی فەرەنسادا ئامادە دەبێت.

دوا بەدوای مەحکوم کرانی زۆلادا، رووناکبیرە فەڕەنسیەکان، وەك ئاناتۆل فرانس شارل پەگی، مارسێل پرۆست و ئەوانی تر، بە نووسینی وتارێك لە رۆژنامەی *Aurore*، لە 2ی فێڤرییەی ساڵی 1898دا، بە ناوی یەکسانی (عدالت) و حەقیقەتەوە، هاوپشتی خۆیان بۆ زۆلا، ڕادەگەیەنن.

ئەگەر "بڵاوکراوەی رووناکبیرەکان" بەسەرەتای لە دایکبوونی رووناکبیری لە فەرەنسا بزانین، ئەوا دەتوانین بڵێین کە، لەگەڵ ئەم لە دایك بوونەدا، باسێکی نوێ لەسەربابەتێکی کۆن، یانی ڕێککەوتن (موافقت) یان دژایەتی (مخالفت) کردنی شۆڕشی فەرەنسا، دەست پێدەکات. کە باسی سیاسی نێوان پاوانخوازەکان[1] و کۆماریخوازەکان، دەگۆڕێت بۆ باسێکی ئایدۆلۆژیك لە نێوان ڕاست و چەپ لە فەرەنسادا.

مەسەلەی دریفوس و بە شوێن ئەودا مەسەلەی زۆلا، رووناکبیری فەڕەنسی بەسەر دوو گرووپی سەرەکیدا دابەش دەکات:

1-گرووپی یەکەم، گرووپێکن کە لە دەوری کۆمەڵەی داکۆکی لە مافی مرۆڤ کۆدەبنەوە و، کەسانێکی وەك ژورس، کلیمانسۆ، پرۆست و ئاناتۆل فرانس لە خۆ دەگرێت.

2-گرووپی دووەم، گرووپێکە کە ڕێبەرییە رووناکبیرییەکەی لە دەستی کەسێك بەناوی مووریس بارس دایەو، کەسایەتییەکی وەك شال مووراسی لەگەڵدایە کە دواتر دەبێتە کۆڵەکە دانەری گرووپی دەستەڕاستی و نەتەوەگەرای *Action Francaise*.

بارس و گرووپی نەتەوەخواز و نەریتخوازە فەڕەنسیەکان، دژی ئاواتەکەی دریفوس بوون، هەر بۆیە رووناکبیرەکانی لایەنگری دریفوسیان بە خیانەتکار بە فەرەنسا، ناو لێ دەبرد. بەم هۆیە، لە روانگەی بارس و موراسەوە، وشەی "رووناکبیر" هەڵگری باری سەلبییەو وەك جینۆ بەکاردەبرێت. بە وتەی بارس، "ڕووناکبیر" کەسێکە، پێیوایە دەبێت کۆمەڵگا لەسەر بناغەی لۆژیکی ڕاوەستابێت. رووناکبیر کەسێکە کە بە نەریت نامۆیە. بۆ موراسیش، ئەمنییەتی نەتەوەیی، گرینگتر لە چەمکگەلێکی وەك حەقیقەت وە یەکسانی (عدالت)ە.

هەروەها کە دەبینین، رووناکبیری راستخواز و نەریتخواز، نەریتێکی دێرینەی لە فەرەنسادا هەیە، کە لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا بەکەسانێکی جیاوازی وەك "بارس، موراس، برازیاك، سلین، لوروشێل، راباتەو ئالێن دوبونوا و گۆڤارگەلێکی وەك *Element* و *Action Francaise*دا وە دەردەکەوێت.

هەڵبەت پێویستە بگوترێت، کە زێدەڕۆیی ڕاستخوازی (راستگرای افراطي) کە نەتەوەخوازی ڕەگەز پەرستانەی لێدەکەوێتەوەو، راستی لیبراڵ و رووناکبیرە ناسێنەرەکانی، وەك ریمۆن ئارۆن، ژان فرانسوالوول، و گۆڤارەکانی *contrepoint*

و *commentaire*، جیاوازیگەلێکی زۆریان هەیە. بەڵام بێگومان، ئامادەبوونی رووناکبیرەکان لەبەردەم رای گشتی فەرەنساو، دەستێوەردانی راستەوخۆی بەرهەمەکانیان لە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەوروپادا،باس لەمەڕ "خەیانەتی رووناکبیرەکان"ی لە ساڵی 1890ەوە تا بە ئەمرۆ هێناوەتە ئاراوە.

هەروەها کە دەزانن، "خەیانەتی رووناکبیرەکان" ناوی کتێبێکی بەناوبانگی "ژۆلین بێندا"یە کە لە ساڵی 1927دا بە چاپی گەیاند. بابەتێك کە بێندا لەم کتێبەدا باسی دەکات، کێشەیەکە زیاد لە سەدەیەکە، داوێنی بزوتنەوە رووناکبیرییەکانی لە فەرەنسا و جیهاندا گرتووە.

بەڕای بێندا، رووناکبیرە فەرەنسیەکان، زیاد لە پێشتر (بیش ازپیش) هیوا فەلسەفیەکانی خۆیانیان وەلاناوەو، سەرنج دەدەنە ئاواتە (جزمگرا) و ئایدۆلۆژیکەکانیان، بە واتایەك بەوەلانانی ئاواتی جیهانگیری رۆشنگەری، خۆیان زیاتر خەریکی راهێنانە ئەندۆچکەییەکان دەکەن. بێندا بەم دەرەنجامە دەگات کە، رووناکبیرەکان جیهانی مادی و بزوان (هیجان) سیاسییەکانیان لە جێی جیهانی فەلسەفی و مەعنەوی خۆیان داناوەو، هەر بەم هۆیەوە، دەتوانین بڵێین کە دونیای رووناکبیرەکانی سەدەی بیستەم، قۆناغی رێکخستنی رق و قینە سیاسییەکانە، کەوابوو – بەڕای بێندا –، خەیانەتی رووناکبیرەکان بەهۆی دەستێوەردانیان لە کاروبارە کۆمەڵایەتیەکاندا نییە، (ئەو ڤێڵتێری بە کەسایەتیەکی یەکسانیخواز دەزانی) بەڵکو بە هۆی بەشداری کردنیان لە حیزبە سیاسییەکاندایە. ئاماژەی بێندا بە ئامادەبوونی رووناکبیرە فەرەنسیەکان لە حیزبەکان و شێوە دروستبوونە سیاسییەکاندا ناوەرۆکێکی وردبین و "صمیمی" هەیە. ئەگەر ساڵی 1898، بە ساڵی لە دایك بوون و شێوە دروست بوونی رووناکبیرەکان لە فەرەنسا بزانین، ئەوا دەتوانین بڵێین ساڵێك دواتر،واتە ساڵی 1899، ساڵی شێوە دروستبونە سیاسییە نوێکانی فەرەنسایە، کە رووناکبیرەکان رۆڵێکی گرنگیان تێدا دەبینی. لەم ساڵەدا، رووناکبیرە نەتەوەخوازەکان، لە بەرامبەر لایەنگرانی دریفوسدا، دەست دەکەن بە بنیاتنانی گروپی *Action Francaise*. بەم چەشنە، مشتومڕی فیکری و سیاسی نێوان نەتەوەخوازی موراسی، بەناوی عەشیرەتخوازی فەرەنسییەوەو، بنەمای گشتیخوازی (کلی گرایی) مۆراڵی رووناکبیرەکانی لایەنگری دریفوس، دەست پێدەکات. بەڵام بێگومان سەرکەوتن لە شانۆی رووناکبیری فەرەنسا، لە سەد ساڵی رابردوودا، بۆ رووناکبیرە دریفوسییەکان بووە. چونکە ئەوەی لە فۆرمی (شێوە) کار (عمل)دا بۆ ئەوان گرینگی هەیە، تەنیا گەڕانەوە بۆ بنەمای (اصول) مۆراڵی گشتی خوازو جیهانگیر نییە، بەڵکو گرینگ داکۆکیکردن لە بەهاکانی کۆماریخوازییە.

ئەمە بنەمای داکۆکیکردن لە ئاواتی ئۆتۆنۆمی تاکە کەسی و ئازادییە مەدەنییەکانە، کە بە بۆچونی روناکبیرە دریفوسییەکان، چاخی رۆشنگەری و راگەیاندراوی جیهانی مافی مرۆڤ و هاوڵاتی ساڵی 1789، داکۆکیکەر و ناسێنەری (ی.ن.و) پاشتر بۆ ماوەی نیو سەدە شارستانییەتەکانی رووناکبیری چەپ ودەربەست (متعهد)ی فەرەنسا، دروست دەکات.

### قۆناغی دووەم:

ئێستا ئەگەر ئاورێك لە قۆناغی دووەمی رووناکبیری لە فەرەنسا بدەینەوە، دەبینین کە بەتەواوەتی درێژەی قۆناغی یەکەمە، بەم جیاوازییەوە، کە لەم قۆناغەدا چەند رووداوی

گرنگ، شێوەیەکی نوێ بە رووناکبیری فەرەنسی دەدات. کە گرنگترینیان ئەزموونی تاڵی شەڕی جیهانی یەکەم، و هەروەها رووداوی شۆڕش لە رووسیەی تێدایە.

بۆ زۆرێك لە لایەنگرەکانی دریفوس، شۆڕشی روسیە وە دەرکەوتنی دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەرەنسا لە سەدەی بیستەمدایە، لە کاتێکدا شۆڕش لە روسیە و بەرزکردنەوەی بیلشویزم، بۆ راستخوازە نەتەوەخوازەکان،مەترسییەکی نوێیە بۆ بەها نەریتی، دینی و نەتەوەییەکانی فەرەنسا. ئێمە لەم قۆناغەدا، رووبەڕووی کۆنگرەی بەناوبانگی شاری "تور" دەبینەوە، کە بوو بە هۆی جیابوونەوەی لایەنگرەکان و نەیارەکانی لینین و، پێکهاتنی حیزبی کۆمونیست و حیزبی سوسیالیستی فەرەنسا. لە ڕاستیدا، بزوتنەوەی چەپی فەرەنسا دەکرێت بە دوو لقەوە: حیزبی کۆمۆنیست و حیزبی سوسیالیستی فەرەنسا. لە لایەکی دیکەوە رووناکبیرە دەستە ڕاستییەکان، کە دژی پارلمانتاریزم و، خوازیاری یەکێتی نەتەوەیین، لە دوی پاکسازی کەلتووری دەگەڕێن و، پەیوەست دەبن بە بزوتنەوە فاشیستیەکان و نازیزمەوە.

لەم قۆناغەدا رووبەڕووی چەند رووداوی گرنگ دەبینەوە:

1–مردنی رووناکبیرگەلێکی وەك شارل پەگی، لە شەڕی جیهانی یەکەمدا.

2–لاخوازی رووناکبیرگەلێك وەك ژۆرژسورێل و ئەوانی تر بۆ شۆڕشی روسیە لە ساڵەکانی 20–1917 دا.

3–داکۆکیکردن لە فاشیزمی ئیتالی و موسولینی، لەلایەن موراس و لایەنگرەکانییەوە.

4–مردنی بارس لەلای دیسامبێری ساڵی 1923دا، کە لە بیریارە گرنگە دەستەڕاستییەکان بوو، رێگرییەکی بەرچاوی بەسەر رووناکبیرو نووسەرگەلێکی وەك دێریۆلارو شێل، هانری دومۆنترالْ، و فرانسوا موریاکەوە هەبوو.

5–شێوە دروستبوونی دادایزمی تریتستانی تێزارەکان و، بە شوێن ئەودا شۆڕشی بزوتنەوەی هونەری و رووناکبیری سوریالیزم، کە بە بلاَوکراوەی سوریالیزمی "ئاندرێ برۆتۆن" لە دیسامبێری ساڵی 1924دا، شێوە دەگرێت.

هەروەها کە دەزانن، "گیوم ئالینێر" وشەی "سوریالیزم" دادەهێنێت و بە واتای "داهێنانی خۆبزوێن" کەڵکی لێوەردەگرێت. بەلاَم برۆتۆن لەم وشەیەدا وەك نارەزایی دەربڕین لە جیهانی عەقلاَنی دیکارت و سیستمی رامیاری و هونەری هەبوو (موجود)، کەڵك وەردەگرێت.

جێی سەرنجە کە سوریالیستەکان خاوەنی دوو قۆناغی گرینگن:

1–قۆناغی یەکەم، کەسانێك وەك برۆتۆن و لویی ئاواگۆن، تێدەکۆشن ئاشتییەك لە نێوان شۆڕشی ئۆکتۆبر و شۆڕشی سوریالیستیدا، پێك بێنن.

2–لە قۆناغی دووەمدا، کە بەراگەیەندراوی دووەمی سوریالیزم و، بەهۆی ئاندرێ برۆتۆنەوە دەخرێتە ڕوو، برۆتۆن، بەرەی "ترۆتسکی" دژ بە بەرەی "ئێستاین" هەڵدەبژێرێت و، ئەم هەڵبژاردنەش دەبێتە هۆی جیابوونەوەی ئاراگۆن و برۆتۆن، لە ساڵی 1932دا.

## قۆناغی سێیەم:

هەروەها کە گوتمان نەریتی ڕیشەییخوازی (رادیکالیزم) و رووناکبیری فەرەنسا، بەنامەکەی زۆلا دەست پێدەکات و، بەشێوە دروستبوونی حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا، درێژە دەکێشێت. لە

قۆناغی سێیەمدا، رادیکالیزم فۆرمێکی نوێ بەخۆیەوە دەگرێت و، کەسانێکی نوێی وەك، ئاندرێ مالرۆو، فەیلەسوفی فەرەنسی "ئالێن" (*Alain*) قارەمانی رووناکبیری ئەم قۆناغەن.

ساڵەکانی 1930، قۆناغی شەڕی ناوخۆیی ئیسپانیا، بەرزکردنەوەی نازیزم لە ئاڵمان و بەرەی خەڵکی *Front Populaire* لە فەرەنسادایە. مەسەلەی بنەڕەتی بۆ رووناکبیرەکانی قۆناغی فرانکوالیزم، بەرگریکردن لە بەها کۆماریخوازییەکان و چەپ، لە بەرامبەر فاشیزم و *Front Populaire* دایە.

لەم قۆناغەدا، دریفوسیگەلێکی وەك فەیلەسوفی فەرەنسی، ئالێن، بڵاوکراوەیەکی نوێ بەناوی "وتارێك بۆ کرێکارەکان" (*Appel aux ourriers*)، بڵاودەکەنەوە و لەودا سێ دروشمی نان، "ئاسایش (صلح) و ئازادی دێننە گۆڕێ. جێی سەرنجە کە "ئاسایش (صلح) و ئازادی" دوو بەهای گرینگی لایەنگرەکانی دریفوس لە ساڵی 1898دا بوون، کە لێرەدا بۆ جارێکی دیکە دووپات دەکرێنەوە.

ئاندرێ مالرۆ، کەسایەتی گرینگی رووناکبیری ئەم قۆناغەیە، کە بۆ نووسینی کتێبی بەناوبانگی "چارەنووسی مرۆڤ" لە ساڵی 1933دا خەڵاتی ئەدەبی "گونوڕ"ی وەرگرت. مالرۆ نووسەرێکی شۆڕشگێڕە، بەڵام مارکسی نییە. بۆ مالرۆ، مارکسیزم راهێنان (اموزە)ێك نییە، بەڵکو ویستە (ارادە)، ویستی خۆناسین. کەوابوو، مارکسی بوون بە واتای دروست وتن نییە، بەڵکو سەرکەوتنە بەبێ خەیانەت کردن بەخود. هەر بۆیە مالرۆ، شان بەشانی کۆماریخوازەکان، لەشەڕی ریاڵی ئیسپانیادا بەشداری دەکات، چونکە بەڕای ئەو، رووناکبیر تەنیا مرۆڤێکی کەلتووری نییە، بەڵکو تاکێکە کە ئاگایی و کردەوە (عمل)، پێکەوە دەبینێت.

هەروەها کە دەزانن، رووناکبیری چەپ لە فەرەنسا، هاوکاتە لەگەڵ شکستی کۆماریخوازەکان لە ئیسپانیادا، بەم جۆرە، رووناکبیرگەلێکی چەپ یان لیبراڵی کە وەك سارتەر و دیکۆر لویناس، لەبەرەکانی شەری جیهانی دووەمدا بوون، دەنێردرێن بۆ دیلخانەی نازییەکان، هەروەها هەندێکی وەك ئاندرێ مالرۆو ریمۆن ئارۆن، بە مەبەستی هاوکاری کردنی "دۆگل" و فەرەنسای ئازاد، دەرۆن بۆ لەندەن هەڵبەت کۆمەڵێك وەك کلۆدوی شتراوس، خۆیان لە شانۆی شەڕ لە ئەورووپا دوور دەخەنەوەو، لە قوتابخانەی فەرەنسی نیویۆرك، دەست دەکەن بە وانە وتنەوە. هەندێکیش وەك ژان دوسانتی و دومینیك دوسانتی، پەیوەست دەبن بە بزوتنەوەی بەرگری فەرەنساوە. بەڵام لەم ناوەدا، ڤیکتۆر بوش *Victor Busch* و کاڤالایس *Cavaills*، لە لایەن نازییەکانەوە قۆڵبەست دەکرێن و دەکوژرێن، لە کاتێکدا، هەندێکی دی لە ئۆردوگای نازییەکاندا گیانیان لەدەست دەدەن. بەڵام بەداخەوە، ئەم قۆناغە کاتی هاوکاریکردنی زۆرێك لە رووناکبیرە راستخوازەکان لەگەڵ حکومەتی ڤیشی *Vichy* مارشاڵ پێتن و لەگەڵ نازییەکاندایە. کەسانێك وەك موراس و لایەنگرەکانی، وەك پیتێربوتان، بەهۆی دژایەتیان لەگەڵ دیموکراسی و کۆماریخوازیدا، لەبەرامبەر دروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسا، ئازادی، یەکسانی و برایەتی، بەرگرییان لە سێ دروشمی کار، بنەماڵەو نیشتمان دەکرد.

کومیتەی نەتەوەیی (میللی) نووسەران، ریزێك لەو نووسەرو رووناکبیرانەی کە بەهاوکاری کردنی نازیزم تاوانبارن، لە ئۆکتۆبەری ساڵی 1944دا بڵاودەکاتەوە، کە لەودا رووبەڕووی ناوگەلێك وەك ژۆرژسوارێز، لویی فێردیناندسلین، مارسێل ژوماندۆ، هانری دۆمۆنتراڵ، ساشاگیتری،

دێریولاروشێل رۆبێربرازیاك، پۆل سوران و لوسین روباتە، دەبینەوە. لەوانەدا، كەسانێك وەك سواریز و برازیاك، دادگایی و مەحكوم بە لەسێدارەدان دەكرێن. بەڵام لێرەدا دەبێت ئاماژە بە هەستان بەكاری روناكبیرە دژە فاشیستییەكانی وەك ئالبێركامۆ، مارسێل ئێمیێ و كلۆود موریاك بكەین، كە بۆ پێشگرتن لە لەسێدارەدانی روناكبیرە راستخوازە زێدەڕۆكان و لایەنگری نازیزم، راگەیەندراوێكیان بڵاوكردەوە.

موریاك لە نامەیەكدا بۆ دوگل دەنووسێت "مەسەلەی ئێمە، سەرنج نەدان بە بەرپرسیارەتی ئەم روناكبیرگەلە نییە، بەڵام ئێمە پێمان وایە، ئامانجە نادروستەكان پێویستییەكیان بە شەهید نییەو، هەندێ كات لێبوردن عاقڵانەترین هەڵسوكەوتە". بەڵام ژان پۆل سارتەر لە وتارێكدا، لە ئۆكتۆبەری ساڵی 1945، لە گۆڤاری تان مۆدێرندا، كە بەهاوكاری ئارۆن، بودارو مێرلۆپۆنتی بنیات نرا، بە دەرەنجامێك پێچەوانەی دەرەنجامەكەی موریاك دەگات. بە پێی سارتەر، نووسەر كەسێكی دەربەست (متعهد) و خاوەن بەرپرسیارەتی سیاسییە. بەم وتەیەی سارتەر قۆناغی چوارەمی روناكبیری فەڕەنسا، كە بە ساڵەكانی سارتەر ناسراوە و لە ساڵی 1945ەوە تا ساڵی 1968 درێژەی هەیە، دەست پێ دەكات.

### قۆناغی چوارەم:

لەم قۆناغەدا، رووبەڕووی چاخێكی نوێی دەربەستی (تعهد) روناكبیری دەبینەوەو، جارێكی تر نەریتی خەباتی دریفوس، دەگۆڕدرێ بۆ خەبات بە دژی داگیركاری (استعمار) لە شەڕی ئەلجەزائێردا. هەروەها قۆناغی چوارەم، قۆناغێكە كە تیاییدا فەلسەفەی ئێگزیستانسیالیزمی سارتەر، كامۆ، ژان وال و گابرێیل مارسێل، بایەخێكی بەرچاوی هەیە. بەرگریكردن لە بەرەی رزگاریخوازی ئەلجەزائێر، لەلایەن روناكبیرە چەپەكانەوە، جارێكی تر كێشمەكێشی نێوان لایەنگرەكانی ماركسیزم و چەپخوازەكان وە دەژكانیانی، لە مێشكەكاندا زیندووكردەوە.

لەم قۆناغەدا، سارتەر سەفەرێك دەكات بۆ كوباو سۆڤییەت و پێشەكییەك بۆ كتێبی "دۆزەخییەكانی سەر زەوی" فرانتز فانون دەنووسێت. ئەم لاخوازییەی روناكبیری فەڕەنسا دژ بە داگیركاری و ئیمپریالیزم، دەبێت لە چێوە (قالب)ی خەباتە ئایدۆلۆژیكەكانی شەڕی سارددا، لەبەرچاو بگیردرێت. ئەگەر قەبووڵمان بێت كە ژان پۆل سارتەر، كەسایەتی پاڕادایمی روناكبیری رادیكاڵی ئەم قۆناغەیە، ئەوا دەتوانین بڵێین، ریمۆن ئارۆنیش ناسێنەری روناكبیری دژە كۆمۆنیستی و لیبراڵی فەڕەنسا، لەم قۆناغەدایە. ریمۆن ئارۆن و بەرەی مارشال دوگل، خۆیان وەك ئوردوگای دژی توتالیتار دەناسێنن و، گۆڤارگەلێك وەك *Contrepoint* و *Liberte du esprit* و *Preuves* چاپ و بڵاودەكەنەوە.

ریمۆن ئارۆن، بە نووسینی كتێبی بەناوبانگی "ئەفیونی (افیون)ی روناكبیرەكان" لە ساڵی 1951دا تراویلكە (توهم) و هەڵەگەلی روناكبیرە چەپەكان لە بەرامبەر توتالیتاریزمدا وەبیر دەهێنێتەوە.

ڕەنگە ئالبێر كامۆ، یەكێك لەسەرنجڕاكێشترین كەسایەتییەكانی روناكبیری ئەم قۆناغە بێت، كە دەكەوێتە بارودۆخ و شوێنێكی ئاڵۆز و پڕ ناكۆكی لەگەڵ هەردوو بەرەی ڕاست و چەپدا. ناكۆكی (شكاف) نێوان سارتەر و كامۆ تا كاتی مردنی كامۆ لە ساڵی 1960دا، دەمێنێتەوەو، سارتەر پاش

مردنی له بارەیەوه دەنووسێت: "کامۆ دەرخەری سەدە و دژی مێژوو بوو، هومانیزمی دەمەدەم (لجبان)، هەستیار و دیار (محض)ی کامۆ، خەباتێکی پڕ له فرمێسك و گومان بوو، به دژی رووداوه پڕ بارو بێ فۆرمەکانی ئەم قۆناغه".

## قۆناغی پێنجەم:

بێگومان قۆناغی کۆتایی، قۆناغی چوارەم، بزوتنەوەی 68 و مانگرتنه خوێندکارییەکانه، که به هاتنه مەیدانی رووناکبیرگەلێك وەك میشیل فوکو، فیلیکس گوتاری، فرانسوا شاتله، فرانسوا لیوتارد، ئاگهی روبور، ژیل دلۆزو و ژاك دێریدا، دەست پێدەکات. ژیل دلۆز و گواتاری، له بزوتنەوەی 68، وەك "رووداوێکی دیار (محض) و خاڵی له هەر چەشنه هۆگەرایەتی رەوشتی (هنجاری)"، دەدوێن. مەی 68 جارێکی تر، وەك قۆناغەکانی پێشتر، رووناکبیره راستخوازو چەپ خوازەکانی فەرەنسا، رووبەرووی یەکدی دەکاتەوە، ئاندرێ مالرۆ و ریمۆن ئارۆن، بۆ داکۆکیکردن له ژانرال دوگل، دەرژینه شەقامەکانی پاریسەوە، له کاتێکدا، سارتەر و گروپی مایۆیسته فەرەنسییەکان، رۆژنامەیەك بنیات دەنێن و له لایەن پۆلیسەوە قوڵبەست دەکرێن. لەم قۆناغەدا، فیلیپ سولز، که خۆی مائۆیی بوو، گۆڤاری *Tel Quel* بنیات دەنێت، که له ساڵەکانی دوای مەی 68، کەسانێك وەك تودروف، ژولیاکریستوا، و رۆلان بارت، پەیوەست دەبن پێیەوە.

ئەمه قۆناغی ئاوابوونی سارتەر له بواری جەستەیی و واتاییەوەیه. سارتەر له ساڵی 1973دا بینایی خۆی له دەست دەدات، بەڵام لەسەر بانگهێشتی پارێزەری گروپی ئەرتەشی سووری ئەڵەمان، له ساڵی 1974دا، دەڕوات بۆ ئاڵمان و، له زینداندا چاوی به بادرمابنهووف دەکەوێت. بەڵام لەگەڵ شێوه تیرۆریستییەکانیاندا، دژایەتی دەکات. کەسایەتییه رووناکبیرییەکانی قۆناغی پێنجەم، رووناکبیری پۆستمۆدێرنەکانن، که هەر کامه و بەرەخنەکردنی مۆدێرنیته، ماوەیەکی رەخنەیی له ئایدۆلۆژیا توتالیتارەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دەگرن، بەڵام فەلسەفەیەکی سیاسی نوێ داناهێنن. کەوا بوو، دەتوانین له ژێر ناوی هزری 68دا له رووناکبیری قۆناغی پێنجەم بتۆژینەوە، که رووناکبیریەکی پۆست مۆدێرن و خوێندنەوەگەلێکی فەلسەفی نوێ، له هایدگەر، نیچەو مارکس و فرۆیده.

کتێبه گرینگەکانی قۆناغی پێنجەمی رووناکبیری بریتین له:

1-کتێبی "دژی ئودیپ"ی دیلۆزو گواتاری، که له ساڵی 1972دا له چاپ دەدرێت.

2-"کۆنترۆڵ و سزا"ی میشیل فوکو، که له ساڵی 1975دا له چاپ دەدرێت.

3-دواجار، "بارودۆخی پۆست مۆدێرن"ی ژان فرانسوا لیوتارد.

لەم قۆناغەدا میشیل فوکو واتای سارتەری رووناکبیر، کەجەخت لەسەر کەسایەتی کلاسیکی رووناکبیری وەك کەسایەتییەکی جیهانگیر دەکاتەوە، دەباته ژێر پرسیار و، له "رووناکبیری تایبەت" دەدوێت. بەڵام بەرەگرتنه سیاسییەکانی فوکو، هەڵەگەلێکی تێدایه، که دەبێته هۆی ئەوەی که فەیلەسوفه نوێکان، له ساڵی 1980دا رەخنەی توندی لێ بگرن.

بۆ نمونه، میشیل فوکو له هەڤپەیڤینێك لەگەڵ نوام چامسکی، له نۆڤامبری ساڵی 1971دا، دەڵێت: "رەنگه کاتێك پرۆلیتاریا به دەسەڵات دەگات، دەسەڵاتێکی تووڕه، خوێناوی و دیکتاتۆر (منشانه) بەسەر ئەو چینانەیدا که

سەرکەوتووە، جێبەجێ بکات، من کێشەیەك لەم بابەتەدا نابینم".

### قۆناغی شەشەم:

لەوانەیە ڕادیکاڵیزم و زیدەڕۆیی چەپخوازی (چپ روی های افراطی) زۆرێك لە ڕووناکبیرە چەپەکانی فەرەنسا، دەبێت بەهۆی، شێوە دروستبوونی گرووپێکی لاوتر لە ڕووناکبیر و فەیلەسوفەکان، کە بەناوی *les nou veux philosphs*ەوە و لە ساڵەکانی کۆتایی 1970و سەرەتای 1980دا، دێنە ناو گۆڕەپانی گشتی فەرەنساوە.

بێرناردهانری، نووسەری کتێبی "توحش پاچهرای انسانی"و ئاندرێ گلوکسهان، نووسەری کتێبی "اندیشمندان ریٚ نمایکەر"، نوێنەرە سەرەکییەکانی ئەم گروپە نوێیەی ڕووناکبیرەکانن، کە هەریەکە و لە ژێر کاریگەری سولژنستینی ڕەخنەکردنی توتالیتاریزمی کومونیستی و ڕەخنەکردنی چەپ‌وحیزبی کومونیست گەیشتوون.

هاوکات لەگەڵ ئەم کەسانەو ڕەخنەکانیان لە توتالیتاریزم، جێگای خۆیەتی ئاماژە بە ڕەخنەکردنی توتالیتاریزم و چەپ، لەناو خودی بزوتنەوەی چەپەوە بدەین، کە بەهۆی سێ گرووپی گرنگەوە بەڕێوە چوو:

1–گرووپی گۆڤاری *Argument*، واتە ئێدگاردمون و کوستاس ئاکسلوس.

2–گرووپی سوسیالیزم: کە کەسانێکی وەك کلورلوفور (قوتابی لۆپۆنتی) و ژان فرانسوا لیوتارد، دەگرێتەوەو، سەرەنجام بوو بەهۆی جیابوونەوەی ئەم نەفەرانە، لە ساڵەکانی 1960دا.

3–دواجار گرووپی گۆڤاری *Esprit*، کە بە خوێندنەوەی نوێی هانا ئارێنت وبەسەرنووسەری ئولویەفوژن، پێ دەنێنە قۆناغێکی نوێ لە ژیانی ڕووناکبیری خۆیانەوە.

### قۆناغی حەوتەم:

دەتوانین ڕۆژی 18ی ئاڤریلی ساڵی 1980، واتە ڕۆژی بەخاك سپاردنی ژان پۆل سارتەر لە گۆڕستانی پیرلاشز، بە دەستپێکی ڕووناکبیری دەربەست (متعهد) لە فەرەنسا، بزانین شێرێرژولی، سەرنووسەری ڕۆژنامەی لیبراسیۆن، کە سارتەر لە دروستبوونیدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا، سارتەر وەك کەسایەتییەك ناو دەبات، کە وەك ڤۆڵتێر و هۆکۆ، فۆرمی بەسەدەکەی خۆیدا.

9 ساڵ پاش مردنی سارتەر و بە ڕووخانی دیواری بێرلین، ڕووناکبیری دەربەستی فەرەنسا، کە لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا، هەوراز و نشێوی زۆری دیتووە، فۆرمێکی نوێ بە دەست دێنێت. لەم قۆناغەدا، ڕووناکبیرەکان خۆیان بە بەها و بابەتگەلێکی نوێوە خەریك دەکەن، لەوانە ڕەخنەکردنی بەهاکانی کەلتوری بەکارهێنان (مصرف)، بەڵام هاوکات بە بەرگریکردن لە تاکگەرایی دیموکراتیك.

کەسانێك وەك لوك فێری، ئالێن فینککروت، ئولویە فوژێن، پاسکاڵ بروکنێر، لە ژێر کاریگەری بەرهەمەکانی لوفور، کانت، ریکۆر و هتددا، دەست دەکەن بە ڕەخنەکردنی نیچە، هایدیگەر، و بە گشتی هزری 68.

ئەم ڕەخنەکردنانە، دەبێتە هۆی پێکهاتنی کەشێکی نوێ لە ڕووناکبیری فەرەنسادا، کە باسگەلێك لەسەر پلۆرالیزم، دیموکراسی و یەکسانی، جێنشینی بەرگریکردنی سارتەری لە شۆڕش، ڕووناکبیری دەربەست و جیهانی سێیەم، دەکات.

ئالێن تۆرێنی کۆمەڵناسی فەڕەنسی، لە کتێبەکەیدا "پاش سوسیالیزم"، لە مردنی سوسیالیزم دەدوێت و، ئاندرێ گوزر، کتێبێك بە ناوی "خوات لەگەڵ پرۆلیتاریا" دەنووسێت.

بە مردنی ریمۆن ئارۆن لە ساڵی 1983، میشیل فوکو لە ساڵی 1984، و لیون دوبوار لە ساڵی 1986دا، لاپەڕەیەکی مێژووی رووناکبیری فەڕەنسا، دەبەسترێت. بە مردنی ئەم سێ نەفەرە، پیێربوررویەی کۆمەڵناسی فەڕەنسی، بۆ ماوەی 15 ساڵ کەسایەتی رادیکالیزمی رووناکبیری فەڕەنسییە. تا ئەوەی کە لە ژانوییەی ساڵی 2002دا، ئەویش ماڵاوایی لە ژیان دەکات.

### پەراوێز

1-پاوانخوازەکان هەڵەیە، کۆنزەرڤاتیوەکان.

### سەرچاوە

سایتی *www@iranartists.org*.

# دەسەڵاتخوازی و کەسێتی مۆنتاژکراو

## زنجیرە باسی مۆدێرنیستی کۆمەڵگەی مەدەنی

**مەسعوود تارانی**

**لە فارسییەوە: عادل محەمەد پوور**

ئەم لێکۆڵینەوەیە راڤەی دەروونشیکاری جڤاکی دەسەڵاتخوازییە کە بگرە زاراوەی لێکدراوی "دەروونناسی سیاسی" بۆ ئەم دەربڕینە شیاوتر بێت، لەم باسەدا لە گریمانەکانی "فرۆید" و "ئێریك ئێریکسۆن" رەوانناسی ئەڵمانی — بە رەچەڵەك ئامریکایی، لە بارەی چییەتی پێکهاتەی کەسێتی "مرۆڤ"ەوە، کەڵك وەرگیراوە. ئەگەرچی ئەم "چییەتی"یە گرێبەندە بە دۆخ و هەلومەرجی "تاك" بە کۆمەڵگەوە، ئەو هەلومەرجەی کە دایمەن لە گۆڕاندایە. هەروەها کە دەزانین "فرۆید" و دەستەیەك لە "پۆست ئیستراکچراڵیستەکان *post structuralist*" وەك: لاکان، بۆ نووسینی بەسەرهاتی چارەنووسی مرۆڤ، وەك هێزێکی شکۆدار و پڕ هەیبەت دەیانڕوانییە "نەست و ناخۆئاگا". دوا بەدوای دەربڕینی گریمانەی فرۆید، ئێریکسۆن و ئانا فرۆید و باقی دەروونناسەکانی تری چەمکی "من" بە بۆچوونێکی جیاواز لەسەر شکۆداری و هەیبەتی خۆئاگای من "*ego*" و تەنانەت لە رەسەنایەتیدا، وەك توخم و کیانێکی سەربەخۆ لە (نەهادی ئەوی دی *id*) ئاوڕیان ئەدایەوە. پاشان دەبینین کە چۆن "فرۆید" بە پێچەوانەی دەروووناسەکانیتر، (نەهادی *id*)ی بە ئاخێزگەی "من، *ego*"ی دەزانی. بەم حاڵەوە لە هەلومەرجی جڤاکیدا، بە تایبەت بەهۆی نەبوونی سەرەڕۆخوازی (ئیستیبداد)ی سیاسی شێلگیرانە و سەرومڕ لە رۆژئاوادا، بەو چەشنەی کە ئێمە لە رۆژهەڵاتدا تەجروبەی دەکەین، جگە لە ئامارژەگەلێکی (پچڕپچڕ و ئاڵۆسکاو) لە لایەن دەستەیەك لە دەروونناسانی جڤاکییەوە وەك: "ئادۆرنۆ، ئیریك فرۆم، ویلهێلم رایش" کە کارشێنە سەرەڕۆکان، لە رەهەندەکانی غەیر جڤاکی و ناتەبایی دەروونی مرۆڤی غەیر رۆژئاوایی، لە خولگەی توێژینەوەکانییاندا، قوتار کرد. بەم هۆیەوە، پێکهاتەی کەسایەتی، لەم سووچە نیگایەوە، لەگەڵ فەرهەنگی دەسەڵاتدا (سوڵتە) پێوەندی مێژوویی نەگرت.

کەوابوو، لەم نووسینەدا هەوڵدراوە تا ئەو شوێنەی کە بلوێ و تەنانەت بە ساکار بینی (*Simplification*) و "هەمەکی دان"ییەوە، کێشەکان و چەمکەکانی دەروونناسی فرۆید، پەیوەندی بە کێشەی (سەرەڕۆیی) و دەسەڵاتدارێتی لە جیهانی سێهەم، بە تایبەت لە ئێراندا، توێژینەوە بکرێ. رەنگە ئەم چەشنە توێژکارییە، هەر چەند کاڵ و کرچ بێ کە لە رەهەندی ئەدەبیاتی سیاسی ئێمەدا خەریکە چاوی لێدەکرێ، بتوانێت ببێتە پێگەیەك بۆ تێگەیشتن لە کێشە فەرهەنگییەکان، یان شیتەڵکاری کێشەکان و پێوەندی پاژەکان کە لەم دۆخەدا، گەشکەیان کردووە. ئەگەری ئەوەیش هەیە لەم رەوتەدا، لە مێژووی رابردوومان رەخنە بگرین، مەبەستمان تەنیا گەیشتن بە رێگاچارە و تێکۆشانە بۆ بزاڤمەندی کردەکان، نەخێرایی بەخشین بە رادەی خۆکەم بینی!

بەچاوکردن لەم باسە کە مرۆڤ لە پانتایی کارزاری ژیان و نووسینەوەی مێژووی خۆیدا، تەنیا بوونەوەرێکی رووتی ئاوێنە ئاسا و بێ ئیرادە نیە، بەڵکوو دەروونناسی سیاسی، جیاواز لەو بۆچوونانە کە مرۆڤ بە بوونەوەرێکی بێ ئیرادە، — وەك ئایدیای بنەما خوازی و فاکسیۆنالیسم — دەناسن لەسەر رۆڵی کارای تاك توێژکاری دەکات[1].

ئەم دوو روانگە (بنەماخوازی و فاکسیۆنالیزم — وەرگێڕ) بە خۆئاگایی و رۆڵی چالاکمەندی تاك لە زنجیرە پێکهاتەی جڤاکدا، بایەخێکی ئەوتۆ دانانێن. کەوابوو ئێمە دەمانەوێ سەرەتا، پێکەوە پلە و پایەی "من" لە جڤێنگەدا وەك "دیاردە"یەکی چارەنووس بەخش، پێناسە بکەین و رۆڵی سیاسی ئەم "دیاردە" لە خولگەی رۆحیاتی خۆماندا هەڵبهەنجێنین و ئەنجا پێوەندی خۆمان لەگەڵ چەمکی "دەسەڵات"دا تاوتوێ بکەین و ئەم پرسانە بخەینە ڕوو: (وەرگێڕ). ئایا تاکێك هەیە لە ئێمە بترسێ و حسابی تایبەتمان بۆ بکات؟ ئایا خۆمان بە کامڵ و فرەزان دەزانین و دیتران بە نەزان و تێنەگەیشتوو؟ هەترەمان دەچێ و بەجێی کردە، سکاڵا دەکەین؟ ئایا لاساییکەر و وەدوواچووین؟ ئایا لە خۆدام یا لەگەڵ خۆداین؟ دەرەك بینین و بە کوتەکی ناوبژێوانی وەدووی ئەم و ئەوداین؟ لە خۆماوەدەگرین و بۆ موچیاری ئەم و ئەو لەخۆ، هەڵەتە دەبیین و یان لە خۆ بێ ئاگا و دەروون بینین؟ ئایا لە کردەکان بەرپرسین و یان بەستراوین بە سەرمەستییە زارۆکییەکان و لە حەقیقەتدا گورێز لە بەرپرس دەکەین؟ کردەکانمان زێدەرۆن یا کەمرۆ؟ یان وەرگێراو و لەسەرکوتی بەرزە من (*Super ego*) یان بە خواستی "من"ی خۆڕاگر و پڕ توانست؟

ئاکامی تیشکۆی ئەمانە گرێبەندە بەوەی کە گەوهەری هەبوونی ئێمە چییە و "من" پێوەندی لەگەڵ فەرماندارێتی هێزە دەروونییەکاندا، خاوەندارێتی چ پلە و پێگەیەکە.

## خۆئاگایی:

"من"ێك کە لە بەیان تا ئێوار لەسەر زاری هەمواندا گۆ دەکرێت ئیتر بۆی نییە تەنیا لە خاوەندارێتی تاکدا بمێنێتەوە[2] یان بە نامۆ پێ بنێتە گۆڕەپانی جڤێن و سیاسەتەوە. ناکرێ بە پێچەوانەی ئەو باوەڕەی "هیوم" بە پیرۆزکردنی هەست کە لەمەڕ فۆرماسیۆنی فەرهەنگی رۆژئاوادا بووی — ئەویش پەرچەکردارێك بوو بەرامبەر بە ناسیۆنالیزمی دێکارت—، ئیتر جڵەوی هەست و بەرخۆدانی ئەو "من"ە بە هەر ئاقارێکدا راکێش بکات. دروست بە هۆی ئەم پێوەندییە ئۆرگانیکە

لەگەڵ کۆمەڵگەدایە، کە تایبەتمەندییەکانی تاک، هێما ئامێز و گشتگیرن، دەبن بە "مشتێ نموونەی خەروارێك" لەو روەوە مرۆڤی ناخۆ ئاگا، لە رۆژێکەوە هاتە نێو جڤێنگەوە هەوڵی داوە بگاتە خۆئاگایی تا بتوانێ بەشێوەیەکی ئاوەزکردار کۆمەڵگەکەی بسازێنێ. مرۆڤ بەر لە تەوژمی "رێنێسانس"ی ئوروپایی، لە رەهەندێکەوە مرۆڤێك بوو کە بەهۆی زۆرداری و دەسەلآتی حاکمانەوە لە پەراوێزدا مایەوە، لە هەمبەر پێودانگەکانی مۆدێرنیتەدا، زۆرتر وەك "شت" حسابی بۆ دەکرا، پاژێك بوو لە گشتیەك، قەوارەکەی ئەو زۆرتر لە قورسایی "ئێمە بوون، مایی" و "هەمەکی"دا، دەتوایەوە. تاك و تاکگەرایی بە چەشنی مۆدێرن وێنا نەئەکریا، دەسەلآتی (سەرەڕۆ)یش بە فۆرم گەلێکی جۆراوجۆر رێگای بە فراژو بوون (بالیدن) و رسکانی توانستە بزۆزەکانی تاك نەدەدا بۆ ئەوەی خۆی نەبێ بە قوربانی.

پاش "رێنێسانس" ئەو "من"ە یان "سووژە" هێدی هێدی رسکا، و فراژوو بوو و وێناکرا. "ئەو" لە فەلسەفەی "تامس هابز و جان لاك" وەك مرۆڤی زانای (تەجرەبیەکان) خۆی نواند. هاورێ لەگەڵ دابەزاندنی هێدی و سەرەخۆی سێبەری پاشاکان، "کانت" مرۆڤی وەك "من"ی کامڵ و سەربەخۆ و بەرپرس، ناساند.

لێرەدا بوو کە تاك وەك هەستی سیاسی هاتە نێو جڤێنگەوە، کە ئیتر نەیئەتوانی دەسەلآتدارێتی حکوومەت وەك هۆکاری شۆربەختی خۆی بزانێ. لە روانگەی ئەم بیرمەندانەوە نەهاد (رێکخراوە)ی حکومەتی ئامرازێك نەبوو بۆ گەیشتنی تاقمێك بە دەسەلآت و شەوکەتی سیاسی و یان ئایدئۆلۆژی و کەرەسەیەك بۆ دەسەلآتدارێتی، یانێ دەوڵەت بێ سەرکوتی "ئاشکرای" پێشوو دەیتوانی بەردەوام بێ لە فەرمانڕەوایی بزڕی خۆی، لەگەڵ رای "کۆ"دا. ئەم جۆرە حکوومەتە تەنیا لە رێی گەشکەی "من" یان "سووژە" وە فەراهەم دەکرا: یانێ لیبرالیزمێك کە لەسەر بناغەی "خۆپارێزی" و خۆسانسۆری دادەمەزرا. ئایدئۆلۆژیای دەوڵەتەکانیش لەسەر "تاکخوازی" ئەم مرۆڤە مەدەنیە سەقامگیر دەبوو. دەسەلآتیشیان هەر لە جەماوەرەوە (*Universal*)دابین دەبوو نە دەربازبون و بێگانە بەم دیاردە. بەم شێوە، لە روانگەی رەوانناسی و لەسەر بناغەی پرەنسیپە بایەخدارەکانی مۆدێرنیتە دەبینین کە لە ئەورووپادا "من"ێکی شکۆدار و بزاڤمەند و سەرفراز بەلآم نەچەندان خۆشحاڵ و کامڵ، پێ دەنێتە نێو گۆڕەپانی کێشمەکێشی ژیانی کۆمەلآیەتییەوە کە ئیتر وەك رابردوو مرۆڤ بە چەشنێکی روون "ئۆبژە" و "کۆیلە" یان مرۆڤێکی مێتافیزیکی نایەتە ئەژمار، یان "بێ وزە" و "ئایدۆلۆژی" کراو بەڵکوو لەسەر بناغەی پێداویستی کۆمەڵگە، سەروەری "سووژە" بوونی و "ئاوەز"گەرێتی دێتە نواندن. دەروون و ناخی "تاك"یش کەمتر دەبێتە مەکۆی غارێن و رمبازی هێزە هەوسارپچڕاوەکان – مرۆڤ تخوبی خودی نائاگا و خولگەی هێزە نەناسراوەکان دەبەزێنێ و خۆی لە پانتای "مەدەنییەت" نزیك دەکاتەوە. فەلسەفەی "فنۆمنۆلۆژی" کانتیش هەر لەم هانە (چاوگە)وە سەرچاوە دەگرێ، چونکا مرۆڤ شت ئاسا، دەست بە هەڵبژاردنی مەدەنی ناکات، نە لەگەڵ خۆی و نە لەگەڵ سروشتدا ئەو ماوەیە هەیە، کە ئەو بکاتە مەدەنی. ئادەمیزادێك بەم جەستە ئاوو گڵەوە نە ئەتوانێ سازێنەری مێژووی "هیگڵ" بێنە مارکسیزم. نەیشدەتوانێ هەڵواسراو بمێنێتەوە و نەیش سەقامگیر. کەوابوو "کۆمەڵگەی مەدەنی" مرۆڤگەلێکی دەوێ خۆ ئاگا، ئاوەزمەند و

بەرپرس نە هەستیار و سەربەژێر و گورێزکەر لە بەرپرسێتی و خۆقوربانیکەر. دەوڵەتی نویٚ وەك رێکخراوی بەرزە"من"، تەنیا دەتوانیٚ بە "خۆئاگایی"و مرۆڤایەتییەك کە پێکهاتەی سەروەری خۆیەتی، دانوساندن بکات. لە حاڵێکدا کە تایبەتمەندی پێکهاتەی کەسێتی تاکی دەسەلاٚتخواز نائاگایانە. دەبێتە ئامرازێك بۆ گەیشتنی بە دەسەلاٚتی سیاسی، چونکە کاتێك کەسێتی لاواز دەبیٚ ئیتر وتەزای ئازادی بەیانگەری نیازێك بۆ پێگەیشتنی دەروونی و ناسین و کەشفی (خۆ) (*Self Actualization*) نیە[3]. کەوابوو ئازادی پێدەچیٚ لە باشترین هەلومەرجیشدا، بکێشرێتە هەرج و مەرج و بشێونییەوە. "من" هەم لە قاوغی تیۆرداو هەمیش لە کردەدا نابێتە کانگەی زانست و ناسین.مرۆڤ کاتێك بەشکڵی مەدەنی خۆی دەناسیٚ و دەبێتە هانەی زانست کە هێزە سەرکوتکەرەکان بگۆڕیٚ و رایان بێنیٚ بەهێزێکی بەرهەڵستکەر و ناوبژیوان، یانیٚ راهێنانی حکوومەت بە رێکخراوی دەوڵەتی یاسایی و گۆڕانی هێزە سەرکوتکەرەکان بەهێزگەلی بەرهەڵستکەرو دەرەنجام جێبەجێکردنی چەمکی رێکخراوی "من، *ego*" بە "بەرزە من، *Super ego*" بە پێچەوانەی ئەمە، ئەو مرۆڤە، پێویستی بە باوك سالار و مۆچیاریکەر و پێشەوا هەیە. کەوابوو دەبیٚ بگەین بە گەشەی دەروونی ناواخنی کۆمەڵگەی مەدەنیدا. لەراستیدا کە خودی ئەم باسگەلە نیشانەی گەشکەی کۆمەڵگەیە و پێداویستی دەرونییە بە ئازادی. مەبەست لە نووسینی ئەم چەند دێریشە هەمان دۆزە کە ئەم زانیاریە دەرونییە لە ناخدا هەڵبهەنجێنین و لە شکۆداری و بەرزڕاگرتنیدا، تێبکۆشین. بەلاٚم لە رووی ئاگایی و زانیارییەوە، بیٚ گومان بە توانستی تایبەتەوە وە دووی ئازادی کەوتن، مرۆڤ زووتر، دەگاتە ئامانجە رەواکانی.

بە پوختی، کەسێتی مرۆڤی فرۆیدی، ئامێزەیەکە لە سیٚ پاژی سەرەکی: ئەو (*id*) من (*ego*) و بەرزەمن (*super ego*). ئەو (*id*) سەرچەشنی خۆخوازییەکان، سەرخۆشییەکان و شورمەستی منالاٚنەیە کە زانایانی ئێمە بە "نەفسی ئەمارە" ناودێری دەکەن. "من" (*ego*) هەمان ئاقاری ئاوەز و ئیرادەی مرۆڤە کە کارکردیشی دەروونی و هەمیش قبووڵی بەرپرسێتیە. "من"ی بالاٚتر و "بەرزە من" (*Super ego*) هەمان ویژدانی تاکییە کە دێتە هاریکاری "من" تا بەرهەڵستی خواستە زێدەڕۆ و ئەنارشیستیەکانی ئەو بکات. لە کەش و هەوایەکی زۆرمەداری و سەرەڕۆییدا، بەرزە من (*Super ego*) زۆر گەشە پەیا ناکات بەڵکوو بەجێی ئەو "بەرزە من" گەشکە پەیدا دەکات.

لەسەر ئەم بناغە و لە پێوەندی لەهەمبەر گەشە یان نەبوونی گەشەی رێژەیی تاك، لە جەرگەی کەسێتییەکاندا دەتوانین بەسیٚ کەسێتی کە لە نێو سەرچەشنی تایبەتمەندییەکانی بالاٚدەستدا کە زۆرتر لەم باسەدا بە کەڵك ئێمە دێن، ئاماژە بدەین :

کەسێتی دواکەوتوو، کەسێتی مۆنتاژکراو و کەسێتی مۆدێرن

1-کەسێتی دواکەوتوو، ئەم چەشنە کەسێتییە لەسەر بنەمای پێنەگەیشتوویی "من" و وابەستەیی و بەندکراو بە بەها و ئەندێشەکانی پێش مۆدێرن.

2-کەسێتی مۆنتاژکراو، لەم بەشەدا "من" هەمان "من"ی دەسەلاٚتخواز دەژمێرریٚ بەلاٚم خاوەنی ئەندێشە و بەها مۆدێرنەکانە.

3-کەسێتی مۆدێرن، کە هەم "من" گەشەی رێژەیی سالمی خۆی لە فۆرمی ئەوەڵ و سێهەمدا، دەکات هەمیش لە رەهەندی چییەتیدا،

کێشمەکێشی ئەوتۆ لە سازوکاری کەسێتی تاکدا، نابینرێ، لە راستیدا لەم ئاستەدا کۆمەڵگەیش لە رێکوپێکی و سامانێکی پایەدار و سەقامگیردا بەهرەمەند دەبێ. بەڵام بەم جیاوازییەوە کە لە دۆخی ئەوەڵدا، یانی لە دۆخی پێنەگەییوی "من"دا "من"ی باڵا و "ئەو" راشکاو و بێ پەردە لە بەرامبەر ویدا ئەوەستن.

بەلەونێکیکە بەهۆی سستی "من" پاژێك لە بەرزە "من" بەهەیکەلی سەرکوتگەر دەردێ تا "ئەو" بخاتە ژێر رکێفی تەدبیری خۆیەوە و لەم چالاکییەدا سەریشدەکەوێ. لە فۆرمی دووەمدا (کەسێتی مۆنتاژکراو)، تاك لەگەڵ ئەندێشەی مۆدێرن و کەسێتی نەریتیدا دەکەوێتە چنگاوەش و ململانێ، بۆ ئەوە هێشتا وا لە بەند و کۆتی ئیلتیزامات و پێوەندییە نەریتییەکاندا، ئەندێشە نۆژەنەکان بە چەشنی دروشم ئاسا و قاڵبکراو دێنە ئاخافتن.

"من" کە دەبێ ئاوەز (عەقڵ) بگرێتە خۆی و ئاڵا هەڵگری "ئازادی" بێ بەهۆی پێنەگەیشتوویی و سستییەوە، توانستی بەرامبەری لە هەمبەر "ئەو"دا نیە و دەرەقەتی سەرکوتکردنی "ئەبەر من" نایێ. کەوابوو هەستانەوە بۆ چەمکی ئازادی یان بە شەوقەوە دێتە گەڕ و یان پایەدار نامێنێ، و لە لایەن "ئەبەر من"ەوە سەرکوت دەکرێ. بە لەونێکی تر چالاکییە سیاسییە ئازادیخوازییەکانی ئێمە تەنیا بە دەستهاوێشتن بە هێزەکانی رێکخراوی "ئەو" و "ئەبەر من" (بەرخۆدان و سەرکوتی) مەیسوور و جێبەجێ دەبوو. لەسەر ئەم پێڕەوە، (تێکڕووخانی) ڕژێمەکان ئەو جۆرەی کە شیاو بوو بە ئەنجام نەدەگەیی، بە فەرزکە کە کەسێتی مۆنتاژکراو لە لووتکەی شور و بەرخۆداندا بۆ ئازادی لە مەرگیش پێشوازی بکردبا، بەڵام نەتەنیا "ئەبەر من" هاریکاری "من" ناکات، بەڵکوو خۆیشی دەبێتە هێزی بەرهەڵستکەر و داپڵۆسێنەر بۆ "من". لە ئاستی سێهەمدا، یانێ کەسێتی مۆدێرنیدا، کە "من" بە زۆرتر گەشکەی سەندووە بەپشتیوانی "بەرزە من" بۆ گەیشتن بە "ئازادی" هەمیشە خەبات دەکات، چونکە پێویستی ئەوتۆی بەم پێگەیشتوویییەو گەشەکردنە هەیە.

هەنووکە رەنگە گەیشتبین بە پێناسەیەکی کورت لە دەسەڵاتخوازی، دەسەڵاتخوازی کە هاوسەنگە نزیکەکەی دەبێتە: (*Autnoritarianism*) کە لە قاموسە ئینگلیزییەکاندا لە رەهەندی رۆحیاتی تاکیدا بە (سەیتەرە جۆیی، خۆکامەیی و دەسبەسەری بێ چوون و چرا بە دەسەڵات (اتوریتە) مانا کراوەتەوە). لە فارسیدا بە دەسەڵاتخوازی و مەیلەو دەسەڵات مانا کراوەتەوە. بەهەر حاڵ مەبەست لە دەسەڵاتخوازی لە پێکهاتەی سیاسی و رەوانیدا، نائاگایی و پێنەگەیشتوویییە. لادەین لەوەی پێنەگەیشتویی لە چنراوی نەریتیدا خاوەنی کارکردی جڤاکی تایبەت و دڵخوازییە، چونکا تاکی پێنەگەییو یەکەم پێویستی بە پێوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ دەورووبەردا هەیە و دووەم، پێگەییوی هێرەمێك دەخولقێنێ کە پێگە و پلەی هەرکەس لەودا دیارە، لەراستیدا دەبێتە دابینکەری ئاسوودەیی و هێمنایەتی بۆ تاك. ئەڵبەتە پێنەگەییوی لێرەدا، وتەزایەکی زەینی نییە کە واتە کەسێك بڵێت: ئێوە لە کوێوە دەزانن "من"ی زۆرینەی نەتەوەیەك پێنەگەییوە و خۆگەردان (خۆگەڕێنەر، خۆبەڕێوەبەر) نییە؟

رەنگە باشترین وەڵام بۆ ئەم پرسە، هەبوونی دەسەڵاتدارێتی رێکخراوە داپڵۆسێنەرەکانی بێ کە ئاوێنەی باڵانوێنی "من"ی لاواز و پێنەگەیووە، یانێ لە پێکهاتەی سیاسیدا، پێنەگەییوی تاك لە

قاوغی فەرمانڕەوایی ڕێکخراوە ئاڵۆز و ناعەقلانی و ترسهێنەرەکاندا هەستی پێدەکرێ و دەکەوێتە بەر ناساندن، ئەمە لە ئەساسدا، هەمان بەشە دەسەلاتخوازییە داپلۆسێنەرە لە "من"ی بالا (ئەبەر من)دا هاوسەنگ و هاوکێشەیە. دەبێ بزانین کەسێتی دەسەلاتخواز، وا لە بیرۆکەی دۆزینەوەی ئاسانترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە چەمکی دەسەلات تا لە بازنەی لە خۆنامۆییدا، زەخت بنوێنێ و زۆر بێژێ، هەمیش سەرەڕۆییەکەی چێژێکی ئاشنائامێزی هەبێ. چێژی ئەم "بوون"ە تەنیا بە سوڵتە و دەسەلات دائەمرکێ. لەم حاڵەتەدا، تاکە پێنەگەییوەکانیش لە ئەمرازگەلێکی جۆراوجۆر وەك سەرەڕۆیی و ئایدئۆلۆژی کەڵك وەردەگرن تا لەم کەرەسە بۆ سوڵتەی دیتران چێژ وەرگرن.

لەسەر ئەم بنەما، فەرمانڕەوایەتی حکوومەتە سەرەڕۆکان دەبێ بەسەرچەشنی هەستپێکراوی تایبەتمەندییەکانی کەسێتی دەسەلاتخواز و نائاگا کە بووە بە غەریبەیەك و دەرەکی، خۆی بە چەشنێکی ئازاردەر و ئالۆزمەند دەنوێنێ. کەوابوو کەسێتی دەسەلاتخواز وەك "هەمەکی" یەك لە ڕەفتار و ئەندێشەدا، لە جەستەی سیاسەتی سەرکوتکەرانەدا، هەڵسووکەوت دەکات، سەرکوتکردنی ڕەوانی و کەسێتی لە واقیعدا، هەمان سەرکوتی سیاسی و کۆمەلایەتییە، جار و باریش ئەندێشەیش بۆ پاڵ پەستۆکی ئەم سەرکوتکردنە دێتە گۆڕەپانی کردارەوە.

ئەگەرچی ئاخێزگەی پێنەگەییوی و دەسەلاتخوازی هۆکاری جۆراوجۆری هەیە بەلام لەم نووسینەدا ئەو هۆکارە سەرەکییە کە دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم و جەختی لەسەر بکەم، ڕێکخراوەی "خێزانە".

## خێزان و "من"

ئەزانین کە ئەگەر کۆرپەلەیەك لە ژێر دەستی دایك و باوکێکی دەسەلاتخوازدا پەروەردە بکرێ و ڕێزێك بۆ ئەندێشە و بۆچوونەکان و سەربەخۆیی ئەو قایل نەبن، لە جێی حورمەت و ڕێز لە خولیاکانی ئەو هەمیشە وەدووی سڕینەوەی خولیاکانی بکەون و خولیاکانی خۆیان داسەپێنن، ئەوا گەشەی پەروەردە و پێگەیشتوویی ئەو تووشی قەیران و ئالۆسکان دەبێ. پێخوست بوونی "من" بەهۆی زۆربێژی یان تەنگەتاوکردن و داخوڕینی دایك و باوك لەگەڵ بونیاتنانی کۆمەڵگەی سالم و (بە واتا) دیمۆکراتیك، ناتەبایە و دوژمنی سەرەکی "خۆڕێك و پێکی" و "خۆگەردانییە". لەم حاڵەتەدایە کە "تاك" ناچارە. لە خولی گەورە ساڵیدا نیازی بە ساز و کاری دەرەکی دەسەلاتخواز و دەزگا سانسۆرچییەکان دەبێ، تا وەك هێزی دەرەکی لە ژیانی ئەودا، ڕێك و پێکی و واتا درووست بکەن.

سەرەنجام مرۆڤ لەلایەن هەمان ساز و کارەوە کە سەرکوتکرابوو ڕێبەری و ڕێنوێنی دەکرێ. لە جڤاك نەریتخوازەکاندا، ڕێکخراوە سۆسیالیستییە داپلۆسێنەرەکان، گونجاو لەگەڵ پێکهاتەی کەسێتی دەسەلاتخوازدا لە بزرگەی کۆمەڵگەوە، مل قنج ئەکەنەوە و تەبا و ملکەچی هەمان ناوەڕۆکی کەسێتی باسکراو دەبن. بەهۆی ئەم زەمینە ڕسکاو، فەلسەفەی "بوون" و هەمیش ئەدەبیات لەم چەشنە کۆمەڵگەدا بە "زبان"ی حێرمان و ناهومێدی دێتە ڤەشاندن. کەوا بوو سەرەڕۆیی و سوڵتەی ڕەوانی و سیاسی و بەهۆی پێنەگەییوی ڕێکخراوی "من" لە میللەتێکدا بەم چەشنە دێتە قەوام، چوونکا ئەگەر کەسێتی "من" پڕوزە و قەڵەو وپێگەیوو و سالم بێ

ئەوا بۆی هەیە لە هەمبەر میکانیزمیگەلێك کە هەمان سازوکارە دیموکراتییە دەرونییەکانن، نێوان داخوازەکانی "ئەو" (زارۆ) و "بەرزە من" یان (ویژدان)دا هەمیش واقعییەتە دەرەکییەکان (بەها جڤاکییەکان)، سازش و ئاشتی و رێکەوتن بکرێ.

بەم جۆرە "من" وەك سیستەمێکی سانسۆرچی و بەرپرسی دەروونی خۆی وێنا دەکات. ئەگەر "ئەو" (*id*) بیەوێ لە ئارەزوو و داخوازییەکانیدا، زێدەڕۆیی بکات بە زمانێکی ساکارتر "من" لە دانووساندنی رۆژانەدا لەگەڵ "ئەو" بە مەهارەت و بوێری و تەڕەدەستییەوە لەگەڵ خولیا غەریزیە پاڵنەرە جنسییەکاندا، سازش بکات یانێ "نە سیخ بسووتێ و نە کەباب" لەم حاڵەتەدایە کە "من" لەگەڵ هەر چەشنە رەفتاری دزێو و سەرکوتکەرانەی کۆمەلأیەتی و سیاسی، بەهەر فۆرمێك کە خۆی بنوێنێ خەبات دەکات. ئاوا گەشەیەك بۆ "من" بە چەشنێکی تر هەمان گەشەی مەدەنییەت و رێکخراوە ئازادیخوازە دەروونی و دەرەکییەکانە کە لە ژێرەوە باسیان لەسەر دەکرێت:

## مەدەنییەت و بەربەرییەت (پێشکەوتوویی و دواکەوتوویی):

بۆ گەشەی مەدەنییەت بە دوو واتا ئاماژە کراوە:

یەکەم: واتایەك کە فرۆید بۆی رەچاو کرد ئەویش تێپەڕبوونی مرۆڤ لە بەربەرییەت (دواکەوتوویی) و سەرمەستییەکانی منالأنەیە بۆ "شارستانییەت".

دووەم: تێپەڕبوونی مرۆڤە لە کۆمەڵگەی نەریتی و دەسەلأتخوازییەوە بۆ کۆمەڵگەی مۆدێرن. دیارە کە کۆمەڵگەی نەریتخوازی یان پێش مۆدێرن لەگەڵ کۆمەڵگەی دواکەوتوو و بەربەردا یەکسان نییە، چوونکا بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی بەربەر لە کۆمەڵگە نەریتخوازەکاندا، بە چەشنە فەرهەنگی و ئیتنیکەکان، خولیا و ئارەزووە زارۆکیەکان بە توندی سەرکوت دەکرێ. ئەگەرچی ئەم سەرکوتکردنە جگە لە بەستێنەی عیرفان، لە فرسەتی گونجاودا، دوور لە چاوی (محتسب، چاودێر)دا تاك لە دەستوورەکانی سەرچەشنە فەرهەنگی و ئەرزشییەکان، کە هێشتا دەروونی نەبوون خۆی دەرباز دەکات. بەلأم ئەم سەرکوتکردنە، بەشێوەی رێك و پێك لە شکلی پاشا زۆردارەکاندا خۆی دەنوێنێ، لە واقیعدا خێرایی ئەم پاڵەپەستۆك و سەرکوتکردنە کە کۆمەڵگەی نەریتخوازی و دەسەلأتخوازی لە کۆمەڵگەی پێش مۆدێرن و مۆدێرن جیا دەکاتەوە.

لەم روانگەوە، دەبین بە خاوەنی سێ کۆمەڵگە: هەوەڵ، کۆمەڵگەی بەربەر (وەحشی و دواکەوتوو) کە غەریزەگەل و خواستگەل سەرکوت نابن یانێ "من" و "بەرزە من" لاوازن، بەلأم "ئەو" قەڵەو پڕ توانستە. دووەم کۆمەڵگەی نەریتخوازی کە لەمدا، رێکخراوە سەرکوتکەرە داپڵۆسێنەرەکان گەشکە دەکەن، یانێ "بەرزە من" و "من" لاواز دەبن بەلأم "ئەبەر من" قەڵەو دەمێنێتەوە. سێهەم کۆمەڵگەی مۆدێرن، لەم چەشنە کۆمەڵگەدا، پێویست بە رێکخراوەی سەرکوتکەر و لانیکەم بە چەشنە نەریتەکەی نییە، یانێ "من" قەڵەو و جوان دەبێ و لە پاڵ "بەرزە من"دا گەشکە دەکات.

ئەوەی لەم سێ چەمکەدا بۆ ئێمە بایەخدارە، کۆمەڵگەی نەریتییە کە لەم سەرچەشنەدا، "من" لاواز و پەککەوتەیە. هەروەها کە ئاماژەمان پێدا ئەگەر "من" پەککەوتە بێ و کەسێتی مرۆڤ پێنەگەییو، ئیتر تاك ناتوانێ بە درووستی و بەشێوەی سەربەخۆ لە هەمبەر سەرخۆشییەکانی

"زارۆكی" بوەستێ و خواستە سۆسیایی و عەقڵانییەكانی بەراورد بكات.

لەم ڕەوتەدا، كاركردە سالم و ڕەواكانی بۆ دابینكردنی ڕێكبەخشی و سامانمەندی ڕەوانی بەشەری لەدەست ئەدات و پێداویستی بە دەزگا سانسۆرچییە دەرەكییەكان دەبێ، وەك ئەو سەر چەشنە خێزانەی كە لە خولی منداڵیدا پێی ڕاهاتبوو. بەم هۆیەوە كە لە كۆمەڵگە نەریتییەكاندا ئێمە شاهیدی حكوومەتی سوڵتانە سەرەڕۆكان بووین، لەم چەشنە كۆمەڵگەدا، نەتەنیا "من" پەككەوتە و دواكەوتوو دەمێنێتەوە بەڵكوو چەشنێك ئەندێشەیش، گۆنجاو لەگەڵ ئەو پێكهاتە كەسێتەدا، سەرهەڵدەدا و گەشكە دەكات و فراژوو دەبێ.

## ئەندێشە و دەسەڵاتخوازی لە كۆمەڵگە دواكەوتووەكاندا:

لە خولە پێش مۆدێرنەكاندا، چییەتی چەشنی هزر لەگەڵ پێكهاتەی كەسێتی دەسەڵاتخوازدا، لە كێشە و ململانێدا نەبووە، یانێ چەشنی هزر كردنەوە ئەمرازێك بۆ ماریفەتناسی نەئەژمێررا، بەڵكوو وەك ئەمراز (ئالەت) كەڵكی لێ وەردەگیرا، "ماسۆن ئۆرسێل" لە كتێبی "فەلسەفە لە رۆژهەلأتدا" نووسیوییەتی: "پێشینیانی هێند، بەقەدەر چالاكی و كردە، ڕێزیان لە بۆ هزر و بیركردنەوە دادەنا[4] ". ناسین لە ڕێگای ئیشراقەوە بەدەست دەهات –پای استدلالیون سخت چوبین بود– دێرێكی مەولەوی ڕۆمییە: ئاماژەیە بەبێ بنەمایی و سستی بۆچوونی بیردۆزان –وەرگێر– ئەندێشەی نەریتی، ئەندێشەیەكی عەقڵی رووت نەبوو، ڕەگەزە هەستیاری و سۆفیانەكانیش لەودا كاردانەوەی هەبوو"[5].

ئەمە سازوكار و پلانە دەروونیكراوەكانی سەرەڕۆیی بوو كە كاری سەركوتی و دابینكردنی ڕێكوپێكی و سامانبەخشی خستبووە ئەستۆی "ئەبەر من".

لە بیۆگرافی "ئەبوو حامێد غەزاڵی"دا –یەكێك لە چوار بیردۆز و بیریارە بەناوبانگەكانی دنیای ئیسلام– دەخوێنینەوە: "دوای ئەوەی لەگەڵ ڕێچكەو بزاڤی سۆفیانەدا ئاشنا دەبێ لە وانەوتنەوە دەستهەڵدەگرێ و دەبێتە ڕێرەوی ڕێگای تەسەوف"[6] ئەو رووكردە لەگەڵ دەسەلأتخوازیدا پێوەندی توند و تۆڵ پەیدا ئەكا. حەنا ئەفخوزی ئەڵێ: "غەزاڵی لە ساڵی 488 كۆچی مانگی لە خوراسانەوە چووە شام، ماوەی 2 ساڵ لەوێدا مایەوە كە هیچ كارێكی جگە لە گۆشە نشینی و خەڵوەت و وەرزشی نەفس و تێكۆشانی مەعنەوی نەبووە. ماوەیەك لە گۆشە مزگەوتی دیمەشق مایەوە، هەرچی ڕۆژە دەچووە سەر منارەی مزگەوتەكە دەركەی لە خۆی دادەخست، ئەنجا لە شامەوە چوو بۆ بیت المقدس. هەرچی ڕۆژە دەرۆیشتە الصخرە، لەوێدا دەمایەوەو خۆی زیندانی دەكرد"[7].

هزر كردنەوە زۆربەی لە خزمەتی "كردە"دا بوو و "كردە"یش لە قاڵبی خەبات لەگەڵ نەفسدا لە خزمەت پێكهاتەی كەسێتی دەسەلأتخوازدا بوو. ئەندێشە وەك "بت"ی خۆزلزان و لووت بەرز كەمتر لە سیستەمی دەسەلأتخوازیدا پلە و پایەی بوو. یان ئەمرازێك بوو بۆ شكانەوە بە مل "نەفسی ئەمارە"دا یانێ هەمان ڕێكخراوەی "ئەو" بێ شك مەیلی شكانەوە و سوڵتە لەگەڵ فەرهەنگی نەریتیدا نامۆ نییە، ئەو سوڵتە و شكانەوە چ بە مل زارۆیەكدا بێ یان ژنێك یان نەفسدا. لە ئاسەواری عیرفانی و دینی ئێمەدا، نەفس هەمان ڕەهەندی ئاژەڵی مرۆڤە، كە

چەندەها کەڕەت لە دەرونەوە بۆ دەرەوە فرێدراوە و تەنانەت گیانلەبەرێکی دزێو و ناپاك بە ئەژمار هاتووە:

مردی کورکن عمری دراز

گۆرکەنێك، تەمەنێکی درێژ

سائلی گفت که چیزی گوی باز

پرسکەرێك پێیگوت نوکتەیەکم بۆ باسکە

گفت: این دیدم عجب بر حسب حال

گوتی لەم ژیانەمدا ئەم شتە سەیر و سەمەرەم دیت

کاین سگ نفسم همی هفتاد سال

ئەم سەگەی نەفسەم لەم هەفتاد ساڵدا

گورکندن دید ویك ساعت نمرد

ئەم هەموو گۆڕکەندنەی دیت بەلاّم خۆی بۆ سەعاتێك نەمرد

یك دمم فرمان یك گاعت نبرد

بۆ ساتێکیش لە دەستووری من ئیتاعەی نەکرد

عەتار لە "تذکرە الاولیاء"دا باس دەکات: "عەبدولاّترووغبەزی تووسی" کەرەتێك لەگەڵ دۆستانیدا بۆ نان خواردن لەسەر سفرەوە دادەنیشێ. مەنسووری حەللاجیش لە "کشمیر"ەوە دێ. عەبایەکی سەرتادامێنی رەشی لەبەردا ئەبێ و دوو دانە سەگی رەشیش وەدوویدا دێن.. شێخ گوتی، "ئەو سەگە، نەفسی ئەو بوو کە بەدوویدا دێ، لە دەرەوەی ئەو ماوەیە بەلاّم سەگەکەی ئێمە (نەفس) لە ناوەوە، ماوەتەوەو ئێمە وەدوویدا رادەکەین".

لە تێکستە عیرفانییەکاندا، جگە بە سەگ، نەفس بە بەچکە رێوی، مار، مشك، ژن و.. وێچواندراوە، لە شێخ بووعەلی سینای مەروزی دەگێڕنەوە: "من نەفسم لە سیمای ئافرەتێکدا دیت کە تاڵێ لە بسکی ئەوی گرتبوو و دای بە من و منیش ئەوم بە لقە درەختێکەوە بەستەوە و ویستم لەناوی بەرم". نووشتەی زۆربەی عارفان، تیاچوون بوو بۆ سەربەستی مرۆڤ، گەیشتن بە "لقاوا.." و پلەی "فنافی ا..".

رێڕەوی رێگای حەقیقەت دەبوا قۆناغگەلێکی پڕ ئاستەنگ تێپەڕێنی تا بگاتە دوایین پلە. ئەڵبەتە عارفانێکیش هەبوون کە پێیان وابوو تەنیا "عەشق"ە کە دەتوانێ ئەوان لەو قۆناغە سەخڵەت ئامێزانە تێپەڕێنێ کە ئەمە خۆی باسێکی جیاوازی تایبەتی دەوێ. بەلاّم هەر لێرەدا، بە کورت دەبێ بگوترێ: کە عەشق خۆی لە رەسەنایەتی و گەشکەی "من" دەرباز دەکات، لێرەدا عەشق جگە داخوازگەلی زاڕوانە و لووت بەرزانە شتێکیکە نییە ئەو عەشقە نە وەسڵە و نەفەنا بەڵکوو تەجرەبەی کامڵ بوونە. بەرخۆدان و عەشق ئەگەر تەبا و هاودەنگ لەگەڵ عەقڵدا نەبێ خۆخوازی و لووت بەرزییە یان بە گێڕانەوەیەکیتر، چەمکی عەشق زادەی چاخی رۆمانتیزم و پێگرتنی کامڵی تاکە لەو کۆمەڵگەدا.

بەهەر حاڵ ئەگەر بمانەوێ مەکتەبی "وەحدەتی وجوودی" لە رێگای داوەری ئاوەزخوازییەوە تاوتوێ بکەین، پێدەچێ مرۆڤ تا ئەو رادە (حیرمان زدە) و ناهومێد بمێنێتەوە کە سووتان و تیاچوون و فەنابوون، تا کە رێگا بێ بۆماننەوە باباشتر بڵێم کە هزرکردنەوە دەبێتە سەرباری هەبوون (هەستی). پێوەندی مرۆڤ لەگەڵ دنیای دەرەکدا کەم یان بە تەواوەتی دەپچڕێ. بەلاّم لە ئاقارێکدا کە "من" گەشکە دەکات لە خۆشی و وەسوەسە و بۆڵەبۆڵی "ئەو" کە تاقمێك لە زانایان بە "وەسوەسەی شەیتان" ناودێری دەکەن، بە دوژمنییەوە، لێی ناسڵەمێتەوە، "ئەو" و سەرخۆشیەکانی "ئەو" بێ

بایەخ و موهمەل ناکات و لەم دۆخەدا، نە ویژدانی ئاگا (بەرزەمن) خوازیاری سەرکوتکردنە نە واقعییەتە دەرەکییەکانیش راشکاوانە سەرکوتکەرن — لە واقیعدا، ئێریکسۆن وتەنی: "من" خۆی بە سەروەری واقعییەتە دەرەکییەکان و "بەرزە من" دەشوبهێنرێ، بە هۆی ئەم سەربەخۆییەوە بە دڵنیاییەوە دەچێتە پێشوازی زۆربەی داخوازە نەفسانییەکان و هەبوونیان وەك پێداویستیگەلی ژیانێکی سەرکەوتوو دەزانێ، لەو کۆمەڵگەدا، لە هەموو بەستێنە و قۆناغێکدا بۆ کەڵك وەرگرتن لە کامجۆیی و لەزەتخوازی فەراهەم دەبێ و "من" بۆ بەرپرسایەتی و ئەزموونگەری لە کارزاری ژیانی واقیعدا، هەنگاو دەنێ. لە حاڵێکدا تاکی ناهومێد (حیرمان زەدە) سەرەنجام دەبێتە قوربانی ئەو هێزانەی کە هیچ چەشنە پتانسییەلێکی راگرتنی بە ملیاندا نییە.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە خۆشگوزەرانی (ئاوەزمەند و مەدەنی)، لەگەڵ کەسێتی دەسەلاتخوازیدا تەبا و گونجاو نییە، چونکە ئەگەر هێزی بەرهەڵستەکەری دەرەکی نەبێ "تاك" دین و دنیای خۆی بە شەهوەترانی و خۆش بوون، دەفرۆشێ و دنیایش دەکێشێ بە گەندەڵکاری و پیسکاریدا. لەم روانگەوە لە زەمان شای پێشوودا ئاوەها هەلو مەرجێك لە کۆمەڵگەدا بەردەوام بوو. لە حاڵێکدا خۆشی "مۆدێرن" هەم لە دیدی ئەندێشەوە رەوایە و هەمیش لەگەڵ پێکهاتەی رەوانی تاکدا ناکەوێتە کێشە و ململانێی بناغەیی. ئەگەر چاوێك بخشێنین بە مێژووی سەرهەڵدانی ئەندێشەدا لە سەدەکانی دواییدا دەبینین کە "بێنتامی"ی ئینگلیزی، باوەڕی ئەوتۆی بە خۆشگوزەرانی جەماوەر بوو، (*Social Hedonism*) و "شۆپێنهاوێر"یش بە پێڕەوی لە "ئەرەستو" تەنیا دۆزی رەوای ژیانی بە کامجۆیی و لەزەتخوازی و پارێزکردن لە ژان و دەردی دەزانێ.

## پێکهاتەی کەسێتی مۆنتاژکراو:

لە وڵاتگەلێك کە پرەنسیپە فەرهەنگی و هزرییەکانیان لەگەڵ تەکنۆلۆژی مۆدێرندا، سازگار و گونجاو نییە یان لەگەڵ ئەم دیاردەدا وان لە کێشمەکێش و ململانێدا، گەشەی پیشەسازی ئەو وڵاتانە لە فۆرمی "مۆنتاژ"دا دێتە نواندن. پیشەی مۆنتاژ، پیشەیەکە کە پارچە شتوومەکە پیشەییەکان لە هەندەران دەهێنرێ. وڵاتی هێنەریش ئەوانە لەیەك سوار دەکا و تێکیدەئالاوێ. بێ ئەوەی کە هێنەر هێشتا "فرانکشتاین"ی کەجبەختی پەروەردە کردبێ و رۆحیات و فەرهەنگی ئەوی کە هەمان ئاکارگەلی راسیۆناڵیتەیە، پەرە پێدابێ، کەوابوو تەوژمی ئەندێشەی مۆدێرن، لەم وڵاتانەدا کەسێتییەك پێکدەهێنێ کە پێدەگوترێ "کەسێتی مۆنتاژکراو" یانی رۆچوونی ئەندێشەکانی نوێ بە جەستەی کەسێتی دەسەلاتخوازدا، هەروەها کە تەکنۆلۆژی نوێخوازیاری کۆمەڵگەی نوێیە، هزری نوێش خوازیاری کەسێتی نوێ دەبێ.

بەم هۆکارەیەوەو لەسەر هۆکاری بنەماییتریش، هیچکام لە تەکنۆلۆژی ئەندێشەی مۆدێرن ناتوانن ئاکامی نوێیان لە کۆمەڵگەی نەریتیدا هەبێ.

دەبێ هاوکات لەگەڵ هاتنی بەرهەمە پیشەیی و فیکرییەکاندا باشتر وایە کە بنەمای کەسێتی توێژینەوەی رەوانشیکاری بکرێت، یانێ وەك رەوشی ژیان و ماریفەتناسی چاو لە مۆدێرنیتە بکەین. کاتێك دەڵێین وەك مودێرنیتە، یانێ روو بەڕوو دەبین لەگەڵ رەوشی ژیان و دەبێ ئەمە دەروونیش بکرێ، لانیکەم دەبێ ئەمە روون

بکەینەوە کە مۆدێرن بوون لەگەڵ ڕۆژئاوایی بوندا چ جیاوازییەکی هەیە. تاقمێك لە تیۆریستە ئۆروپاییەکان وەك "ئێسپێنسێر" لە بارەی بەرزبوونەوەی کۆمەڵگە لە قۆناغی نێزامیخوازی بۆ پیشەیی: دەڵێ: مۆدێرنیزاسیۆن دیاردەیەکی سروشتییە. کەوابوو هەر وڵاتێك دەتوانێ خۆی مۆدێرن بکاتەوە و بێ ئەمەیش ببێتە لایەنگری ڕۆژئاوا. بەمەیش عوزرو بیانووەکانی ئیمپریالیزم و ئوریانتالیزم بۆ سەیتەرە بە مل وڵاتە لە دۆخ گەشەسەندنەوەکاندا، ڕەت بکرێتەوە. ئەمە هەر ئەو وتەزاتە کە بیریاران و نۆژەکانی ژاپۆنی لە خولەکانی نۆژەنیدا (*Meigi Restoration*) بەخۆیەوە سەرگەرم کردبوو. 150 ساڵ بەر لە ئێستا ژاپۆنییەکانیش گەیشتنە ئەم دوو ڕێگە کە چی بکەن، ببنە ڕۆژئاوایی یان مۆدێرن. لایەنگرانی ڕوانگەی (ئیسپێنسێر) بەڵگەیان دەهێنایەوە بڕیارە ڕەوتی پێشەوەچوونی مێژوو بەرەو چەمکی مۆدێرنیتە دەڕوا، ئەوا هەموو کۆمەڵگەکان دەتوانن دێر یان زوو پێ بنێنە نێو گۆڕەپانی مۆدێرنیتەوە، بێ ئەوەیش ببنە لایەنگری ڕۆژئاوا، بە تایبەت کە ژاپۆن لە قۆناغی نیزامیخوازی و فئودالیەتدا تێپەڕی بوو.

پێش هەرەسهێنانی شۆرەوی و هیوا بە شۆڕشی جیهانی کۆمۆنیستی یان تێکڕامانی سەرمایەداری، لانیکەم کێشەی سەرەکی زۆربەی سۆسیالیستەکان، یەکبوونی پەراوێزنشینانی زەوی بوو، چ ڕۆژئاوایی و چ ڕۆژهەڵاتی. بە لەونێکیکە کێشەی کۆتایی، ڕۆژئاوایی، مۆدێرن بوون نەبوو، کە ئەمە لە خۆیدا بە چەشنێك ئامرازی چەوساندنەوە و "ئیستیعمار" و چەشنێك لە خۆ نامۆ بوون (ئیلیناسیۆن) بوو. لەلایەکیکەوە کۆمۆنیزم وەك چییەتیەك دەژمێررا، پێوەر بۆ هەموان چ کرێکار و چ ڕۆشنبیر، پێوەرێکی "دۆزەخیانە" بوو. گرینگ نەبوو چین و کامەن. لە چاخی دەسەڵاتی سەرمایەدا مرۆڤ ناتوانێ ئەوەی کە ئەیەوێ ببێ. ڕۆژهەڵات نەیدەویست و نەدەبا لە هۆکارگەلێك کە بووبوە هۆی نزمبوونەوەی ڕۆژئاوا، پەند وەربگرێ، نە لە لیبرالیزم و ئازادییەکەی و نە لە یاسا و ئاکارگەل و پێودانگەکانی. بەڵام هەنووکە پاش هەرەسی شۆرەوی و داڕمانی "سۆسیالیزم" ڕۆژهەڵات دووبارە لەسەر دووڕیانی شیمانەدا قەراری گرتووە، ئەمجارەیش وتەزای "کۆمەڵگەی مەدەنی" پێی زیادکراوە کە کێشەکەی لە حەوزەی سۆسیایی ئابووری دەرهێناوەو خستوویەتە ناو حەوزەی سیاسی فەرهەنگییەوە. کۆمەڵگەی مەدەنی ئێستا پێکهاتە لەسەر وزە جەماوەرییەکان و دژ بە دەسەلاتخوازیشە. کێشەکەی، ئازادی و بەرپرسێتی و گەشکە و.. یە، ئەو چەمکەی هەنووکە لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و تەنانەت ئەمریکایش لەسەر زاری خەڵکاندایە. کەوابوو پێویستە هەڵوێستی خۆمان لەهەمبەر تایبەتمەندییەکان و پرەنسیپەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، مۆدێرنیتە و ڕۆژئاوا ڕوون بکەینەوە.

یەکێك لە پرەنسیپەکانی مۆدێرنیتە و کۆمەڵگەی مەدەنی (ئینتزاعی) بوونی مرۆڤە و هەروەهایش یاسامەداری. مرۆڤی ئینتزاعی، خوازیاری قانون (یاسا) و ئازادییە تا وەك مرۆڤی ژاپۆنی لەسەر چارەنووسی و چییەتی خۆی باس بکات، سەربەستانە نە لە ڕووی ملەجێڕێ و شۆڕش یان سەربەژێری، ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە. چییەتی و بوونی "من" سەرەتا دەبێ سەربەخۆ و سەربەست، بێ ژێر دەستی، ڕابهێنرێ و پەروەردە بکرێ، لەم حاڵەدا هەبوونی تاك، لە دیکەوە ناگیرێ و لەسەر حەیسییەتی سەربەخۆی خۆی وەستاوە. ئەم حەیسییەتە (چییەتییە) ئیدی نە ڕۆژئاواییەو نە

رۆژهەڵاتی، بە پێچەوانەی ئەم رووکردە ئەندێشەی نوێ لەگەڵ "من"ی پەککەوتەدا دەکەوێتە کێشە و ململانێوە، ئەندێشەی نوێ لەسەر بنەمای ماریفەتی نوێیە، وا لە جەستەی ئەم "من"ە ژێکەڵەدا. "من"ی نەریتی و دواکەوتوو، هەروەها کە ئاماژەی پێکرا، لە رێگای ئاستەنگی و سەرکوتییەوە، ماریفەت، دەخاتە گەڕی خۆی، نە لە بواری عەقڵییەت و یەکسانی مەدەنییەوە. ئەو "من"ە زۆرتر وا دووی نیازی مێژوویی خۆیەوە یانێ سەیتەرە و شکانەوە بە مل ئەویدیدا. ئەگەر "من" بۆی نەبێ لەسەر بنەمای بەرپرسێتی و خودموختاری رێژەیی بڕیار بدات، ئاوەزیش لە سازوکاری رەوانی تاکدا دەبێتە ئامێرێك لە خزمەت دەسەڵاتخوازیدا. بۆیە دەڵێن ئاوەز (عەقڵ) دوو جۆرە: یەکەم ئاوەزێك کە هەڤاڵ و هاوڕێی شکی مەدەنییەو مەیلە و گەشکەی هەیە و دووەم ئاوەزێك (ئیقائی)یە و وا لە ژێر سوڵتەی دەسەڵاتخوازی "من"ی لاوازدا. ئەم ئاوەزە، دژبەری کۆمەڵگەیە و لە رەهەندی ئەوەڵدا ئەندێشە و ئاوەز لەگەڵ جەوهەری مەدەنییەتی تاکدا جۆشدەخوات، دکارتیش بە چاوکردن لە هەوێنی باسەکەی بوو عەلی سینا لە بارەی "بوون"وە رەدووی چەمکی "ناسین" کەوت. (*Cogito ergo sum*) ئەگەر رێژەی کۆمپانییەك لە وڵاتانی ئێمەدا نێوان 8 تا 10 لە سەدا بێ، نابێ رێژەی هزرکردنەوە و ئەندێشە نوێیەکانیشمان پتر لەمە بێت. بۆ؟ بۆ ئەوەی کە ئەو ئەندێشە گەلە پتر لە وتەزای ئەندێشە دەمێننەوە یان بە چەشنی رستەگەلێکی جوان لەسەر کاغەزدا دەنووسرێنەوە و یان دێنە گۆکردن. واتە ناگەنە قۆناغی کردە، یانێ ئەو ئەندێشەگەلە لەگەڵ بنەمای کەسێتیدا، جیایی و ماوەو بۆشاییان هەیە. پێکهاتەی کەسێتی وەدووی شتێکەوەیە و هزرکردنەوەیش بە شوێن شتێکیکە. بنەمای کەسێتی وا لە دووی سەیتەرە و ژێر دەستخستنی دیتران و هەروەهایش ئەیەوێ هزرکردنەوە، ئامرازێك بێ بۆ وەگەڕخستنی دەسەڵاتی ئابڕوو و سەرپۆشێك بۆ شاردنەوەی پەککەوتە لاوازییەکەی. بیرکردنەوەی نوێ وا لەهەوڵدا کە سەربەستانە چالاکی بۆ وەگەڕخستنی رواندن و لەدایکبوون و مەدەنییەت، هەمیش لە پێکهاتەی کەسێتی نەریتی و رەوشەدەس و پاگیرەکان دەرباز بێت. بە چەشنێکی دیکە ئەندێشە نوێیەکان وەنەسەرێکی نائاشنا و نامۆ کە لەسەر جەستەیەکی رزیو و دێریندا لکابێ و مۆنتاژ کرابێ. ئەگەر چاوێك بخشێنین بەسەر بزووتنەوە (بزاڤە) مۆدێرنەکانی ئێران تا پێش لە دەهەی 50، ئاخێزگەی هەموویان هزر و ئەندێشەی پێشڕەو و نۆژەن، یان لانیکەم هاندەر و پشتیوانێك بوون بۆ ئەمانە، بەڵام ئەم شۆڕشانە بۆ گیان بەختکەرەکانیان ئەوەی کە ئارەزوویان دەخواست کاردانەوەی نەبوو و نەگەیشتە ئەنجام. بێ گومان هەروەها کە پیشەسازی مۆنتاژ، تاڕادەیەك دەبێتە هۆی پێشکەوتنی وڵات، مۆنتاژکردنی ئەندێشە نوێیەکانیش دەبنە هۆی رووناکی فەرهەنگی نەریتی، (بابڵێین) خەنەکەی بێ هوودە نەبووە. دۆزی بزاڤی مەشرووتە، یاسا خوازی بوو، لە بەستێنەی ئەم بزاڤەدا پەرلەمانێك لەدایکبوو کە لە واقیعدا دیویتری سکەی مۆنتاژ بوو. پاشان هەر ئەو پەرلەمانە بوو بە ئەمرازێك بۆ پاوەنخوازان و دەسەڵاتچیان کە جەغزی سوڵتەی خۆیان بەرینتر بکەن. بزوتنەوەی میللی بوونی نەوتیش دۆزی گەیشتن بە لیبرالیزم و دیموکراسی بوو، تیشکۆی جەماوەر زۆربەیان لەم ئایدیا و بۆ چوونگەلە، پێشوازیان کرد، بەڵام بە کردە، ئەم دیموکراسی هەڵێنجراو لەو بزاڤە، چەن ساڵ پتر تەمەندار نەبوو.

شاو ئامریکا و بەکرێگیراوەکانیان، بە سیخوڕکاری توانیان زۆر بە ئاسانی لە ماوەی چەن ڕۆژێکدا ئەم بزوتنەوە بڕوخێنن. لەم شۆڕشەی دوایشدا جەماوەر بۆ ئازادی هەستانەوە، بەڵام ئەو ئایدیا و ئاواتە کە خوازیاری هەموان بوو، نەهاتە گەڕ. هۆکارگەلی ئەم دیاردە چۆن بتوانین شیبکەینەوە؟

لەم سەد ساڵەی دواییدا، جگە لە ئەندێشە مۆدێرنەکان، شێوەگەلی مۆدێرنی شێوەکاری، شیعر، ئەدەبیات و فەلسەفەیش، مۆنتاژی هەمان فەرهەنگی نەریتی کرا، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵانە و ئیهتمامێك کە خاوەندارێتی ئەو ئادیانە بۆ ئاوەژوو کردنی ڕۆحیاتی دەسەڵاتخواز کردیان، چەندان کاردانەوەیەکی نەبوو. سانسۆری دەوڵەتیش هەمیشە کۆششی دەکرد کە تا ئەو رادە ئەو ئەندێشە گەلە مۆنتاژ بکرێ کە زیانێکی بۆ سیادەتی جەغزی دەسەڵات نەبێ. ئاوەها ڕەهەندێکی هزری بە ئاقارێکدا دەڕوا کە پاش ماوەیەك پێدەچێ یەککەوتوو بمێنێتەوە و نەتوانێ شتێك بخوڵقێنێ و ئەفراندنی هونەری و ئەدەبی لە ڕێڕەوی سەرەکی و ئینسانی خۆی لابدات و بگرە ببێ بە پێخوست (لەقە شێل) تاوەکوو بێتەوەگۆ. بە توێژکاری نوسینەکانی کەسێتی مۆنتاژکراو، لە بارەی بابەتگەلی فەلسەفی و کۆمایی، دەبینین نووسەر بە چەشنێك هەستیارانە ئەو بابەتانە دەنووسێ کە مرۆڤ نەتوانێ لە دروست بوونیدا شیمانە و گومان بکات. چوون مودێرنیتە لەسەر بنەمای ئاوەز (راسیۆنالیزم) پێکهاتووە کەوابوو بۆی نییە بە دەمارگرژی و هەستیارییەوە، بشێ شیتەڵکاری و راڤە بکرێ. بۆ وێنە، ئەندێشەی یەکسانی ئافرەت و پیاو و بەرپرسێتی و ئازادی، جار هەیە وەك دیاردەیەکی ئاکاری، دروشم ئامێز، ئینتزاعی (زەینی) یان بڵێن مۆنتاژ کراو وێنا دەکرێن، نەك لەسەر بونیادی عەقڵانییەت و ماریفەت و توێژکاری، یانێ بیرمەند، دەبێ بە یەکسانی ژن و پیاو و پێوەندی لەگەڵ زارۆ و فەلسەفەی سیاسی ئەم دیاردە خۆی خەریك بکات و لە کردار و تەجروبەی ڕۆژمەڕەدا ئەم کێشە بخاتە ژێر تیشکی ئەزموونی خۆیەوە.

## پەروەردە و ڕاهێنانی "من"ێکی بە وزە و پێکهێنانی خێزانێکی مۆدێرن و دیمۆکرات.

بەختەوەرانە، لەو کاتەوە کە گریمانەی "دەروونشیکاری من" لەلایەن "ئانا فرۆید" و پاشان "ئێریك ئێریکسۆن"ەوە هاتە گەڕ، نامیلکەیەکی زۆر لە بارەی مەنهەجەکانی گەیشتن بە متمانە بە نەفس و ڕاهێنانی کەسێتی سالم بە زمانێکی ساکار و ئاسان چاپکراون، ئێریك ئێریکسۆن بۆ وەدەستهێنانی کەسێتی سالم و تاکی عەقڵانی لە زارۆکییەوە، تا لێکەوتوویی 9 قۆناغ دەخاتە سەر سفرەی پێشنیاز، ئەوانیش ئەمانەن:

متمانە و دڵنیایی لە بەرامبەر نامتمانەیی، سەربەخۆیی لە بەرامبەر شەمساری و دوو دڵی، خوڵقاندن لە بەرامبەر هەست بە گوناحکردن، تێکۆشان لە بەرامبەر هەست بە خۆکەمبینی، چییەتی لە بەرامبەر وڕبوون لە چییەتی، نزیکی لە بەرامبەر جیایی، بزاوتوویی لە بەرامبەر وەستاوی، سەرەنجام، غیرەت و جوامێری لە بەرامبەر بێ هیوایی و ناهومێدی[9].

سروشتییە کە ئەگەر تاکێك بەشێوەی ناتەواو لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر تێپەڕبێت تووشی پەرۆشکاری و ئاڵۆسکاوی دەبێ. لەم ساڵانەی دواییدا وتەزایەك پێی ناوەتە ناو گۆڕەپانی زانستە ڕەفتارییەکانەوە، ئەویش ناوی "زاڕۆ دەروون"ە. لەسەر بنەمای تیۆرەکەی فرۆید یان ڕوانگەی

دەروونشیکارانی "من"، قۆناغی زارۆکی لە قۆناغە هەستی بەخش و کارسازەکانی، ژیانی مرۆڤە. دەبێ زارۆی فەرامۆشکراوی دەروون، دووبارە بدۆزرێتەوە. ئەو زارۆوە سەرکوتکراو و کۆیلە کە لە ترسدا لە دوو تۆی ناخدا خۆی بزرکردبوو. لە خۆشی و شادی و هەڵپەرکێ و پێکەنین بسڵەمێتەوە و رووبکاتە زیارەت و مازۆخیزم، هەروەها دەبێ لە هەمبەر زێدەرۆیی و پێخوستکردنی پێداویستیە جڤاکیەکان و.. هەڵوێست بگرێ. لێرەدا کە کەسێتی مرۆڤ هێدی هێدی لەو پێشهاتگەلە، دەرباز دەبێت. پەروەردەی زارۆڵەی توکمە لەگەڵ راهێنانی کەسێتی "من"ی پڕ توانست و ئاگا، یاری دەدات کە ئەندێشە نۆژەنە ئاوەزخوازەکان لەگەڵ پێکهاتەی کەسێتیدا، نەکەونە کێشە و ململانێوە، لێرەدا سەرەرۆییەکان تارادەیەك هەوساریان دەگیرێ و مرۆڤ تایبەتمەندی جڤاکی پەیدا دەکا. هەروەها کە پێشتر ئاماژەی پێدرا رەگ و ریشەی دەسەلاتخوازی وا لە چەشنی بارهێنانی خێزان و قوتابخانەدا. رێکخراوەگەلێك کە تەواو هەوڵەکانیان بارهێنانی "من" گەلێکی سەربەژێر و یەکسانن. باوك و دایك و مامۆستا (ئەبەر من) وەك سانسۆرچی رۆڵ ی هەمان ئورگانە تەفتیشکارەکانی بیر و باوەڕ، دەنوێنن، بەلام ئەگەر زارۆڵەکان لە هەمان دەسپێکدا ماڤ هەڵبژاردنیان هەبێ و تامی ئازادی و سەربەستی چەشکە بکەن. ئەو مافە دەبێتە پاژێك لە سروشتیان و تاکیش ناتوانێ لەوانی زەوت بکات. هەروەها بەشداربوون لە بڕیارگەلی بنەماڵە و هەڵخڕاندن بە هزرکردنەوە و شیمانە و دژەبەری لەگەڵ دایك و باوك و مامۆستایان یەکێکە لە بنەڕەتیترین کۆڵەکەکانی ژیانی سیاسی کە بە زاڕوانی فێر دەکەین کە لەگەڵ دنیای زارۆلانەی خۆیاندا ئاشنابن و رێزی لێ بنێن. ئەمە خۆی سەفەرێکە بە دنیای زاڕوانە و مێرمنداڵیدا کە بە گوربزی گەشەی دووبارەمان پێدەبەخشێ. کەوابوو دەکرێ خێزان بە چاوی رێکخراوێکی سیاسی تەماشا بکەین.

دیارە هەموومان زاڕۆکانمان خۆش دەوێ، بێ ئەمەی ئەوان بناسین پاشان پێوەندی دوو لایەنە دروست دەکەین. ئەوینەکانیشمان جار، باس لە نیازێکی دەروونی خۆپەرستانە دەکات کە سەرچاوەکەی دووری و نامۆییە. لە پێوەندییەکانیشماندا لەگەڵ ئەواندا، پێدەچێ وەدووی دۆزینەوەی ونبووی خۆماندا بین. تاکی دەسەلاتخواز ژیانی وا لە تەنیایی رەهادا و هەر ئەم تەنیایی و دوورەپارێزییەتە کە تەنیا زاڕۆیەکی سەربەژێری و وابەستەی ئەوێ. "ئەو" بەهۆی پێنەگەیشتوویی خۆیەوە، تامڵی ئەوەی نییە کە بە زاڕۆکەی بڵێ "نە!" لە بەرامبەر پەرچەکرداری مناڵەکەی و مێردمنداڵەکەی هەترەی دەچێ و دەتۆقێ. هەروەها تەمێ و توند و تیژی بۆ چوونە ناو کۆمەڵگەی مەدەنی رێکارێکی پەسەندکراو نییە، تەمێ بەهەر چەشنێك بێ دەبێتە هۆی تێکدانی سامانی دەروونی زاڕۆ، دانی بەرتیل و ڕشفەیش یان تاریفی نابەجێ، لەجێی تەشویق و پاداشت[10].

هەردووی ئەمانە زاڕۆ بە دایك و باوك وابەستە دەکات. بەهەر حاڵ لەخۆ نامۆ بوون و زۆر سەرەڕۆیی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی یان پێداگری دەسەلاتی بێ یەك و دووی "ئەبەر من". دەبێ بزانین سروشتی سەربەستخوازی زاڕۆ پاش لەدایك بوون، وەك تەواو مالات، هێدی هێدی لە ژیانی فیزیکی و رەوانیدا دەفراژوێ و گەشکە دەکات. تەنانەت مالات لە رەوتی ئەو سەربەستییەدا، لە کاروباری کۆرپەلەکانیاندا دەستێوەردان ناکەن، بەلام مرۆڤ بەهۆی لاوازییەك کە فەرهەنگی رزیو و نەریت، بە

سروشتی ئەوی بەخشیوە، تیشك و هەڵمی خۆگەردانی و سەربەستی لە زارۆکەی زەوت دەکات.

## تەتڵەی باسەکە:

فرۆید لەو باوەڕەدا بوو کە لە ئاکامدا ناخۆئاگا (نەست) و غەریزە سەرکوتکراوە داخراوەکانی مرۆڤ، هەوساری ژیان دەگرنە دەست، بە پێچەوانەی قوتابییەکەی، "یۆنگ" زۆر لە هەمبەر نەستدا وەك پێشەوایەکی خاس و جێی متمانە خۆشبین نەبوو. لە روانگەی ئەودا سەرجەمی رەوتەکانی ژیانی مرۆڤ لە هەمان پێنج ساڵی هەوەڵی ژیاندا کۆ دەبێتەوە و ئاڵۆزی رۆحی مرۆڤیش لە ململانێ لبیدۆدا، یانێ وزەی مەیلە خۆرسکە جنسییەکان لەگەڵ "من" و "بەرزە من"دا پێکدێ. بەڵام هیوایەکیش هەیە کە مرۆڤ تا دەتوانێ ئەبێ نەستی ناخۆئاگای بەرەو هەستی خۆ ئاگا راکێش بکات و ئەم دیاردەیەشە تەنیا بە دەروونشیکاری (پسیکۆنالیز) و گۆ دەرمانی یا خۆدۆزی دێتە کردە و عەمەل. گریمانەی فرۆید لە بارەی کێشە لبیدۆ لەگەڵ "من" دا ئەو کاتە لەگەڵ پێشهاتی هەنووکەییدا بەرانبەری دەکات کە "ئەبەر من" جێگری "من" بکەین. لە بنەڕەتدا سەرکوتی چ لایەن "ئەبەر من"ەوە بێت یان دەوڵەت، توند و تیژ ئامێزکردنی سیمای هەموو شتێك و کێشاندنی بەرەو ئاقاری پەنهانی و بزرکردنی درۆینە (کازب)، بۆ ئەوەی حکوومەتی سەرکوتگەر لە خۆئاگایی پێشوازی ناکات. هەر بەم بۆنەوەیە کە زۆر هەوڵدەدا کە "پەنهان، بزرکراو" ئاشکرا نەبێت (بەواتە قاو نەدرێت).

سەرکوتی لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە دەبێ قارامێز و داپڵۆسێنەر و "ئاشکرا" بێ تا بتوانێ ئاسانتر لە غامی جەماوەر بجەڕێنێ. سەرکوتکردن لە راستیدا خەباتێکی توندوتیژ ئامێزە لەگەڵ خۆئاگایی و دامرکاندنی بێرەحمانەی داخوازەکان و سەرخۆشییەکانی قۆناغی زارۆکی. لە روانگەی "ویلهێلم رایش"ەوە، سەرخۆشییە زارۆکییەکان و خولیا نایابەکانی مرۆڤ، دەبێ خەباتێك بن لەگەڵ سیستەمی لیبرالیزم و گەیشتن بە ئارمانج شاری "سۆسیالیزم"، چ جەوهەرەی ئەو داخوازگەلە، عەشق و بەرخۆدانی ژیانی زارۆکی بێ، چ هێمای خۆ ئاگایی ژنان و لاوان، و چ ئەندێشە و ئەرزشە سۆسیایەکانی مودێرن.

پێدەچێ کە لەم ساڵانەی دواییدا، جەماوەری ئێران بە بەشداری لە بزووتنەوەی خۆدیتن و خۆدۆزینەوە لە دەروونشیکاری (پسیکۆنالیزم)ی ژیان بەخشدا، بۆ هەمیشە وەك هێزگەلێکی خۆئاگا و ئازادیخواز بە تایبەتمەندی ساکاربینی و فرەخوازییەوە، بتوانن سیستەمێکی دیمۆکراتیك پێکبهێنن.

لەسەدەی بیست و یەکدا، بگرە تا کەشفی "خود" و بارهێنانی بەربڵاوی "من"ی وزەمەند، پێکەوە ژیان لەگەڵ کەسێتی مۆنتاژ کراودا، تەنیا رێگەی چارەسەر بێ.

## پەراوێز

1–ئیمیل دورکیم، یەکێکە لە نەیارە سەرسەختەکانی لەبەرچاونەگرتنی (گرایش)ەکانی دەروونشیکاری لە کۆمەڵناسیدا.

2–جێگای سەیرە لە روانگەی "لاکان"ەوە، ئەم "من"ە "لۆکاتە"یە.

3–ئەم رەگەزە لەلایەن"ئیبراهیم ماسلۆ" دەروونشیکاری ئامریکایی بەکاربراوە.

4–حنا الفخوری، خەلیل ابحر، وەرگێڕان عەبدولحەمید ئایەتی: تاریخ فلسفه در جهان اسلام، سازمان انتشارات و اموزش انقلاب اسلامی،چاپ سوم 1367 تهران،ص 12.

5-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

6-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 520

7-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 521

8-ا.ج. ئاریانپوور: فرۆیدیسم، شرکت سهامی کتاب های جیبی امیر کبیر)، تهران، 1357 ص.194

9-اریك اریکسون *Childhood and society ww.norton* و *New york. 1950*.

10-لەم بارەوە بڕوانە کتێبی (عوارض منفی تنبیه) هەر ئەم نووسەرە، چاپی تابان 1371.

## سەرچاوە

مانگنامەی کلك ژ: 151 بەفرانباری 1383 هەتاوی (فێبرایەری 2005) ل: 22-26.

# سەرەتایەك دەربارەی ئەرەستۆ

ویل دیورانت
لە ئینگلیزییەوە: عوسمان ئەحمەد

ئەرەستۆ لە ساڵی 384 پ.ز لە ستیگارا لە دایك بووە، ستیگارا شارێکی مەکدۆنییەو 100 میل لە ئەتیناوە دوورە و دەکەوێتە باکوری ئەتیناوە. باوکی ئەرەستۆ هاوڕێ و پزیشکی ئەمینتاسی پاشای مەکدۆنیا بووە کە باپیری ئەسکەندەر بووە.

سەرەتا ئەرەستۆ وەك یەکێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵەی پزیشکی ئەسکیبیادس دەرکەوتووە. لە کەشێکی پزیشکی و پاکی و دادپەروەرانەدا پەروەردە بووە هەر وەك هەندێ لە فەیلەسوفەکانی دواتریش لە هەمان کەشی پاکی و پیرۆزیدا گەورەبوون، ئەو بوارە زۆرەی بۆی ڕەخسابوو هانیدا بۆ ئەوەی بە عەقڵییەتێکی زانستی گەشە بە خۆی بدات. ئەرەستۆ هەر لە سەرەتاوە ئامادەکرابوو بۆ ئەوەی ببێتە دامەزرێنەری زانست.

ئێمە لێرەدا هەندێ چیرۆك لەسەر ژیانی گەنجێتی هەڵدەبژێرین. چیرۆکێك وای نیشان دەدات بەهۆی ئەوەوە کە لە ژیانێکی توندوتیژدا ژیاوە سامانەکەی لەدەست داوە. بۆ ئەوەی لە دەست برسێتی و قات و قڕی ڕزگاری بێت پەیوەندی دەکات بە سوپاوە. دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ستیگاراو سەرقاڵی کاری پزیشکی دەبێت، وە لە تەمەنی سی ساڵیدا دەچێ بۆ ئەتیناو لەوێ لە ژێر سەرپەرشتی ئەفلاتوندا دەخوێنێت. بەڵام چیرۆکێکی تر وای دەگێڕێتەوە لە تەمەنی هەژدەساڵیدا چووە بۆ ئەتینا، لەو کاتەوە لە ژێر سەرپەرشتی مامۆستای گەورە (ئەفلاتون) دانراوە، بەڵام هەتا زۆرتر بەپێی پێویست ئەم چیرۆکانە ڕوون بکەینەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەرەستۆ ژیانی گەنجێتی زۆرتر لە گەمژەیی و بێ سەرەو بەرەیی دا بەسەر بردووە، هەر لەم میانەیە چیرۆکێکی تر ئاماژە بەوە دەدات کە ئەرەستۆ لە ژیانێکی ناوازەی سەرکێشدا ژیاوە[1]. دواجار هەموو چیرۆکەکان لەوەدا یەك دەگرنەوە کە فەیلەسوفەکەمان لە کۆتاییدا لە باخچە هێمنە بچوکەکانی ئەکادیمیادا نیشتەجێ بووە.

بۆ ماوەی (8–10) ساڵ لە ژێر سەرپەرشتی ئەفلاتوندا وانەی خوێندووە، لە ڕاستیدا تێڕوانینەکانی ئەرەستۆ بە ئەفلاتونیزمێکی سەراپاگیر دادەنرێن. ئەمەش ئاماژەیە بەوەی

(10)ساڵ لە ژێر وانە و لێکۆڵینەوەکانی ئەفلاتوندا نقوم بووە -ئەمە سەرەڕای ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ بۆچوونەکانی دژی ئەفلاتونیەت- خستونەتەڕوو.

بەڵام باشتروایە ئەم ساڵانە وەك ساڵانی خۆشی ئەرەستۆ سەیر بکەین، قوتابییەکی زرنگ بووە و بەهۆی مامۆستایەکی بێ هاوتاوە ڕێبەری کراوە، هەروەك عاشقە یۆنانییەکان لە باخچەکانی فەلسەفەدا پیاسەی دەکرد. بەڵام هەردووکیان (ئەفلاتون و ئەرەستۆ-و-) کارامە و لێهاتوو بوون، لەوانەیە لێك تێگەیشتنی نێوان دوو لێهاتوو کارێکی قورس بێت چونکە ئەمە وەك گونجانی ئاگر وایە لەگەڵ دینامیتدا.

جیاوازی نێوانیان نزیکەی نیو سەدەیە، تێگەیشتن لەوێستگەی ناگونجاوییان کە لەو ساڵانەدا ڕوویداوە زۆر قورسە، ئەم ناکۆکییە بۆتە پردێکی ناکۆکی لە نێوان ڕۆحەکانیاندا. ئەفلاتون هەستی بەوە کردبوو ئەم قوتابییە تازە نامۆیەی کە لەبەر بەرییەکانی باکوری ئەتینا بوو زۆر مەزنە، وە ئەفلاتون وەك بەرجەستەکەری زیرەکی ئەکادیمیا وەسفی کردووە - ئەرەستۆ زۆر دەستبلاو بووە هەر پارەیەکی هەبوایە بۆ کڕینی کتێب خەرجی دەکرد "ئەمەش، ئاماژەیە بەوەی لەو ڕۆژگارانەدا نووسین و بەڵگەنامەکان دەستنووس بوون و چاپ نەکرابوون"، لە دوای یۆریپیدس ئەرەستۆ یەکەم کەس بووە کتێبی کۆکردۆتەوە و کتێبخانەی داناوە، وە هەر ئەو بناغەی جیاکردنەوەی کتێبخانەی داناوە و کتێبە زانستییەکانی جیاکردۆتەوە. وەك ئەفلاتون بە ماڵی ئەرەستۆی ووتووە "ماڵی خوێنەران" ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی دەربارەی ئەرەستۆ ووتوویەتی گوزارشت کردنێکی زۆر دڵسۆزانەیە. هەندێ قسەڵۆکی کۆن هەیە گوایە مامۆستاکەی نیازێکی خراپی هەبووە، لەوانەیە ئەمە سەرەتای ئەو ناکۆکییە ڕاستەقینەیە بێت کە لە کۆتایی ژیانی ئەفلاتوندا لە نێوانیاندا سەری هەڵداوە. وەك دەڵێن بەرزیخوازییەکانی (تموحەکانی) گەنجیمان "گرێی ئۆدیب" لە دژی باوکایەتی ڕۆحی لەناو خۆشەویستی فەلسەفەو ئارەزووکردنیدا گەشەی کردوو، ئەم دەستپێکردنەش نیشانەی ئەوەیە کە پێویستە دانایی لەگەڵ مردنی ئەفلاتوندا نەمرێت، لەم کاتە دانایەکی پیر (ئەفلاتون) قوتابییەکەی پێکدەچوێنێت لەگەڵ جوانوی ئەسپدا دوای ئەوەی تینوی دەبێت و دایکەکەی دەمژێ و ووشکی دەکات دایکەکەی دەداتە بەر جووتە؟ زیلەر هەستی بەمە کردووە، ئەو کەسەی لەناو لاپەڕەکانی ئەرەستۆدایە زۆر هەوڵی بە دەستهێنانی نێرڤانا دەدات بەشێوەیەکی گونجاو، ئەو چیرۆکانەی لەبەردەستماندان پەسەند ناکرێن، بەڵام لەوانەیە ئێمە وای دانێین لە هەر شوێنێکدا ئاگری لێ بێ ئەوا دووکەڵیشی لێیە (واتە هیچ ئاگرێك بێ دووکەڵ نابێت - وەرگێڕ) تا ئێستاش لایەنەکانی تری ژیانی ئەرەستۆ لەو ماوەیەی کە لە ئەتینابووە (ناڕوونە) ناجێگیرە و شایانی گریمانەکردنە، هەندێ ژیاننامەنووس پێمان دەڵێن ئەرەستۆ قوتابخانەی گوتار بێژی دامەزراندووە و کێبڕکێی لەگەڵ "سۆکراتدا کردووە، لە ناو قوتابخانەکەی دا هێرماسی دەوڵەمەند هەبووە، کە دوای ماوەیەکی کەم بووە بە فەرمانڕەوای دەوڵەت - شاری ئەتارنیس. دوای ئەوەی هێرماس دەگاتە ئەو پلەو پایە بەرزە بانگێشتی ئەرەستۆ دەکات بۆ کۆشکەکەی، لە ساڵی 344 پ.زدا خەڵاتی مامۆستاکەی دەکات لە پاداشتی ئەو پشگیرییەی کە مامۆستاکەی لە ڕابردوودا لێکردبوو وە لە

پاداشتی ئەوەش کە خوشکەزاکەی دابوویەو ببووە هاوسەری. لەوانەیە پیاو وا گومان بەرێت کە ئەمە خەلاّتکردنێکی یۆنانی نییە، بەلاّم زۆربەی مێژوونووسەکان پەلەیان کردووە بۆ دلّنیاکردنی ئێمە لەوەی ئەرەستۆ زۆر لێهاتوو بووە. ژیانێکی خۆشی لەگەلّ ژنەکەیدا بەسەربردووە و زۆر بە ڕووخۆشی لەگەلّیدا قسەی کردووە. هەر سالّی دوای ئەمە فلیپی پاشای مەکدۆنیا ئەرەستۆی بۆ کۆشکەکەی بانگکردووە، بۆ ئەوەی پەروەردەکردنی ئەسکەندەر بخاتە ئەستۆ. دیارە ئەم بانگهێشت کردنە نیشانەی بەرزبوونەوەی ناوبانگی فەیلەسوفەکەمانە، کە لەلایەن گەورەترین پاشای ئەو کاتەوە، وەك گەورەترین مامۆستا هەلّدەبژێردرێ. هەلّبژاردنی ئەرەستۆ بۆ مامۆستایەتی ئەسکەندەر بۆ ئەو مەبەستەبوو کە ئەسکەندەر لە داهاتوودا ببێتە سەرداری دونیا.

فلیپ سوور بوو لەسەر ئەوەی هەموو پێداویستییەکانی فێرکردن بۆ پەروەردەکردنی کوڕەکەی دابین بکات، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو نەخشەیەی دایدەنا نەخشەیەکی فراوان بوو. کاتێك لە سالّی 356 پ.ز تراقییەی داگیرکرد فلیپ ڕێی بۆ خۆشبوو تا ببێتە خاوەنی کانەکانی ئالّتون دیارە ئەم کانزا بەنرخە دە بەرامبەر بوو لەگەلّ ئەو زیوەی کە ئەتینییەکان لە لیۆریۆم دەستیان دەکەوت دیارە دانیشتوانی وولاّتەکەی جووتیاری بەهێزو جەنگاوەربوون چونکە هێشتا ئاسودەییەکانی شار نەیشێواندبوون: بەهۆی فەراهەمبوونی چەند هەلێکی لەبار بۆی توانی سەد دەولّەت — شاری یۆنانی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە بەمەش توانی یەکیەتییەکی ڕامیاری بۆ یۆنان دەستەبەر بکات.

فلیپ سۆزی لەگەلّ تاکایەتی (ئیندیڤدوالیزم)دا نەبوو عەقلّ و هونەریشی بۆ ئەمە هاندەدا لە یۆناندا بەلاّم ئەمە لە هەمان کاتدا بووە هۆی تێکشکاندنی ڕژێمی کۆمەلاّیەتییان، خۆشی لە پایتەختە بچوکە شارستانیەکان و کلتورە دلّخۆشکەرەکان و هونەری بێ هاوتا نەدەهات، بەلاّم ئەمانەی بە بەرەنجامی گەندەلّی بازرگانی و بێ سەرەو بەرەیی ڕامیاری دادەنا. بازرگانە چاوچنۆك و خاوەن بانکەکانی بینیبوو کە چۆن سەرچاوەی ژیانی نەتەوە دەمژن و قۆرخیان کردووە بۆ خۆیان، ئەمە لە کاتێکدا توانای سیاسییەکان و زیرەکی ووتاربێژەکان خەلّکیان بەرەو ڕووداوی کارەساتبار و شەڕەکان دەبرد و خەلّکیان بەمەوە سەرقالّ دەکرد. چینەکانی کۆمەلّگەیان پارچە پارچە کردبوو بۆ چەند چینێك لە شێوەی کۆمەلّی بچوك و خێلّدا.

وەك ئەوەی فلیپ دەلّێت، ئەم نەتەوەیە بوونی نییە ئەوەی هەشە تەنها پشێوی و تێکەلّبوونی تاکەکانە —لە بلیمەتەکان و کۆیلەکان، فلیپ ئەم پشێوییە بەرەو سیستەم و یاسا دەبات، وە یەکیەتی یۆنان دروست دەکات و بە هێزی دەکات وە ئەمەش وەك بناغەیەکی لێدێت کە دەبێتە ناوەندێکی ڕامیاری بۆ جیهان. لە سەردەمی گەنجێتیدا لە تیباسی و لە ژێر سەرپەرشتی ئەپامینادۆسدا فێری هونەرەکانی ستراتیژی سەربازی و ڕێکخستنی مەدەنی بووە، ئەمەش ئازایەتییەکە کە هیچی کەمتر نییە لە وویست و ئارەزووەکانی.

سالّی 388 پ.ز ئەتینا تووشی لێدان هات، بەمەش یەکیەتی یۆنان پێکهات هەرچەندە ئەم یەکیەتییە وەك زنجیرەیەك پێکەوە بەسترابوو. وە دوای ئەم سەرکەوتنە نەخشەی بۆ کوڕەکەی دانا کە چۆن ببێتە سەرداری دونیا و لە ژێر دەسەلاّتی خۆیدا دنیا ڕێك بخات، بەلاّم هەستی بەوە دەکرد کە لە ژێر غافلّکوژیدایە.

کاتێك ئەسکەندەریان هێنا بۆ لای ئەرەستۆ گەنجێکی کێوی (13) ساڵ بوو، کەسێکی هەڵچوو و فێدار بوو، وە زۆر ئارەق خۆر بوو، ئەمەش کردبوویە دەستەمۆی ئارەزووەکانی و کاتەکانی لە ئارەزوییەکی دڕندانەدا بەفیڕۆ دەدا. سڵ نەکردنەوەی فەیلەسوف بۆ ساردکردنەوەی ئاگرێك کە لە بورکانێکی تازەوە دێتە دەرەوە سودێکی گەورەی دەبێت، ئەسکەندەر کاتێك لەگەڵ بوسیفالۆسدا بووە باشتر سەرفراز بووە و هەستی بەخۆشی کردووە وەك لەوەی کە لەگەڵ ئەرەستۆدا بووە "دیارە ئەمە تا ماوەیەك بووە" پلۆتارخ دەڵێت، "ئەسکەندەر ماوەیەك ئەرەستۆی خۆشویستووە بەڵام ئەمە تاماوەیەکی زۆر نەبووە وەك ئەوەی باوکی کە لەگەڵ ئەرەستۆدا هەیبووە، وە هەروەها دەڵێت ژیان لە یەکێکەوە فێربووە کە خەڵکانی تریش هونەری ژیان هەر لەوەوە فێربوون". (پەندێکی یۆنانی چاکی ووتووە "ژیان دیاری سروشتە، بەڵام ژیانی جوان دیاری داناییە") ئەسکەندەر لە نامەیەکیدا بۆ ئەرەستۆ دەڵێت "زیادەڕەویم کرد لەو زانیارییە باڵایەی کە زیاتر بوو لە زانیاری خۆم دەربارەی چۆنیەتی پەلهاویشتن و فراوانکردنی فەرمانڕەوایی یەکەم" بەڵام ئەمە نیشانەی ستایشکردنێکی پاشایانەی گەنجانە نییە کە لە ئەسکەندەرەوە نێردرابێ بۆ ئەرەستۆ.

لە پشت گڕوتینی فەلسەفەی نوێی ئەو چاخەوە مۆرکی شەڕانگێزییەکی گڕگرتوو هەبوو لە شازادەیەکی بەربەریدا، ڕێگرەکانی عەقڵیش نەیانتوانی بەر بەم هەستە ڕەچەڵەکییە گڕگرتووە بگرن. ئەسکەندەر دوو ساڵ دوای ئەوەی دەستی گرت بەسەر تەختی پاشایەتیدا وازی لە فەلسەفە هێنا. مێژوو ئەم ئازادییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە (هەرچەندە پێویستە گومانمان لەو هزرە خۆشانە هەبێت) وا باوەڕ دەکرێت ئارەزووی ئەسکەندەر بۆ یەکبون دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزی و گەورەیی مامۆستاکەی، کە گەورەترین بیرمەندە لە مێژووی هزردا دروست بووبێت، دیارە ئەمەش جەنگێکی ڕامیارییە لەلایەن قوتابییەوە، وە جەنگێکی فەلسەفیشە لەلایەن مامۆستاوە بەڵام هیچ یەك لەم دووانە جیاوازنین لە پڕۆژەی خانەدانێکی بە جۆش — دوو مەزنی مەکدۆنی دوو دنیای بێ سەرەو بەرەو پڕ لە ئاژاوەیان یەکخست.

کاتێك ئەسکەندەر بەرەو ئاسیا دەرچوو، بۆ هەریەك لە شارە یۆنانییەکان دەوڵەتێکی گونجاوی دانابوو، بەڵام جەماوەر بە توندی دژایەتی ئەم دەسەڵاتانەی دەکرد. چونکە ماوەیەکی زۆر لەوەو بەر میراتی ئازادی ئیمپراتۆرییەتی ئەتینا لەو شارانەدا جێگیر ببوو —هەتا ئەم پڕشنگدارییە دەستی گرتبوو بەسەر ستەمکاریدا— ستەمکاری بەرگەی نەگرتووە، هەمیشە قسە ڕەوانی دیموستین (کۆمەڵەی گشتی) هۆی هەڵنەگیرسانی شۆڕش بووە لە دژی "پارتی مەکدۆنی" کە جڵەوی فەرمانڕەوایی ئەو شارەی لە دەستدابووە. ئێستا لە کاتێکدا ئەرەستۆ گەشتێکی تری بۆ دەرەوە کردووە لە ساڵی 334 پ.ز دا وە دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە بۆ ئەتینا زۆر سروشتییانە پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەیەکی مەکدۆنییەوە. وە پشتگیری و هاوڕایی خۆی نەشاردۆتەوە بۆ ئەسکەندەر کە شارە یۆنانییەکانی ڕێکخستووەو فەرمانڕەوایی کردوون. لەکاتێکدا ئێمە ئەو کارە دیارانەی ئەرەستۆ دەخوێنین کەبەرەو پێشچوونی تێرامانو توێژینەوەکانی و لە دوازدەساڵی کۆتایی تەمەنی دا بڵاوی کردونەتەوە، وە لە کاتێکدا سەیری دەکەین، ئەرکە جۆراوجۆرەکانی قوتابخانەکەی ڕێکخستووەو لەگەنجینەیەکی مەعریفیدا گونجاندوونی کە ئەمەش

پێدەچێت پێش ئەو بەناو عەقڵی هیچ پیاوێکدا تێنەپەڕیبێت، هەر بەم بۆنەیەوە جارجار ئەوەمان دێتەوە بیر کە ئەمە بە دواداچوون و باسکردنێکی ڕاست و دروست نییە بۆ حەقیقەت، ئەمەش کەشێکی ڕامیاریی کە ئەگەری ئەوەی هەیە لە هەر ساتێکدا گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەمەش ڕوودانی گەردەلولە لەم ژیانە فەلسەفییە ئاشتیخوازییەدا. تەنها بەڕوونکردنەوەی ئەم هەڵوێستە لەهۆشماندا دەتوانین لەفەلسەفەی ڕامیاری ئەرەستۆ بگەین، کەکۆتاییەکی تراژیدی هەیە.

## پەراوێز

*1-Grate, Aristotle London, 1882, p.4; Zeller, Aristotle and the earlier perapatetics, London 1897, vol, I, pp. 6. f*

## سەرچاوە

*The story of philosophy by: Will Durant.*

# زمانی ڕووناکبیری و پێداویستی گۆڕانکاری بناغەیی

**موحتەرەم ڕەحمانی**

**لە فارسییەوە: عادل محەمەد پوور**

یەکێك لە خاڵە بنەماییەکانی لاوازی و داکشانی پرۆژەی بێ ئاکام و تا ڕادەیەك ناتەواوی ڕووناکبیری بۆ ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە کە زمانی ڕووناکبیری لەگەڵ دۆخی هەنووکەیی فەرهەنگی و سۆسیایی ئێمەدا گونجاو و تەبا نییە و لەسەر یەك کاردانەوەیان نەبووە. ئەم داکشانە، دەبێتە هۆی لە دەستچوونی هەندێکی زۆر لە هۆگران و ئاخێوەرانی دەستە جۆراوجۆرەکانی جڤێنگە، یان لانیکەم هەڵەتەبوونیان بە هۆی وڕبوون لە نێو تارمایی نادیاری و سەرگەردانیدا. هەر ئەم فاکتە حاشا هەڵنەگرە لە ماوەی سەدە و نیوێك لە گوتاری ڕووناکبیریماندا، لە ڕەوتی پەرەسەندن و گەشکە کردندا بووە کە وەك پێداویستییەکی زیپك هاتوەتە گۆڕێ بۆ ڕووناکبیران کە بە جیدی لەم کێشەیە توێژکاری بکەن و لێی بکۆڵنەوە. لەسەردەمی حکومەتی پەهلەویشدا، گوتارە ڕووناکبیرییەکان وەك:ئازادیخوازی و دیموکراسی و هەروەها گوتاری فەرمی حکوومەت، بەڵام بێناوەرۆك و بێ واتا،پێخوست دەکرا و ون دەبوو و جەماوەریش بە ڕووناکبیران وەك سەرچاوە و ڕێنوینیکەر متمانەیان نەبوو، کەچی لەناکاو نەیاری بەرامبەر یانێ "ڕۆحانییەت" بوو بەجێی باوەڕ و متمانە و دڵنیایی جەماوەر و لە نێو دڵاندا نیشتەجێ بوو.

بەڵام بۆ کرۆڵی لەم دۆخە زەمەنییەدا ئەو متمانە و دڵنیاییەی جەماوەر، لە گوتارە دینییەکانیش وەرگەڕاوەتەوە، ئەنجا گوتاری ڕووناکبیری دینی یان مەزهەبیش کە جاران لە کونجی دڵەکاندا گیرسابوویەوە و دڵبەری دەنواند، ئێستا کەوتووەتە ژێر سەنتەری گومان و شیمانەی هەموانەوە. چەمکگەل و وتەزاگەلێك کە لە نێوان توێژە ڕووناکبیری و ئیتنیکییەکاندا هاوبەشە، پتر بووەتە جێگای گومان و تارمایی واتاکان، کاتێك هەردوو ڕەوتی نەریتخوازی و بنەماخواز و ڕۆشنبیران، لە خودا، دین، ئاکار و.. دەئەخافێن، توێژەکانی کۆمەڵگە ئیتر چۆن مات و وڕ و سەرگەردان نابن. بەو پێیش زەمینە زەینییە 25 ساڵەیدا، ناتوانن متمانەیەکی ئەوتۆیان بەم گوتارە بێ، یەکیان ئەیەوێ هەموان بە زۆر بباتە بەهەشت، ئەویدی

ڕێگای نۆژەنی مەدەنییەت و پێشکەوتووی مرۆڤ و گەشکەی کۆمەڵگە دەگرێتەبەر، یەکێك بانگەشەی ئیسلامی ڕاستەقینە و دادگەری و تەنانەت یەکسانی لەگەڵ جاڕنامەی مافی مرۆڤ دەخاتە گەڕ (ڕەحیم پوور ئەرغەندە)و لە وتەکانیدا باس لە جێبەجێکردنی ئوسوولێکی نەگۆڕ دەکات. ئەویدی باسی لە چەمکی پرۆتستانتیزمی ئیسلامی دەکات و دەسەڵاتی ڕێکخراوە فەرمییەکان دەخاتە ژێر پرس و تا چەند هەنگاوی پەتی تاساندن و سێدارەدانیش دەڕوا و دەگەڕێتەوە. بۆ ساڵانێك دەبێ هەست بەم پەتە لە گەرووپدا بکات و هەمیشە ئەوانیدی لە بەندی تەك سلوولیدا دەمێننەوە و دییەکانیتریش یەك لە دوای یەك.. لەم نێوەندەدا، تاکەکانی جەماوەریش وەك چاودێرێکی خامۆش و بێدەنگ لەم کارەساتانە بەسەرسوڕمانەوە، گێژو وڕ، تێڕادەمێنن و لەو هەموو جیاوازییە و لەو هەموو.. تێناگەن. تەنانەت سکۆلاریزمی لانیکەم (حداقل)یش کە بە هەزار زەحمەت و ئارەزوو ئەیەوێ داوێنی دین لە حەوزەی سیاسەت و جڤات کۆبکاتەوە تا لە حەوزەی ژیانی تایبەتی و تاکی و فەرهەنگیدا بەشێوەیەکی ئاشتی ئامێز و کۆکبوون، ڕێگا بۆ عەقلانییەت و دیموکراسی هەموار بکات، بەڵام تۆمەتی گوتاری سازشی لێدەدرێ، پاش دەهەیەك لە خەبات و بزاڤ، گەروویان لە تینویەتیدا وشك دەبێ و زمانیان لە دەمیاندا هەڵناسووڕێ.

## أ-هەڵەتەبوون وچەواشەکارێتی زمان

بەڕاستی ئەم کێشە مەزنە، نەبوونی زمانی هاوبەش لە نێوان بزاڤە دژبەرەکاندا، چۆن و لە چ ڕەهەندێکەوە چارەسەر بکرێ؟ کێشەیەك کە چەمکەکان ئەوەندە هاوشێوەی یەکن کە بووەتە هۆی شوبهە و شیمانەی باسەکان.

لۆدویك ویتگنشتاین، بیرمەندی ئاڵمانی، لە سەرەتا و سەرەنجامی کارە (بۆچوون)ە فەلسەفییەکانی خۆیدا، لە مەڕ کایە زمانییەکان، دوو گریمانەی خستووەتەڕوو کە ڕەنگە ڕێنوێنیکەرێك بێ بۆ ئەم کێشە مەزنەی سەردەمە کە ڕووناکبیری (بە تایبەت دینی) تێدا دەسبەسەربووە. ئەو لە بەرهەمەکەیدا (ڕێساڵە،..) دەسپێشخەری گریمانەی وێنەیی واتایە (مانا). لە ڕوانگەی "وێتگنشتاین"ەوە، بۆ ئەوەی زمان دۆخی "واقیع"یەت نمایش بکات (بینوێنێ) و ڕستەکان نوێنەری پێشهاتە واقعییەکان بن، دەبێ شتێك نێوان ڕستە و دۆخی واقیعدا هاوبەش بێ. هەر ئەم نێوەنجە هاوبەشە (نادیار، نەناسراو، لە واقیعدا "ئەهرۆم"ی مێتافیزیك) ئەو پڕ توانست دەکات کە پێکهاتەی واقیعیەت (ساخت واقعیت) ببێتە دیاریکەری پێکهاتەی زمان. لە ڕوانگەی ئەوەوە، پێناچێ ڕستەکان واتایەکیان هەبێ، مەگەر ئەوەی زمان وەکوو ئاوێنە، بە چەشنێك لە چەشنەکان وێنەی واقعییەت نیشان بدات. ئێمە بە دیتنی ئەم ڕستەگەلە دەتوانین پێکهاتەی واقعییەت پێناسە بکەین.

لەسەردەمی حکوومەتی پەهلەویدا، هەر کات ڕووناکبیران بۆ دیموکراسی و ئازادی و هەروەهایش دادگەری (عەدالەت) بانگەشەیان دەکرد، ڕستەکانیان لە نێوان بانگەشە فەرمییەکانی دەزگاکەدا، بزر و نادیار دەمایەوە، چونکە لە بانگەشەی ئازادی ژنان و سەقامگیر کردنی یاسا و پەرلەمان و پێکهێنانی پارت و.. لە ڕووناکبیران، پێشدەکەوتن یان جەماوەر کە واژەی دادگەرییان دەبیست، ئەم چەمکەیان لە بانگەشەی شۆڕشی سپی (انقلاب سفید) شاهەنشاهی 1341 بەرجەستە تر وزەقتر دەدیت، هەروەها کە شا بە دابەشکردنی

زەویە خاوەنداریێتییەکان (تقسیم اراضي مالکان) لە نێوان چەوساوەکان و رەعییەتەکان، بە رواڵەت لەو بەستێنەدا هەنگاوی نابوو.

هەر لە ماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەدا، درووشمگەل و رستەگەلی تەژی لە مەعنەوییەت، ئاکار و یەکسانی، بووەتە نوێنەری نواندنی سەرچەشنێکی فەرمی (الطوی رسمی). ئێستا رووناکبیرانی دینی بیانەوێ هەر بەو رستەگەل و چەمکگەلەوە بۆ وێنە، عیرفان، دادگەری، ئازادی یان پرۆتستانتیزمی ئیسلامی، بێنە ڤەشاندن بۆ بانگەشەی دۆزەکانیان، ئەوا بیسەرانیش مافی خۆیانە کە چاوەڕێی هەمان هەڵێنجراوەی 20 ساڵەی رابردوو لە گوتەکانیاندا بکەن و وڕبن لەوەی کە هۆی ئەم جیاوازییە چییە و لە کوێوەیە.

بەڵام ویتگنشتاین هەر لەم زمانە واقیع گۆییەدا نەمایەوە، بۆ ئەوەی ئەم زمانە تەنیا دڵخۆشکەر بوو بۆ لۆژیکی پۆزیتیویستەکان. ئەو ئەیەوێ، چەمکگەلی دین، ئاکار (ئەخلاق) و جوانکارییش کە سەر بە قەڵەمڕەوی کارە نەوتراو و شازەکانن، بخاتەسەر بەستێنی فەلسەفەی خۆیەوە.

لەم رووەوە لە بەرهەمەکەیدا بەناوی "توێژکارییەکانی فەلسەفە، تحقیقات فلسفی" لەسەر هێنانە گۆڕی تەسەوری کاربردی یان ئەمرازێتی مانا (واتا) باسیکردووە. لە روانینی ئەوەوە بۆ ئەوەی کە بیرۆکەیێکی دروستمان لە زمان هەبێ، شایانە کە چاوێك بخەین بۆ کارکردی زمان لە ژیانی راستەکیماندا و بزانین کە مرۆڤ لەگەڵ زماندا چۆن هەڵسووکەوت دەکات لەو حاڵەتەدا، دەبینین کە پێکهاتەی زمانە، چییەتی هزر کردنەوەمان لەمەڕ جیهانی واقیعیدا دیاری دەکات.

لەم دەرکەوتەدا، زمانی واقیعگۆیی تەنیا چەشنێکە لە چەشنەکانی تری زمان، تەنیا شێوەیەکە لە شێوەکانی "کایە زمانییەکان، *Language game*" لەم روانگەوە جۆراوجۆری فرەچەشنی لە کاربردی زماندا دەبینرێ، "راوەدووی واتا نەبن، راوەدووی کاربردبن"(1)

ئەم دۆخە زاڵە بەسەر زمانی رووناکبیری بە تایبەت رووناکبیری دینی و زمانی نەریتخوازی ئێمەدا. هەندێ لە واتاگەل و چەمکگەل، کاربردێکی نامۆ و سەرسوڕهێنەریان بەخۆوە گرتووە کە لەلایەن هەر تیپ و بزاڤێکەوە دێنە بەکار بردن، تارمایەك لە نادیاری و چەواشەکاری لە زەینی جەماوەردا درووست دەبێ.

ماناگەل و چەمکگەل و واژەگەل لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، دەستەویەخەی چەشنێك لە "کایە زمانییەکان" بووەتەوە کە بووەتە هۆی سەرەڕۆیی کەش و هەوای نادیاری و قورسایی داکشان و بێئاکامی زمان، دەستەواژەی دادگەری، ئازادی، عیرفان، دین، دیموکراسی، رووناکبیری و.. ئاوەها چارەنووسێکیان هەیە. دادگەری (عەدالەت) لە روانگەی رۆحانییەکانی پاوەنخواز و مەزهەبییە نوێکارەکان و هەروەها مەزهەبییە مۆدێرنەکان، جیاوازیگەلێکی بەرچاو و حاشا هەڵنەگری هەیە، لە حاڵەتێکدا لە هەر سەردەمێکدا، لە لایەن ئەم بزاڤگەلەوە لە سووچەنیگای خۆیانەوە جەختی لەسەر دەکەن و بەڵگە دەهێننەوە و هەر ئەم رووکردە دەبێتە هۆی چەواشەگەری و وڕبوونی خوێنەران و بیسەران و ئاڵۆزکردنی فەزای کۆمەڵگە.

بۆ پاوەنخوازەکان دەبێ ئازادی لە چوارچێوەی حکوومەتی خوداوەندیدا پلانبەندی و پراکتیزە بکرێ. دەستەیەکی کە ئازادییان بۆ بەرزبوونەوەی رێژەی ئابووری دەوێ. بزاڤگەلی تر هەن، پێویستی دەزانن کە ئازادی لە خزمەتی پێگەیشتنی کەرامەتی مرۆڤیدا بێ، هەن کە ساتێکیش کە عەدالەتیان لە

ئازادی پێ بەرزترە و ئەم چەمکە داوێك دائەنێن لە خزمەت سەرمایەداریدا. لە روانگەی نەریتخوازەکان، دین بریتییە لە هەندێ دەستوور و ئەرزشگەلی جێگر و نەگۆڕ. بەڵام مەزهەبییە مۆدێرنەکان، دین دەخەنە پەراوێزی ژیانی تاکییەوە، تا بە کردنەوەی ئەم کەوانە مەزنە ئەخلاقییە، وەك پێداویستی لە زەمینەی سیاسەت و جڤێنگەدا، ببێتە هۆی سەرهەڵدانی چەمکی دیموکراسی.

مەزهەبییە نۆژەنەکان بۆ سەربەستی و دەربازبوونی گلێرگە، بانگەشە بۆ پرۆتستانتیزمی ئیسلامی و روونـاکبیری دەکەن تا ببێ بە پێگەیەك بۆ دەربازبوونی جڤێنگە و مرۆڤەکان. روونـاکبیری بۆ دەستەیەك هەڵسووکەوتێکی فەلسەفییە و بۆ تاقمێکیش جێگە و پێگەی نییە. گرووپێك لە بزاڤی تاکی و کاریزمایی بیر دەکەنەوە و تاك چاوەڕێی گۆڕانکارییە جڤاکییەکانە کە نوخبەکان بەستێنەسازی بۆ بکەن، لە دەرکەوتێکیتردا، پێداویستی بەرپرسێتی و دەرەوەستی (تعهد) روونـاکبیری، وایکردووە کە هەندێکیش چاو ببڕنە خەباتێکی پیشەیی و زانیاریانە و مەزن بۆ ئەم دۆزە. بەڵام لە راستیدا ئاوەها جیاوازیگەلێك بۆ بیسەران چ واتایەکی هەیە؟ پێدەچێ لە نێو جەغزی تارادەیەك گووشراوی رۆشنبیری ئێراندا، ئۆگرانێکی بەرچاو لە نێوەندی کایەیەکی مەزنی زبانیدا، گێژ و سەرسوڕماو، خەریکی دیتنی ئەم کایانە و هێشتا روونـاکبیران، نەیانتوانیوە ئۆگرەکانیان، بەتایبەت توێژی بەربڵاوی لاوان لەگەڵ دیاردەی جیاوازی فەرهەنگی خۆیان و فەرهەنگی فەرمی و نەریتی ئاشنا بکەن. کەوابوو گوتارەکانیان لە نێوان هەیاهووی فەرهەنگی هەوسارپچڕاوی ئێستادا، نەبیسراو و بێئاکام دەمێنێتەوە. هەمووی ئەمانە لە حاڵێکدایە کە روونـاکبیر دەبێ بەجەخت کردن لەسەر مێژوو، کەلتوور و زمانی جەماوەر، دەتوانێ لەمەڕ ئەرکی خۆی لە کۆمەڵگەدا، باس بکات و ئەڵبەتەش کارێکی دژوار و هەستیارە کە لەم سێ تەوەرەی "مێژوو و کولتوور و بە تایبەت زمان"دا بتوانێ ئەرکی خۆی بەڕێوە ببات.

## ب-( نامۆیی ): نائاشنایێتی روونـاکبیر لەگەڵ بیسەر ( موخاتەب )دا :

نائاشنایێتی (نامۆیی) لەگەڵ موخاتەبدا کێشەیەکی مەزنە کە بە تێکڕا لە دەستووری کار و تەوەری چالاکی روونـاکبیرانی ئێراندا، رەچاوناکرێ. بەر لەوەی روونـاکبیرێ شتێك بڵێت یان شتێك بنووسێ، دەبێ لە موخاتەبی خۆی و زمانەکەی ئاشنایێتی هەبێ تا بە گەڵاڵە کردنی کێشەکان و بابەتەکان بە گرێکوێرەکان و خاڵە قەیرانیاوییەکانی گلێرگە وەڵام بداتەوە. ئەگەر ئاوەها رووکردێك نەبێ، کاری روونـاکبیر، گورزێکی جیدی و زیپکی لێدەوەشێنرێ ئاکامیشی کزکردن و پاشەکشێ لە فەزای زەینی خۆیدایە، سەرەنجام داری باسەکان و شرۆڤەکان و هەمیش نووسراوەکانی لە کۆمەڵگەدا، سەمەرناگرێ یان لانیکەم رێژەی ئەو ئاکام و بەهرەیەی کە رەچاو دەکرا، نایەتەدی.

کێشەیەکی تر بۆ روونـاکبیر لەم بەستێنەدا، کە بووەتە هۆی سەختی و دژواری کارەکەی ئەویش نەناسینی بەرەی جەوان و پڕوزە و بزاوتوویە کە بە کۆ لەگەڵ ئەندێشەی رابردوو و ئەوەی چاخی کۆنی پێدەوترێ، جیابوەتەوە. ئەم بەرە بەو پتانسیەل و تایبەتمەندییە سەرسوڕهێنەرە جۆراوجۆرە جیاوازەبووەی خۆی، زۆر سەربەستخوازە و

هەمیش بێ متمانە و رووهەڵکەر لە پێشینیان. ئەگەر رووناکبیرە هەروەها جیایی و قووڵایی ئەم خەنەقەکانە پتر بکات و لە بیری توند و تۆڵ کردنی هاوبیر و هەڤاڵێتی و ئاشنایێتی لەگەڵ ئەم بەرەدا نەبێ و ئەو بەرە گورێزکارەی کە رۆحی بەستراوە بە پەیکەری سەتەلایتەکان و تۆڕەکانی جیهانی راگەیاندنەوە، لەگەڵ واقعییەتەکان و پێداویستییەکانی پێشکەوتنی ناوچەیی و باقی مەلزووماتی تر ئاشنانەکات، لە ئایندەیەکی چەندان دووردا، کێشەکانی کۆمەڵگەی ئێران پتر و پترتر دەبێ.

"د. شریعەتی و جەلالی ئالی ئەحمەد" لە مەشهەددا هاوسەفەر دەبن، لە (صحن)دا لەگەڵ دی پیاسە دەکەن، لە حاڵێکدا کە جەلال پاڵتاوێك بەسەر شانییەوە دەبێ. زیارەتکەرێکی لادێیی دەپرسێ: باوکە (پاڵتاوەکەت) فرۆشییە؟ جەلال لە وەڵامدا دەڵێ نە مامە گیان! نە مامە گیان! ئالی ئەحمەد خۆشحاڵ دەبێ و دەڵێ بە شەریعەتی:ئەمە بۆ من سەرکەوتنێکی مەزنە، ئەم لادێییە هەڵەی کرد منی لەگەڵ تیپی خۆیدا بە کۆك زانی. ئەمە سەرکەوتنێکی مەزنە کە لانیکەم ئەوەندە بە تیپی ئەوان نزیك بوومەتەوە، کە بە نیگای هەوەڵ، من لە خۆیان بزانن. بەلاّم شەریعەتی پێی دەڵێ، ئەرێ، بەلاّم لە وەلاّمەکەتدا کە گوتت: نە مامە گیان! بۆی دەرکەوت کە هەڵەی کردووە.مەترسی نامۆیی رووناکبیر لەگەڵ بیسەران و ئاخێوەران (موخاتەبان) و زمانەکەیاندا، بەم هەموو رێژە فراوانییەی حەشامەتی لاوان، بەراستی بۆ رووناکبیر کێشەیەکی جیدییە کە بۆ گەیاندنی پایەمەکەی، دەبێ بەسەریدا سەرکەوێ.

پێدەچێ کە ئەم کێشە ئەوەندە جیدی بووبێ کە تەنیا باڵی نەریتخواز نییە کە لەگەڵ ئەم دیاردەدا چنگاوەشە، بەلاّم لاوەکان لەم دونگەوە دەستیان پێکرد و هەموو بەستێنەی رووناکبیرانی ئیتنیکی و تەنانەت کۆی گشتی رووناکبیرانی گرتەوە.

هەنووکە، رووناکبیران لەلایەکەوە هەن و ئەو هەموو حەشامەتە لاوە کە زۆریش پڕ کێشەن و سەربەستخواز، لەلایەکی ترەوە کە پێویستە بە ناسین و لۆژیکی دروستەوە لەگەڵیاندا دیالۆگ و هەڵسوکەوت بکرێ. هێنانە گۆڕی سپەرێك لە هزر، ئەندێشە و ئەفراندنکاری، وزەیەکی بەرز و ورەیەکی زیپك و جیدی رووناکبیرانی ئەوێ بەلاّم هێشتا لە هەمبەر ئەم ئاستەدا، یانێ (موخاتەب) ناسیندا، ئەم توێژە دڕدونگ و بێ تەوەجن.

### ج-بێ توانستی لە ( موخاتەب ) دۆزیدا :

رووناکبیرێك کە دەست دەدا بە کاری نویساری و هونەری و گوتەبێژی یان کاری چاپەمەنی و.. ئەگەر بە گوڕەوە چالاکی نەنوێنێ بۆ دۆزینەوەی و ناسینی بیسەران (موخاتەبان) و هەروەهایش دەرککردن بە کاردانەوەی کارەکەی خۆی لەسەر ئەم توێژەدا، ئەوا کاربەخشی و بەستێنەی کارەکەی بێئاکام دەمێنێ و سەرەنجامێکی دەقیق بۆ ئەم کارە ناچەسپێ. ئا لەم بەستێنەدا، (موخاتەب) گەلێکی کۆنکرێت و دیاریکراو بۆ وەرگرتنی پەیامەکەی نایەنە هەبوون و پەیامەکەی تەماوی و نادیار دەمێنێ. ئەم دیاردە لە کۆمەڵگەی ئێراندا کێشەیەکی گچك نییە،بۆ ئەوەی کە هێشتا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، رووناکبیر نەیتوانیوە فەرهەنگێکی ئەکتیڤ و بزاوتوو لە هەمبەر فەرهەنگی نەریتیدا، بئافرێنێ. بەلاّم بۆ هەموو ساتەکانی تەمەن و بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیان، فەرهەنگی نەریتخواز و سەلەفی بۆ هۆگرانی خۆی بەرنامە و پلانی هەبوە. رووناکبیران هێشتاکوو

نەیانتوانیوە، ئەتموٚسفێری فەرهەنگی بەربلاٚو بوٚخوێنەرانیان فەراهەم بکەن، کەوابوو پاژێك لەم توێژە لە نێو نەریت و موٚدێرنیتەدا، دەمگوٚ لە گوتاری رووناکبیری دەبێژن، بەلاٚم عەمەلیان و داکوٚکییان، لەسەر فەرهەنگی سەلەفی و فەرمیدایە[2].

ئەم کێشە مەزنە و هەمیش جیدی و توٚکمە، کە لە سەرە رێگای رووناکبیریدایە و دەستەویەخەی لەمپەرگەلێکی ئێجگار زوٚریشە، کێشەی بوٚشایی و هەر روٚڵی رووناکبیر و گوێگر (موخاتەب) و هەمیش دوٚزینەوەی موخاتەب و زمانەکەی.

.."ژێرژ باتای" لە دەربڕینێکدا دەڵێ: زوان یەکەی ئیقباڵی ئێمە لە جیهاندایە[3]. لە واقیعدا یەکەی ئەمرازێکە بوٚ ئەوەی نەدوٚزراوەکان بدوٚزرێنەوە. هەر ئەم زمانەی کە لە جڤێنگەی ئێرانی سەردەمدا، خوٚی بوەتە، مەکوٚی مشت ومڕ و ململانێ و باس و دیالوٚگ لەسەر تیشکوٚی چەمکگەل و واتا گەلە جوٚراوجوٚرەکان، کە هەندێکیان ئاماژەیان پێدرا.

کاڵ بوونی باسگەلی پێوەندیدار بە زمانەوە ( لە زانکوٚکان و باقی کوٚڕە زانستییەکان)دا هەمیشە نەگەیشتن بە پرەنسیپە ورد و درشتەکانی تیوٚرێك لە مەڕ زوانەوانیدا، بووەتە هوٚی ئەوە کە لەم بەستێنەدا، کەم و کووڕی گەلێکی زەق و بەرچاو ببینرێت کە دەشێ لە ئاستی خوٚیاندا باسیان لەسەر بکرێ. باسگەلی پێوەندیدار بە زمانەوە، بابەتێکی گشتییە تا دەکرێ دەبێ بەشێوەیەکی دەقیق، بیانکێشینە نێو ئاپوورەی رووناکبیرییەوە. ئەڵبەت ئەگەر ئەم کارە هەرچی دەقیقتر و زانیاریانەتر ئەنجام بدرێت، ئاکامی چاکتر و باشتری دەبێت، بەلاٚم تا ئەو کاتە، دەکرێ بەشێوەی جیدی و دژبەرانە باسی لەسەر بکرێ.

زوانەوانان لە روٚژئاوادا لە سەدەی نوٚزدەهەمدا مشتومڕێکی شیاویان دەست پێکرد و لەم رەوتەدا، توانیان ئاکامگەلێکی پرشنگدار لە زەمینەی زوانەوانی، بنەماشکێنی و هێرموٚنوٚتیك یان بە قەولی ریکوٚر: توانستی ئەفراندنێتی لە زماندا، توٚمار بکەن. ئەم دەسکەوتانە بوٚ رووناکبیری ئێران دەتوانێ، یاریدەدەر و پشتوانەیەك بێ بوٚ پێناسەی کەم و کورتییەکان لە قوٚناغی سەرەتادا، پاشانیش سەروساماندانیان. ئەڵبەتە بە مەرجێك کە لەم بەستێنەدا، وەك باقی بەستێنەکانیتر رێژەی کوٚپیکردن و لاساییکردنەوە و تەوەزلی تئوٚرێکی دابەزێنرێت و رادەی داهێنان و ئەفڕاندنی دەروونی و بوومی (خوٚیی) بەرز بکرێتەوە. بە تایبەت ئاوەها چالاکییەك، دەبێ کاتی و دەرحەقوەخت نەبێ کە بە قەولی موٚراد فەرهادپوور، لە دەسپێکدا، بە چڕی لە بابەتە بە گوٚڕە فەلسەفیەکان لە بارەی چەمکگەلی هێرموٚنوٚتیك، راڤە و تەجروبەی نەبەوی و.. باس بکرێ، بەلاٚم لە ئەنجامدا کێشەکە بە بەخشنامەیەکی ساکار کوٚتایی پێ بدرێ[4].

کەوابوو دەکرێ بەشێوەی زانستی و لوٚژیکی لە وتەزای زمان ئاوڕ بدرێتەوە و بە ڕەچاوکردن و تەماسگرتن لەگەڵ تەئویلی روٚژهەلاٚتیدا، گرێکوێرە نادیار و تەماوییەکان زوانی سەردەم بکرێنەوە و رەهەندەکانی بەرینتر و بەربلاٚوتر بکرێن.

## بنەماخوازی و بنەما شکێنی:

لە روانگەی فێردینان دوسوسورەوە (1913-1857) زوان: سیستەمێکە لە نیشانەکان (*Semiology*) کە ئایدیاکان دەردەبڕێ هەر لەم ئاستەوە لەگەڵ سیستەمی نویسارێدا، ئەلف و بێی نابیسەران، دابگەلی هێمائامێز، رێساگەلی رەفتاری ئەدەب ئامێز، رەمزە نیزامییەکان و.. دێتە

بەراوردکاری. بەلاّم زوان، گرنگترینی ئەم سیستەمگەلە[5]. بەچاوکردن لە پێناسەکەی سوسور، لەوەی کە زوان سیستەمێکی نیشانەییە، لەم نموونەدا، "درەختێك دەردەکەویّ" واژەی درەخت، دال (دەنگ ئاماژە)یە و وێنای زەینی لە خودی درەختیشدا، مەدلوول (واتا ئاماژە)یە. نیشانەی زوانی دەبێتە پێوەندی زەینی نێوان دال (دەنگ ئاماژە) و مەدلوول (واتا ئاماژە)و پێوەندی نێوان دال و مەدلوولیش رێکەوتنە.

هەروەها سوسور ئاماژە دەکاتە جیاوازی نێوان زوان و گوتار کە لە زوانەوانیدا بەهایەکی زۆری هەیە. لە روانگەی ئەوەوە، زوان خاوەنی سیستەم، رێساگەل و نیشانەگەلێکە و گوتاریش لە کابردێکی کۆنکرێت بەهرەمەندە. هەر ئەم سیستەمە یان رێساگەلە رێزمانییە، پاشان لە لایەن زوانەوانی رووسیەوە، نیکلای ترۆبێتسکی بە بنەما (پێکهاتە) ناودێر کرا[6].

سوسور بە گەلاّلە کردنی پێوەندییەکانی نێوان هاونشینی و جێنشینی، بیّ بایەخی پۆلێنبەندییە سەلەفییەکەی زوانەوانی کە بریتی بوون لە سینتاکس (نەحو)، دەنگ ناسی و واژەناسی، خستەڕوو[7].

زوان کە روونکەرەوەی پێگەی نیشانەیە لە سیستەمێکی مانایی تایبەتدا و بنەمای رستەیش، ئەگەری جێنشین بوونی توخمە زمانییەکانی دی فەراهەم دەکات[8]. ژاك دریدا (1930) بیرمەندی سەردەمی فەرەنسایی بە خستنەڕووی فەلسەفەی بنەماشکێنی (*Deconstractive*)، کۆتایی هێنا بە مێتافیزیکی حوزوور یان (ئەنانیەت). ئەو لەگەلّ هەر چەشنە پێناسە کاریەك دژبەری دەنواند و لەهەمبەر پێش فەرز تەوەری یان بنەماخوازیشدا دوورە پارێز بوو[9].

دەسپێکی بنەماشکێنی (بنیان فکنی) دریدا لە فەلسەفە (بیردۆزی)یەوە بوو بەلاّم لە بەستێنەی زوان شناسی و مەردم شناسی (ئەنترۆپۆلۆژی)شدا جێی خۆی کردەوە. ئەو هەر چەشنە پایەداری و خۆڕاگری مانای نێوان دال (دەنگ ئاماژە) و مەدلوول (واتا ئاماژە)ی سوسوری خستە ژێر سەنتەی شیمانە و گومانەوە، بەستێنەی پێوەندییەکانی نێوان دال و مەدلوولی بەربلاّوتر کرد. ئەو پێی وابوو کە لەم پانتاییەدا، تۆڕێکی بەربلاّو لە واتاکان هەبوونیان هەیە.

لە روانگەی سوور نیشانە پێکهاتەیەکی هێمائاسای (ئامێز)ە، بەلاّم بە باوەڕی دریدا، علامت (هێما) مانای شتێك نییە کە هێشتا پەیا نەبوونی بیّ، بەلّکوو بە مانای شتێکە کە هەرگیز پەیا نابیّ. دریدا لە ئێمەی دەویّ کە هەرچی تا ئێستا ئامادە و ئاشکرا زانیومانە، بە جیاوازییەوە بیناسین. لە خوێندنەوەدا، بنەمای دەقەکە زانایانە بشکێنین و بیشزانین کە ئیعتباری واتایی دەق وجوودی نییە. ئەوەی کە لە دەسپێکدا بەرچاو دەهات، تێپەڕینێکە و ئاکامی کارەکەی ئێمەیش، هەمان ناسینی جیاوازییەکان (تمایزها)ە[10].

لەچاو دریدا، ئەم هەلّوێستە کە گوایێ ئەو دیوی هەر نیشانەیەك، واتایەك هەیە، "مێتافیزیکی حوزوور"ی پێدەگوتریّ، یانی ئەم تەوەهومە کە هەر دەقێکی نویساری، وەك سیستەمێك لە نیشاکانن، کە دەبیّ مانایان هەبیّ یان دەربڕێنەری ئەون[11] لە بۆچوونی ئەودا، زوان پێوەرێکی داوێن پاك و بیّ لایەن نییە.

زوان، مێتافیزیکی رۆژاوایە، جیاوازیەك کە سوسور نێوان دال و مەدلوول پێی قایل بووە، هەمان جیاوازی کلاسیکی فەلسەفە نێوان شتی هەستپێکراو و شتی هزریدایە[12] لە حالّێکدا دریدا

دەستنیشانی کرد کە لەهەر دەقێکدا، دووانەیەك هەیە و هەمیشە دوو دەق لە دەقێکدا پێکەوەن[13].

نیچە جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە رەگەز واژەیی *Interpretain* دەسپێکێکە بۆ رۆچوون بەمانا (یان پەیوەستێك بە ماناوە) نەگەیشتن بە مانا[14]. بەلاّم دریدا وا لە دووی کەشفی میتۆدێك بۆ خوێندنەوە تا جیاوازی ماناکە دەربخات و ئەوەیش بنەما شکێنییە – بنبان فکنی–[15].

## هێرمنۆتیك و راڤەی رۆژهەلاّتی (تاویل شرقی)

وشەی هێرمینا لە ناوی "هێرمس"ەوە وەرگیراوەو "هێرمس"یش پەیام هێنەری خواکان بووە، پێوەندییەك نێوان نەمردوان و مردوان کە جار هەبووە هەوالّگەلی خۆشی پێبووە جاریش ناخەز.. هێرمس خودای یۆنی کە ئەفرێنەری (خولّقێنەر) زوان و گوتار بووە،هەم راڤەکار و هەمیش پەیامهێنەر.. لەگەلّ نووسراوەکانی "ئاگۆستین"ی قەدیسدا، هێرمنۆتیك وەك زانستی راڤەکاری گەلاّلە بوو[16].

لە هێرمنۆتیکدا دوو پەیلوا (بۆچوون)مان هەیە. بۆچوونی بزاڤی (هەوەلّ)، باوەڕی بە کەشفی دۆزی دانەر و فەهمی دەقەکە هەیە کە لە سەدەی نۆزدە لە ئەورووپا لە حەوزەی دینی (مەسیحیخوازی)دا لە لایەن شلایرماخێرەوە هاتنە نێو ئەدەبیات و بەستێنەی میتۆدناسی زانستەکانەوە، دیلتایش بە شێوەیەکی بەربلاّو خستیە نێو زانستی ئینسانی (علوم انسانی)یەوە. ئەم بزاڤە وەك بابەتی هێرمنۆتیکی نەریتی و کۆندا پروڤە کرا.

بزاڤی دووەم، باوەڕی بە ئەگەری کەشفی دۆزی دانەر و تێگەیشتنی (فەهم)ی دەقەکە نییە.هایدگەر و گادامێر و پۆل ریکۆر لە راستیدا باوەڕیان بە مانای ئاکامی (سەرەنجامی) و رەسەن هەیە. ئەم هێرمنۆتیکەنۆژەنە،وەك نیشانە ناسی و بنەماخوازی، لە بەستێنەی توێژکاری دەقە ئەدەبییەکاندا تێپەڕی کرد و هەموو پاژەکانی زانستییە ئینسانییەکانی گرتەوە و بەهێرمنۆتیکی مۆدێرن یان نۆژەن بانگەوازی دەرکرد[17].

هێرمنۆتیکی نۆژەن، دیدێکی چاودێر ئاسای بە مل دەقەکە و دیاردەکەدا هەیە، و لەسەر شرۆڤەی کەشفی رازە نهێنییە نەوتراوەکان جەخت دەکات. بە پێچەوانەی هێرمنۆتیکی نەریتی کە پێیوابوو کە فەهمی بالاّ و فەهمی کۆتایی دۆزی دانەر و دیاردەکە بەرانبەرن، هێرمنۆتیکی مۆدێرن هیوای بە کەشفی دۆزی دانەر نییە و بەلاّم رێز بۆ دەق و کاردانەوەی لەسەر خوێنەر هەیە. هەر ئەم هەلّوێستە بووەتە هۆی ئەوە کە بزاڤگەلێك جیاواز بەدی بێن و لە پێکهاتەی هێرمنۆتیکی مۆدێرندا، پرەنسیپ گەلێکی دیاریکراو و پێشفەرز هەبوونیان نەبێ.

لەلایەکی ترەوە بەلاّم، رەتکردنەوەی هەر چەشنە مانا لە دەقدا، بە جیدی رەخنەی لێگیراوە. هابێرماس ئەم رەهەندیە لە هێرمنۆتیکدا (رەتی مانا) خستیە ژێر تیشکی رەخنەوە، چونکا بە رەتکردنەوەی مانا، بەهای راڤەیش لە نێو دەچێ و دەق توانستی لە دابینکردنی پێوەندی لەگەلّ خوێنەردا نابێ. بەهەر حالّ، پێوەندی مرۆڤ لەگەلّ راڤە و هێرمنۆتیك لەم وتەی "نیچە"دا دەردەکەوێ، لەوا کە دەلّێ: ئەگەری ئەوەی هەیە کە بلّێین تەنیا حەقیقەتەکان هەبوونیان هەیە، بەلاّم من دەلّێم، نە حەقیقەتەکان دروست هەمانن کە هەبوونیان نیە. تەنیا راڤەکان هەن، ئێمە ناتوانین تەسەوری حەقیقەتێك بکەین. رەنگە ئەم خوازەیشە خۆی گێلکاریەك (گەمژەیی) بێ. دەلّێت، کەوابوو هەموو شتێك زەینییە. ئەم (ئاکام)ەیش چەشنێك راڤەیە

(تاویـل)ە.. جیـا لـە راڤـە، مانایـەك هـەبوونی نیـە. ماناکان رادەبڕن[18].

هێرمنۆتیك لەلایەن رۆژاواییەکانەوە بە (تاویل و تفسیر) و لـە لایـەن موسـوڵمانەکانەوە بـە (تاویـل) ناسـراوە. (تاویـل) بـە مانـای رەسـەنجۆیی، لەلایـەن موســـوڵمانەکان و لـــە نێـــو رەگـــەز و بزاڤـــە جۆراوجۆرەکانـدا ئـەرزش و بایـەخێکی ئـەوتۆی بووە. لە قورئانیشدا بە (تاویل) ئاماژە کراوە[19]. لە ئایـــەتی حەوتـــەم ســـوورەی ئـــالی عـــومران وەك رەوشـتێکی کـاربردی چـاوی لێکـراوە. زانایـان و بزاڤگەلی جۆراوجۆری عیرفان لە راڤەی قورئاندا، لە رەوشـــی (تاویـــل) کـــەڵکیان وەرگرتـــووە. لـــەم بەسـتێنەدا، کتێوگـەلێکی راڤـەکاری وەك: (کشـف المحجوبی هجویری و مرصـاد العبـادی نجـم الـدین رازی) نووسراونەتەوە.

دابـی (تاویـل) لـە نێـو بزاڤـی (اخـوان الصـفا) و پـاژە جۆراوجۆرەکـانی شـیعەدا پێگەیـەکی روون و بەرچـاوی بـووە. ئەنـدازیار بازرگـان، دوکتـۆر (یـدالله سحابی و ایت الله تالەقانی) لە ئیسلام ناسیدا، لـەم رەوشـە راڤەکارییـە کـەڵکیان وەرگرتـووە. بـیردۆز (اقبـال لاهـوری) بـاوەڕە زانسـتی و فەلسـەفییەکانی خـۆی بـەم رەوشـەوە گرێـداو (شـریعتی)یش لـە هـەر بـــەم پێـــوەرە لـــە چـــەمکگەلی حـــەج، شـــیرك، یەکتاپەرستی، چیرۆکی (خلقت)، حسێن (وارث ادم) و.. دوا. بـەڵام رووی راسـتی ئەمەیـە کـە رەوشـی (تاویـل) ئێمـەی رۆژهـەڵاتی ناگاتـە ئـەو رێژەیـە کـە هێرمنۆتیـــك لـــە رۆژاوادا تـــوانی بەســـتێنەی جۆراوجۆری زانستییە مرۆڤییەکان یـەکالا بکاتـەوە، توانســـتی ئـــەنجامی ئـــەم چەشـــنە روو کـــردە فەلسەفییەی نەبووە و لەگەڵ حەوزەگەلی جۆراوجۆر و جیـاوازی زوانـەوانی و بـوون ناسـی و هـەمیش هەسـتی ناسـانەدا.. پێوەنـدی بابـەتی نـەگرتووە. لە حاڵێکدا بەدژبەری جیدی نێوان زانستی (تاویل) و بەسـتێنەگەلی جۆراوجۆردا، دەتوانین سووچێك لـە نهێنییـەکانی زمـان روون بکەینـەوە کـە لـە خـوارەوە ئەم کارە دەکرێ.

## ئەفراندنێتی زوان

پـۆل ریکـۆر لـە کتـێبی "خـوازەی زینـدوو"دا لـە رادەی ئـەفرانکارێتی زمـان دواوە. لـە روانگـەی ئـەم بـیردۆزەوە، زوان وزەی پەرەپێـدانی توانسـتەکانی خـۆی هەیـە و دەتـوانێ نەغمـە نۆژەکـانی لـە خۆیـدا راگـــرێ و ئـــەم کاریشـــە لـــە رێـــی خـــوازە و ئەفرانـدنکارێتی و.. لـە زوانـدا دێتـە نوانـدن: "لـە خـوازەی زینـدوودا، مـن تێکۆشـام تـا دەربیخـەم کـە چلۆن زوان دەتـوانێ توانسـتە بزۆزەکـانی خـۆی تـا ئەو رادەیە پەرە پێبدات کە بتوانێ ئیتر بۆهەمیشـە نەغمە نۆژەنە دەروونییەکانی خۆی کەشف بکـات.. وزەی زینـدووی خوازەسـازی، ئەفرێنـەر و دووبـارە ئەفرێنەری مانایە[20].

ئەڵبەتـــە لـــە دیـــدی پـــۆل ریکـــۆردا، ئـــەم ئەفراندنکارێتیـەی واتـا لـە زمانـدا، بەرهـەمهێنانی تایبەتی مرۆڤییە: ئەفراندنکارێتی مانا لە زماندا، لە بەرهەمهێنان بەچەشنی تایبەتی مرۆڤانیدایـە: یـانی داهێنانی مەنهەجە نۆژەکانی دەربڕین و سەرچەشنە ئوبژەکتیو (دەرەکی) و هێما ئامێزەکان کە لە زواندا جێگیرن[21].

پـۆل ریکـۆر لـە مـەڕ ئوسـلووبە فەلسـەفییەکانی خۆی، ئاوا دواوە: "بەرنامەی فەلسەفی من ئەمەیە تا نیشانی بەم کە زوانی مرۆڤ، وێڕای هەبوونی رێـژەی بەرزی هێماگەلی ئوبژەکتیو و بەدەسەلات، ئەفرێنەر و داهێنەریشە. هەمیش دەمەوێ رادەی فرەچەشنی و فرە شـێوەیی زمـان روون بکەمـەوە[22]... زانیـاری لەسەر سازەکان و ئیمکاناتی خوازەیی و گێڕانەوەی

زمان یانی پەی بردن بەم خاڵە کە وزەی یەکدەست و لاوازی ئەم چەمکە سەرومڕ دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە کۆی فۆرمگەلی کارایی زوان سەرلەنوێ سەرحاڵ و پڕ نشات بکات"[23].

لە روانگەی ریکۆرەوە، بە کەڵك وەرگرتن لە سازەکانی زمان (هێرمنۆتیك، ئوستوورە، خوازە و گێرانەوە) دەتوانین مانا بونیادییەکان کەشف بکەین[24]. چونکا لە دیدی ئەوەوە کۆی زمانە مێتافۆڕییەکان (مەجازی) لە ناواخندا شیاوی فەهمن و هەمیش ئەفرێنەر[25].

گەلاڵە فەلسەفی – هێرمنۆتیکەکەی ئەو، ئایدیایەکە کە نیشان دەدات ئاکارێکی گوتاری هەیە و زوان تەنیا لۆژیك و نیشانە نیە، بەڵکو ئەرکێکی ئەخلاقیشی هەیە کە جەماوەر لە هەمبەر ئەو گوتەوە کە دەیڵێنەوە: بەرپرس و ئەرکدار دەکات[26].

پێدەچێ هەر کام لەو رەوشگەلەی کە لە سەریان باسکرا، دەتوانێ تا رادەیەك کێشەکانی زوانی رووناکبیری و کۆمەڵگەی ئێران کەم بکاتەوە یان کاردانەوەیان هەبێ، بەو مانا کە بنەماشکێنی یان (بنیان فکنی) واژەگەل و واتاکان، دەکرێ یاریدەدەری سڕینەوەی کێشەکان و نهێنییەکان و چەواشە کارییەکانی زوان بێ.

ئاوەها بنەماشکێنی گەلێك ئەگەر لەسەر بناغەیەکی تیۆریك و قەڵەو دابنرێ، لە گەیشتن بە بن بەست لە بەستێنە جۆراوجۆرەکاندا بەرگری دەکات و رێژەی کێشە زانستییەکان کە لە سەرە رێگەدان، دادەبەزێنێ. ئەڵبەتە دژواری و ئاستەنگی واقعییەتەکانی کۆمەڵگەی ئیتنیکی ئێمەیش بووەتە هۆیەکی بەرگریکەر بۆ باسە لۆژیکی و زەروورییەکان. چەمکگەلێك وەك دیمۆکراسی، ریفۆرمخوازی، شۆرش و دین و سیاسەت بە تەواوی چەواشەکەر و سەرسوڕهێنەرن. بەلام نیشانەی ئەکتیوی کاری رووناکبیری ئەوەتە کە لە جێی کزکردن لەهەمبەر گوشارەکانی ئەتمۆسفێری کۆمەڵگەدا، رێگا بۆ خۆی و دیتران ئاچۆخ بکات و فەزای ئاوەزگەرێتی و رۆشنگەری و رۆشنبیری پتر بکات و بۆ سەقامگیرکردنی هیواو گەیشتن بە فەرهەنگی قەڵەو و پڕ وزە و پشتبەستن بە باری هزری، فەرهەنگی و مەعنەوی، ساتێك ئارام و قەراری نەبێ و نەسرەوێ. چ بۆ رووناکبیرانی دینی خوشایەند بێ یان نەبێ، چ لائیکییەکان ئەم واقعییەتە قبووڵ بکەن یان نەیکەن، گلێرگەی ئێمە، گلێرگەیەکی فرەخوازی و چەند جەمسەریە کە هەموان دەبێ لەو روانگەوە دان بە مافەکانی دیتران لە هەموو بوارەکاندا بنێن و رێزی بگرن، بەلام لە روانگەی تیۆریکەوە، لەگەڵ ویدا مشتومڕ و ململانێ و.. بکەن. دەبێ ئێمە بۆ دەربازبوون لە گوشاری هەڵێنجراوو وەرگرتە، لە سڕینەوە و دەرکردن وفرێدانی دیتران بەرگری بکەین و بە هاریکاری یەکتر بۆ بەردەوامیماننەوە، هەنگاو بنێن.

## پەراوێز

1–برایان مگی، اشنایی بافلاسفه بزرگ غرب، انتشارات کویر

2–مجموعه اثار 20، ص 157.

3–شریعتی، سوسن، "سعی" در "صفا"ی سنت و "مروه"ی تجدد، سر مقاله روزنامه شرق

4–احمدی بابك، ساختار تأویل متن (ج2) شالوده شکنی در هرمنوتیك

5–فرهادپور، مراد، انتقاد از مانیفست جمهوری خواهی، روزنامه شرق 1382/3/11

6–احمدی، بابک، همان، ص 13.
7–همان، ص 16
8– همان، ص 19
9– همان، ص 20
10–اندیشه های فلسفی در پایان هزاره دوم، گفت و گو با محمد ضیمران مقاله ژاك دریدا، پایان متافیزیك حضور، ص 189
11–احمدی، بابك، ساختار تأویل متن 2 (شالوده شكنی و هرمنوتیك، ص 329
12– همان، ص 407
13– همان، ص 425
14– همان، ص 430
15– همان، ص 399
16 و 17– همان، ص 497–496
18–نیچه، خواست قدرت، قطعه 481
19–سوره یوسف، ایات 6، 21، 10
20–ریكور، پل، زندگی در دنیای متن، ترجمه بابك احمدی، نشر مركز 1382 ص 71
21– همان، ص 74
22 و 23– همان، ص 72
24– همان، ص 78
25– همان، ص 79
26– همان، ص 91

## سەرچاوە

گۆڤاری نامە، ژ 35، نیوەی ڕێبەندانی 1383، ل 67–70

# دەربارەی راستی و رۆمان و جامە پیرۆزەکەی مەسیح

ئیمبێرتو ئیکۆ

لە ئینگلیزییەوە: لاوك سەلاح

ئیمبرتۆ ئیکۆ حەز بە گێرانەوەی چیرۆك دەکات، ئەو لەو بڕوایەدایە کە پێویستی بۆ گێڕانەوەی چیرۆك بەشێکە لەو شتانەی کە دەمانکاتە مرۆڤ. "پێموایە هەموو کەس ئارەزوویەکی قووڵی هەیە بۆ گێڕانەوەی چیرۆك، هەمیشە خەڵك چیرۆك بۆ منداڵەکانیان دەگێڕنەوە. کە یەکەم رۆمانم بڵاوکردەوە، خەڵك پرسیاریان لێدەکردم، بۆ رۆمانت نووسی؟ وتم، "کە منداڵەکانم هێشتا منداڵ بوون دەمتوانی چیرۆکیان بۆ بگێڕمەوە، بەڵام کە گەورە بوون، نەمزانی بۆ کێ چیرۆك بگێڕمەوە، لەبەرئەوە بڕیارمدا رۆمان بنووسم. "ئێکۆ چیرۆکی جوان دەگێڕێتەوە. یەکەم رۆمانی "ناوی گوڵەکە"، هەر وەك رۆمانەکانی دیکەی، لەسەر ئاستی جیهان بەشێوەیەکی بەرفراوان فرۆشرا. ئەم رۆمانە بەشێوەیەك باس لە تاوانێك دەکات لە چەرخەکانی ناوەراستدا ڕوودەدات و سەرسامت دەکات و هەستدەکەیت کارەساتێکی گەورە لە رۆمانەکەدا پەنهانە. بێگومان نابێت رۆمانەکانی ئیکۆ تەنیا کورت بکەینەوە بۆ تانوپۆی رۆمانەکە، سەرباری ئەو خاڵە گرنگە، چەندین جوانکاری دیکەیان تێدایە.

ئیکۆ پرۆفیسۆری سیمیۆتیکە، زانستی هێما و ماناکانی، لە زانکۆی بۆلۆگنە، ئەو چیرۆکانەی دەیانووسێت دەچنە خانەی پێناسەکانی رۆمانی پۆستمۆدێرنەوە، لە بابەتێکدا لەم بارەیەوە نووسیوویەتی کە رۆمانی پۆستمۆدێرن بۆ ئەو کەسانەیە کە شارەزان لە بوارێکی تایبەتدا و حەز بە چیرۆکی داهێنەر دەکەن. لە یەکێك لەو رۆمانانەی کە نووسیوویەتی مانایەکی فەلسەفی قووڵ بەرجەستە دەکات. پاڵەوانە نوێکەی کە ناوی بۆدۆلینۆیە، ئیمپراتۆری رۆمان کردوویە کوڕی خۆی. ئەم پاڵەوانە توانای درۆکردنی لە رادەبەدەرە و هەروەها توانای فێربوونی زمانیش. کە خاچپەرستەکان دەچنە قوستەنتیینە، ئەم مێژوونووسێك قووتار دەکات و بریار دەدات کە بەسەرهاتی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. دواتر دەچێتە زانکۆ لە پاریس و دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ئافرەتێکەوە. ئیکۆ، هەمیشە، زانیاریە

ئەکادیمیەکانی تێکەڵ بە شێوازەکانی گێڕانەوە دەکات.

**دەتوانین لەو کتێبەوە ئەوە تێبگەین کە تۆ درۆزنێکی مەزنتری لە بۆدۆلینۆ؟**

ئیمبرتۆ ئیکۆ: (پێدەکەنێت). هەموو کتێبەکە سەبارەت بەو بیرۆکەیەیە کە ئایا بۆدۆلینۆ راست دەڵێت؟ نیکیتاس دڵنیا نییە لەوەی ئایا بۆدۆلینۆ چیرۆکێکی راست دەگێڕێتەوە. کتێبەکە دەربارەی بۆدۆلینۆیە کە خۆی چیرۆکێکی مەنگە. چیرۆکەکان لە داهێنانی ئەون و دواتر دەبنە راستی. ئەمە بۆ نووسەر کارێکی دڵخۆشکەرە کە باس لە شتێك بکەیت، بەر لە قسەکردن بوونیان نەبووە.

**چۆن رۆمانەکانت لەگەڵ کاری ئەکادیمی رێکدەخەیت؟**

ئیکۆ: من چێژ لە گێڕانەوە دەبینم. دەتوانیت بڵێیت ئەمە جۆرە هەلاّتنێکە لە کاری ئەکادیمی. من حەزی خۆم بە گێڕانەوە تێردەکەم. تەنانەت لە لێکۆڵینەوەکانیشمدا هەر هەمان کار دەکەم، لەبەرئەوەی ئەویشیان جۆرێکە لە چیرۆك، چیرۆکی لێکۆڵینەوە. من هەموو کتێبێکی فەلسەفی مەزن بە چیرۆکێکی پڕ لۆجیك لە قەڵەم دەدەم.

**چۆن سیمیۆتیك بۆ ئەو کەسانە باس دەکەیت کە نازانن چییە؟**

ئیکۆ: شەرحی ناکەم، داوایان لێدەکەم کە کۆرسی دوو یان سێ ساڵی لە زانکۆ بکەن. (پێدەکەنێت) بەلاّم من دەتوانم زۆر زۆر ساکارانە شەرحی بکەم. ئێمە گیانلەبەرین، بەڵێ، هەر بە وشە پەیوەندی نابەستین، بەڵکو چەندین هۆکاری دیکە بۆ پەیوەندیکردن هەن وەك: وێنا، ئاماژەکردن، جووڵەی دەموچاو. ژیانی ئادەمیزاد پڕ لە هێما و ئاماژەیە. هەر شتێك کە تۆ بەرهەمی دەهێنیت بۆ ئەوەی شتێك بڵێیت جۆرە هێمایەکە. سیمیۆتیك بەدوای ئەو چالاکیانەدا وێڵە بۆ دۆزینەوەی رەگوڕیشە هاوبەشەکانی مرۆڤ.

**لە "نیویۆرك رڤیوو" نووسرابوو کاتێك رۆمانی دوورگەی رۆژی پێشوو بلاّوبۆوە، ئەو کەسەی رانانەکەی بۆ رۆمانەکە کردبوو دەڵێت تەنیا شت کە لە رۆمانەکەدا ماوە جامە پیرۆزەکەی مەسیحە. ئەو جامەی بەر لەوەی بمرێت بەکاریهێناوە و دیارنەماوە هەروەها نهێنییەکانی تۆرین. ئایا تۆ بە ئەنقەست ویستووتە لە رۆمانی بۆدۆلینۆ ئەم شتانە راستبکەیتەوە؟**

ئیکۆ: (پێدەکەنێت). دەزانیت ئەو جامە پیرۆزە لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە. ئەو رەمزە. رەمزی شتێکە بۆی دەگەڕێین و نایدۆزینەوە. تەنانەت لە رۆمانی دوورگەی رۆژی پێشوو، ئەو جامە پیرۆزەی تیابوو، جامەکە، دوورگەکە خۆی بوو کە کەس نەیتوانی پێیبگات، ئافرەتەکە بوو کە وون بوو. جامی پیرۆز میتافۆری (مەجازی) ئارەزوویەکی بێکۆتاییە. لە بۆدۆلینۆدا ناچاربووم جامێکی راستەقینە دروستبکەم لەبەرئەوەی بۆدۆلینۆ لە هەمان ساتی یەکەم چیرۆك سەبارەت بە جامەکە نووسرا.

**ئایا هیچ ئاماژەیەك لەم رۆمانەدا هەیە سەبارەت بەو نهێنیانەی کە هەرگیز خوێنەر هەستیان پێناکات؟**

ئیکۆ: هەندێ لە نیگارکێشە مەزنەکانی رابردوو کە وێنەی دەموچاوی خەڵکانێکی زۆریان دەکرد هەندێ جار دەموچاوی برادەرەکانیان هەڵدەبژارد و

دەمانتوانی بیانناسینەوە و هەندێ جاری دیکەش وەك نهێنی دەمانەوە، بەڵام هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر بە نیگارەکان نەدەگۆڕا. ڕۆمانەکانی من دونیایەك نهێنی تیا پەنهانە و زۆربەیان هەر خۆم ئاشنام پێیان. (پێدەکەنێت).

کاتێك "نیکیتا" بۆی دەردەکەوێت کە بۆدۆلینۆ بەهرەی قسەکردنی چەندین زمانی هەیە، نیگەران دەبێت لەوەی کە ئەگەر کەسێك توانای قسەکردنی چەند زمانێکی هەبێت بێ هەست و ڕۆح دەبێت. تۆ ئەوە نیگەرانت ناکات کە ئەو کەسانەی ڕۆمانەکانت دەخوێننەوە بە ئیتالی نایخوێننەوە بەڵکو بەهۆی وەرگێڕانەوە دەیخوێننەوە؟

ئیکۆ: دەزانیت من خەریکی نووسینی کتێبێکم لەسەر وەرگێڕان، وا تەواوی دەکەم. لەم کتێبەدا باسم لە ئەزموونی خۆم کردووە لەگەڵ وەرگێڕەکانمدا. من دەڵێم دەتوانیت کار لەگەڵ وەرگێڕەکانتا بکەیت نەوەك ئەوانەی کە زمانەکانیان دەزانیت وەك ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیسپانی و کەمێك ئەلەمانی، بەڵکو تەنانەت ئەوانەی کە زمانەکانیشیان نازانیت، ئەمە ئەگەر وەرگێڕەکە خوێندەوار و لێهاتوو بێت، ئەگەر ڕۆحی زمانەکەی خۆی لە چنگدا بێت، دەتوانیت قسەی لەگەڵ بکەیت و پێکەوە گرفتەکان چارەسەر بکەن. لە ئێستادا، ناتوانم بڵێم ئەمە لەگەڵ هەموو وەرگێڕەکانمدا دەکەم یان هەیە —وەك وەرگێڕانی ڕۆمانەکانم بۆ زمانی عەرەبی و ئەسیتۆنیا. لە زۆربەی وەرگێڕانەکاندا کارم لەگەڵ وەرگێڕەکە کردووە هەر لەبەرئەوە هەست دەکەم وەرگێڕانیش کاری منە. ئایا لە من دەگەیت؟

بۆدۆلینۆ توانای قسەکردنی بە هەموو زمانێك هەیە. ئەمە تەنیا خەونی من نییە، بەڵکو خەونی مرۆڤایەتییە. ئەم، نموونەی هەمووومانە کە دەمانەوێت وەك ئەو پەیوەندی ببەستین. ئەگەر تەنیا یەك جۆر زمان لە دونیادا هەبووایە، ئەو هەموو چیرۆکانەمان لەبەردەستدا نەدەبوو. هەموو کەلتوورێك، شارستانیەتێك، زمانێك دەتوانێت چەندین جۆری جیاواز لە چیرۆك بەرهەم بهێنێت بۆ ئەوەی دونیا لە گۆشە نیگای جیاوازەوە ببینێت.

### سەرچاوە

ئەم چاوپێکەوتنە لەلایەن جێسیکا جێرنگیەن ئەنجامدراوە و لە سایتی www.bordersstores.com بلاّوکراوەتەوە.

# ڕەخشان

## خاتیرەی حیجازی

### لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

دیسانەوە ناڵەو گریانە. بەڵام ئەمجارەیان بەبێ تێهەڵدان. ئەمە سێیەمین کرێنشین بوو کە بۆ ئەپارتمانی ژمارە شەش دەهاتن و ئەمانیش هەر سەر ئێشەیان هەبوو. بە مێردەکەمم وت: ڕەزا نەکا مەسەلەی ئەمانیش بگاتە تەڵاق و تەڵاقکاری.

—جا مەهێڵە.

—وا دەڵێی مەهێڵە، دەڵێی بەدەست منە.

—بەڵێ، هەندێجار دەکرێ شت گەلێك بکرێت.

—وای، نا، وا مەڵێ. چونکە ئەو جارەی تر بوورامەوە.

—ئاخر ئەو جارەی تر. تۆ ئەوەندە بنەوەشی نەبووی.

ئەو ڕستەیەی دوایی ڕەزا تووشی ئازاری ویژدانیی کردبوو. بۆیە کاتێ هات لە ماڵی ئێمەوە تەلەفۆن بکات، پێشوازییەکی گەرمم لێکردو لە خزمەتیدا بووم تا دانیشتنەکەمان گەیشتە چایی و میوە و جگەرە و نیوەڕۆژە و قاوەو فاڵ و.. هتد جا تا گەیشتە عەسر، من تێکڕای تایبەتمەندییەکانی ژیانی ئەوم دەزانی. کە لە پلیکانەکانیش دەچووە خوارەوە سوکەڵە و خێرا دەڕۆشت و چاوەکانی بریسکەیەکیان تیابوو. بەڵام من کە دەرگاکەم داخست وەکو قەدی درەختێك قورس ببووم. خۆشبەختانە چەند ساتێك دوای ئەوە مێردەکەم هاتەوە و من بەشێوەیەکی زۆر میکانیکی پەرداخێك خاکشیر و لیمۆم دایە دەستی و هەر لە خۆوە بەبێ هیچ پێشەکییەك وتم:

—هەندێجار تەڵاق شتێکی ئەوەندەش خراپ نییە.

—چییە، هاتبووە سەرێ؟

—یان ئەو زۆر سادەبوو یان من زۆر جێی بڕواو متمانەی بووم.

—دووەمەکەیانی، چۆن چۆنی؟

—هەرچییەکی هەبوو و نەبوو وتنی.

—مێردەکەی ئەمیش خوێڕییە؟

—نا، خوێندەوارە، دکتۆرە لە کۆمپانیای نەوت، دەستی ئەوانەشی نییە.

ڕەزا بەلوعەکەی کردەوە و بە پێکەنینەوە ویستی دەرگای حەمامەکە دابخات، بەڵام من هیچ

هۆش و حەواسم نەبوو، لە خۆوە دەنگم نزم کردەوەو چوومە ژوورەوە. دەرگای حەمامەکەم داخست و لەسەر ئاودەستە رۆژئاواییەکە دانیشتم:

—باوکی مردبوو.

سەری لە ژێر بەلوعەکە هێنایە دەرەوە و وتی:

—چی؟

هەر لەسەر توالێتەکەوە سەرێکم کێشا:

—باوکی مردبوو.

—بەلأم سەروسیمای لە باوك مردوو نەدەچوو.

—بۆچی بینیت؟

—بەڵێ لەسەر پلیکانەکان. چاکو خۆشییەکی گەرمیشی لەگەڵدا کردم.

—دەیویست بزانێ ئاخۆ پێویستە بچێ بۆ پاکستان بۆ سەرەخۆشییەکەی باوکی یان نە.

—یانی چی؟ چی دەڵێی تۆ؟

هەستام و خاولییەکەی خۆیم پێداو وتم:

—رقمان لە باوکێتی.

دەبێ هەستێکی خراپم بەو قسانەم دەربڕیبێ چونکە لەو کاتەیدا کە رەزا زۆر بە ئەداو ئەتوارەوە خۆی دەنواند و پشتاوپشت دەهاتە دەرێ وتی:

—ئای لەو خوێن مژە. خۆم ئاگادارکەن!

پێکەنینم هات، خاولێیەکەم تێوە پێچاو دەستێکم بەڕیشە تەڕەکەیدا هێنا. گەرمم ببووەوە. لە حەمامەکە هاتینە دەرەوە. جوتێ پاپوچی وشکم لەبەر پێیدا داناو هەر لەوێداو لەسەر زەوییەکە دانیشتم:

—دیویەتی. هەموو شتێکی دیوە.

لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو خەریکبوو بە کلأوی خاولییەکە سەری وشك دەکردەوە:

—حەز دەکەی بچینە دەرەوە؟ دەمێکە نەچووینەتە ریستوران.

لەبەر دەرگای حەمامەکە هەستام و چووم قوتووی کرێمەکەم هێنا، لەلایەوە دانیشتم و پێیەکانیم خستەسەر ڕانم و یەکە یەکە چەورم کردن.

—بەدەم قسەکانی ئەوەوە منیش چێشتەکەی ئێوارەم لێنا. بەلأم چونکە لە موبەقەکەدا ئەوەندە قسەی پیس و ناشیرین کرا، هیوادارم خواردنەکەم تێك نەترشاندبێ، کێك و چایمان هەیە، دەخۆی؟

—تۆ دەستێ جلم بۆ بێنە و ئیتر دانیشە: من چایی دەهێنم.

—بەلأم من پێم وت کە پاکستانییەکان لە بڕیارەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە.

هەستاو چووە پشت پەردەکەوە. خاولییەکەی لە خۆی کردەوە و دایە دەستم، ئینجا یەکە یەکە جلەکانی لێگرتم:

—بۆچی؟

—ئاخر ئەو کەسە چەندین ساڵە چاوەڕێی دەکات.

—باوکی؟

—نا، ئامۆزاکەی. ئەوەی هەواڵی مەرگی باوکی پێداوە.

کە کراسەکەی لێگرتم سەری پەنجەکانیشمی پێوە راکێشا.

—ئەی مێردەکەی؟

—پێی وتووە تۆ ئازادیت. دێم لەوێ خانویەکت بۆ دەکرم. هەر کاتێکیش ویستت بگەڕێرەوە.

لە پشت پەردەکە هاتە دەرەوە. نازانم لەگەرما یان هەڵچوونی دەرونیی بوو داگیرسابوو:

—هەروا بەئاسانی؟

دڵم داکەوت. لە پڕ بەخۆمم وت نەکا سوچێکی روحی رەزام نەدیبێ:

—ئەگەر رۆژێك پێت بڵێم نامەوێت، بە زۆر رامدەگری؟

دیسانەوە مەسەلەکەیە، مافی تەلاقدان بە کێیە؟

نا، ئەوە منم پێت دەڵێم ئازادی، بەلام دەبێ بەلایەکت بەسەردا بێنم.

رەنگم لە روودا نەما:

-بۆچی؟

پێکەنی:

-بەلایەکت بەسەردا دێنم کە.. بەلایەکت بەسەردا دێنم کە هیچ کاتێك نەتوانی لە بیرم بکەیت، هەڵبەتە من ئەم بەلایەم بەسەردا هێناوی، خۆت ئاگات لێ نییە.

بە دوو پەنجە لوتیم گرت و رامکێشا:

پێم خۆش نەبوو وێنەی تۆ لە مێشکمدا خەتێکی تێکەوێ تەنانەت دوای جیابوونەوەش.

دەستی کردە ملم. سەرمی بەلای سەری خۆیدا کێشا و ناوچەوانمی توند بە ناوچاوانی خۆیدا دا:

-خۆشت دەوێم. نا؟

پەلە پیتکەیەکمدا لەسەری لوتی:

-خۆزگە ئەویش یەك دڵ بووایەتەوە، ئەوسا دەیزانی چی دەوێ. ئەوەندەی بەو دوو دڵییەوە دەتلایەوە ئەوەندە دڵگرانی باوکی نەبوو.

-بەستەزمانە تا بەیانی دەگریا.

-بۆچی تۆ بەخەبەر بووی؟

-بەڵێ. بەخوا ئەگەر خوشکم بوایە دەچوومە خوارەوەو ژیرم دەکردەوە، هەڵبەتە مێردەکەی بەردەوام خەریکی بوو، کە ژیری بکاتەوە. بەلام جارێك تەقەی دەرگاکەیان هات وئیتر دوای ئەوە هەر دەنگی گریانی ژنەکە دەهات، بەراست ناوی چییە؟

-رەخشان، رەخشانی عەزیزی. کاتێ لەگەڵ دوکتۆردا هەڵدێ و دێت بۆ ئێران، ناوی بنەماڵەی ئەو هەڵدەگرێ.

-هەڵدێ؟دەی دەی تۆش هەر جارەی تۆزێکی دەردەخەی[2]. کەواتە هەموو بەسەرهاتەکە لە پشت پەردەدا روودەدات. ئەگەر خۆشی نەوێ چۆن لەگەڵیدا هەڵهاتووە؟

-خۆی دەڵێ بۆیە هەڵهاتم چونکە دەمویست کارێك ئەنجام بدەم پێچەوانەی ویستی باوکم بێت. دڵم دەکولا. کەوتمە گەڕان بەناو نەیارەکانی باوکمدا. بەدوای دڵ بە سوێترینیاندا دەگەڕام. من زەبر و زرنگ بووم و ئەو دەردەی کێشابووم فێری کردبووم کە بەبێ سەوڵ نابێ لە ئاو بدەم. هەرچی دەوت دەمووت بەسەرچاو. ئێستا کە بیری ئەوسا دەکەمەوە رقم لە خۆم هەڵدەستێ، بە جۆرێك بە دەوریدا دەهاتم و خزمەتم دەکرد کە باوکم بە یەکجاری شیفتەم ببوو و منی بە پشتیوانی خۆی دەزانی. هەر بۆ ئەوەش کە من زۆر بە تەنیا نەمێنم لەوانی تر زووتر جێی کارەکەی بەجێدەهێشت و دەهاتەوە ماڵەوە. رۆژ نەبوو دیارییەکی بچوکی پێ نەبێ بۆم نەگبەتە نەیدەزانی ئەم هەموو خزمەتکردنە بۆ ئەوەیە کە رۆژێك زەبری ترسناکی خۆمی پێبگەیەنم. کە دەستی بە قژیدا دەهێنا قێزم هەڵدەشێوا و خەریکبوو لە ئێش و لە داخدا دەمردم بەلام بەو حاڵەشەوە لەبن دەستی دەرنەدەهاتم و نەدەچوومە ئەولاوە، ئاخر ئەو هەر بەو جۆرە دەستی بە قژی دایکمدا دەهێنا و دەیلاواند. بەلام چەند رۆژێك بوو هەروا مات و بێدەنگ بوو و دەستی نازی بەسەرمدا نەدەهێنا، تەنانەت رۆژێکیان کە هاتەوە بۆ ماڵەوە، بێئەوەی لالە من بکاتەوە یەکڕاست چوو بۆ ژوورەکەی خۆی و هەروا بە پێلاوەوە خۆی خستە سەر تەختەکەی. دەمزانی ئێستا دەڵێ: "رەخشان، ئاو بێنە!" بۆیە بە پەرداخێك ئاوەوەچوومە ژوور سەری، ئەویش بزەیەکی کاڵ و بێرەنگی بۆ کردم وەکو ئەوەی بڵێ ببووره کە گوێم پێنەدای. پاشان هەر بە دەست ئاماژەی کرد کە ئاوی ناوێ. شین ببووەوە و

چاوەکانی دەرپەڕیبوون. ترسام بمرێ. لە دڵی
خۆمدا وتم مەمرە! ئێستا نا. دەستم بردە
ژێر سەری و ئاوەکەم دەرخواردا. کاتێ دووبارە
سەریم خستەوە سەر سەرینەکە، چاوەکانی لێکنا.
منیش دەرگای ژوورەکەیم داخست و هاتمە دەرەوە.
لە دەرگایان دا. دەرگام کردەوە، ئەحمەدی ئامۆزام
بوو کە لە منداڵییەوە یەکترمان دەویست.

وەکو هەمیشە لە دەوروبەری ماڵی ئێمەدا
پیاسەی کردبوو و چاوی لێبوو کە باوکم لە ڕۆژان
زووتر و بەحاڵ و وەزعێکی ناتەواوەوە دێتە ماڵەوە.
ئەویش لەبەرئەوەی خۆی باوکی نەبوو، باوکمی زۆر
خۆش دەویست، ئیتر هاتبوو بزانێ چی بووەو لە
ڕاستیشدا دەیویست بە شێوەیەك لە شێوەکان لەمن
بگەیەنێ کە دەیەوێ دایکی بنێرێتە خوازبێنیم.
کاتێ پێم وت داروبارەکە ئاڵۆزە ویستی بڕوا بەڵام
من ڕامکێشایە ناو عەمبارەکەوە. داماوە ڕەنگی
هەڵبزڕکا بوو. زمانی کەوتبووە پرتە پرت "م.. م..
مامە" وتم "مەترسە، وەکو گا لەسەر تەختەکەی
کەوتووەو وا زوو هەڵناسێتەوە". ئەو هەر سەیری
دەکردم، سەیری لێدەهات کە بۆچی ئاوا دەربارەی
باوکم دەدوێم. ئاخر خۆ ئەحمەدیش سەبارەت بەو
هەستەی من بەرامبەر باوکم هیچی نەدەزانی.
شانەکانم هەڵتەکاند و لێی نزیك بوومەوە و هانمدا
تا ئەو کارەی دەساڵ پێشتر لە پشت تەپەکەوە
بەنیوە ناچڵ بەجێی هێشتبوو و هەڵهاتبوو، ئێستا
تەواوی بکات. وای لێهاتبوو نەیدەتوانی لە جێی
خۆی هەستێ بەڵام من هەوڵم دەدا کە هیچ هەستێکم
نەبێ. خێرا خێرا دەیووت: "خۆ تۆ هەمیشە
دەزگیرانی من بوویت. تۆ هاوسەری منی. ئێمە
پێکەوە زەماوەند دەکەین. تۆ حەلاڵی منی. مامم
ڕێگە دەدات". بەڵام ئەو وەزعی خراپ بوو و
نەدەهاتە دەست. سیغەکەمان خوێندو من هیچ
نارەزاییەکم دەرنەبڕی. هاتە لامەوە دانیشت و زۆر
بە میهرەبانییەوە وتی: "خۆ ئێشی نەبوو؟" دڵم
بۆی سووتا. پێی وابوو کاری خۆیەتی. نەیدەزانی
خۆ کوشتنی باوکی و ئیشەکەی من پەیوەندییان
هەبووە. لە پڕێکدا بڕیارمدا پێی بڵێم کاتێ تەمەنم
دەساڵان بوو، ئەو شەوەی کە مامم سەرخۆش بوو..
بەڵام هەستێك پێشی پێدەگرتم. هەر ئەوساش بوو
تێگەیشتم کە زۆرم خۆش دەوێ. دامە پرمەی
گریان. ئەو پێی وابوو لە شەرمدا دەگریم.
نەیدەزانی من لە داخی ئەوەی لەوە گەیشتووم کە
کەوتوومەتە چاڵی عەشقەوە و لەوانەیە نەتوانم
پلانەکانم جێبەجێ بکەم دەگریم. بەڵام نا، مامەکەم
کوشتبوو. ئینجاش نۆرەی مامی ئەحمەد بوو.
نەدەبوو سست بم. وازم لە گریان هێناو پەلەپەل
جلەکانم لەبەرکرد. جلەکانی ئەویشم دایە دەستی و
وتم خێراکە لێرە بڕۆ. سێ جار لێی پرسیم: "ئەی
ئێمە کەی بێین کارەکە تەواو بکەین؟" جاری سێیەم
بە بێزارییەوە وتم: "دەبێ ئارام بگری، پێم وایە
باوکم خەریکە دەمرێ". لە دواییدا بە زۆر کردمە
دەرەوە و خۆم هاتمەوە. درزێکی دەرگای ژوورەکەی
باوکمم کردەوە، سەیرمکرد پرخە پرخێتی و ئەگەر
زوو فریا نەکەوم دەمرێ. ڕامکرد و خۆم گەیاندە
ئەو بنکە تەندروستییەی کە بەیانیان کاری تیا
دەکرد. ئیتر هەروا هەڕەمەکییانە و بێئاگا لە هەموو
دنیای پەلی یەکێك لەو دوو پزیشکەم گرت کە
ئێشکگربوون و ئەمیان ئێرانیش بوو کێشامە
ماڵەوە بۆ ژوور سەری. هەڵبەتە ڕزگاری بوو بەڵام
بەدەستی ئەو کەسەی ببووە هۆی ئەوەی
جەڵتەلێیدا. دە ڕۆژ لە نەخۆشخانەدا بوو و هەر ئەم
عەزیزییەی مێردم بە دیارییەوە بوو و پێوەی
ماندوو دەبوو، کە چاویشی کردەوە ئەم خێرا لێی
دورکەوتەوە تاوەکو دووبارە تووڕە نەبێتەوە، ئەوسا

تێگەیشتم کە عەزیزی بووەتە هۆی ئەوەی باوکم لەو بنکە تەندروستییە دەربکەن. زۆر جاران پێم وتبوو کە چاویلکەکەی لەچاو بکات، بەڵام گوێی نەدەگرت. رقی لە چاویلکە بوو. بەڵام چاوەکانی ئیتر ئەوەندە لاوازو کەم بینا ببوون تەنانەت رۆژێك کە خەریکبووە ئاوی[3] بڕبڕەی پشتی منالێك بگرێ و منالەش لە گیانەڵلادا بووە، لە جیاتی ئەوەی ئاوەکە بکاتە ناو لوولەیەکەوە دەیرێژێتە سەر زەوی و خەسار دەبێ. عەزیزی چاوی لێیدەبێ و دەکەوێتە چەند و چوون لەگەڵیدا. باوکم دەکاتە دەرەوە و خۆی خەریك دەبێت و بە تەنیایی کاری منالەکە ئەنجام دەدات و رزگاری دەکات، ئینجا کاتێك ماندوو و مردوو لە کاری منالەکە دەبێتەوە و دێتە دەرەوە، باوکم یەخەی دەگرێ و لێیدەدا، ئەویش شکاتی لێدەکات و شکاتەکەشی بە هەند وەردەگرن، بنەماڵەی منالەکەش شوێن کارەکە دەکەون، ئەوسا دەردەکەوێ کە لە شتی تریشدا کەمتەرخەمی کردووە. عەزیزی هەموو ئەمانەی وەکو پۆزش هێنانەوە و بەرگریکردن لە خۆی بۆ باسکردم. بێخەبەر لەوەی چ چێژێك لەو قینەی باوکم وەردەگرم کە سەبارەت بەم هەیەتی. بەرەو رووی رۆشتم، پەنجەی شایەتمان خستە سەردەمی و وتم: "راستی راستییە، ئێوە ئەرکی خۆتان جێبەجێ کردووە". ئیتر لەو رۆژە بەدواوە پلان لە دوای پلانم دادەنا تا گەیشتە ئەوەی هەستم کرد بە تەواوەتی کەوتووەتە داوەوە. وتی، دەیەوێ بێتە خوازبێنیم. نەمهێشت. وتم تەنیا لەیەك کاتدا ئامادەم لەگەڵتدا بژیم، ئەویش بۆ ئێران هەڵبێین. وتی: بۆچی؟ وتم: چونکە ئەگەر ئەو ئامۆزایەم کە چەندین ساڵە داوام دەکات ئەمە بزانێ هەردووکمان دەکوژێ. باوکیشم خۆ نارازییە، ئیتر خوازبێنی چ کەڵکێکی هەیە. لە پێشدا نەیویست بێتە سەربار بەڵام کە وتم منیش

ئیتر ناتوانم بتبینم. رازی بوو. رۆژی هەڵاتن دەستی خۆم بڕی و خوێنەکەیم لە چەرچەفی سەر تەختەکە هەڵسو، ئینجا هەموو نامە دڵدارییەکانی عەزیزیو وێنەکەیم خستە ژێر چەرچەفی سەرمێز تەوالێتەکەم، بەشێوەیەك کە بە ئاسانی بدۆزرێتەوە. نامەیەکیش کە تێیدا بە باوکم دەڵێم ئەوە من رۆشتم و ئیتر ئەمە دوانزە ساڵە لێرەم.

—وتم ئەی ئامۆزاکەت چی؟

—لە پاش ساڵێك کاتێ نامەم بۆ نووسی، وەڵامی دامەوە کە لە هەر کوێیەك بیت دێم دەتکوژم. بەڵام کە هەموو شتێکم بۆ نووسی و پێم وت لەبەرئەوەی باوکت ئەو کارەی کردبوو نەمدەتوانی ببمە هاوسەرت، لە پێشدا وەڵامی نەدامەوە، دوایی کەم کەم نامەکانی هێمن و ئاسایی بوونەوە.

—بەسەرهاتێکی سەیرە؟ ئەی ئێستا چی؟

—دوکتۆر حەفتەیەکی مۆڵەت پێداوە. وتویەتی باش بیربکەرەوە، بزانە خۆشت دەوێم یان نە! ئەگەر خۆشت نەویستم ئازادت دەکەم. بڕۆی.

رەزا پەرداخێك چایی و گەزۆیەکی دایە دەستم و وتی:

—ساردبووەوە، شەهرزاد خانم.

—بەم چیرۆکانەم سەرتم ئێشاند؟

—نا. تەنیا شتێك کە ناتوانم تێبیگەم ئەوەیە چ شتێك بووە هۆی سەرگەردانیی ئەم ژنە.

—نازانی چەندە لە باوەشمدا گریا. بەراستی دایچڵەکاندم. راستیشت بوێ منیش باوەڕناکەم. یەکەمجاری بوو کە دەربارەی ئەم بەسەرهاتانە لەگەڵ یەکێکدا بدوێ، راستە بەرەدوو کەوتنەکەی وایکردووە کە باوکی بۆ هەمیشە کەفتەکار و زەمینگیربێ، بەڵام ئەو ئازارەی خۆی کێشاویەتی زۆر زیاتر و خراپتر بووە لەو بەڵڵایەی بەسەر باوکیدا هێناوییە. دەڵێ خۆشم نازانم

ئامۆزاکەمم خۆش دەوێ یان نە، ئیتر نازانم عەشق مانای چییە؟

-دڵم تەنگ بوو.

-یانی ئیتر پاشماوەکەی نەڵێم؟

-با، چۆن.

-دەیووت ئەگەر بمقیژاندایە، ئامۆژنم کە لە ژوورەکەی ئەولاوە لەگەڵ ئامۆزاکەمدا خەریکی وتوویژبوون گوێی لێدەبوو و دەهاتە یارمەتیم، بەڵام من خۆم هاوکاریم کرد. بیر بکەرەوە دەتووت تەپڵ و نەققارەیە هەر دەڕۆشت و هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە بە هەمووان دەڵێت و وەهاش خۆی تورە دەکات و دەمارەکانی دەردەپۆقێنێ وا بزانن دەیەوێ خۆی بکوژێ. دەیووت کاتێ تەرمەکەی مامیان دەبرد ئەو لە عەمبارەکەدا سەمای دەکرد، ڕێك وەکو ئەوسا کە دایکی سەمای کردووە.

-کچۆڵەیەك؟

-بۆچی چییان لێکردبوو؟

-چوار ژمارە تەلەفۆنی بدرێ و دوای نیو سەعات داوای لێبکە دووبارەی بکاتەوە.

مێشکێکی بێ وێنەی هەیە. دەیووت کاتێ ئەو ڕووداوە قەوماوە ئەو دوو ساڵ و نیو بووە و هێشتا زمانی نەپژاوە. دەیووت لەناو دەرگای ژوورەکەدا دانیشتبووم و سەیری دایکمم دەکرد. دیتم وەکو ئەوەی بییەوێ کەسێك غافڵگیر بکات هێواش هێواش بەرەو حەوشەکە چوو. منیش بە گاگۆڵکێ شوێنی کەوتم. لە نێوان پێیەکانییەوە پیاوێکم دی لەسەر دیوارەکەوە خۆی هەڵدایە حەوشەوە و بۆ چاوتروکانێك دەموچاویم دیت خوێناوی بوو بەڵام کە دووبارە هەستایەوە ئیتر پێشی کراسەکەی دایکم نەیهێشت گشت گیانی ببینم. تەنیا دوو قاچم دەدی کە بەرەو لای دایکم دەهات. کەچی ئەو لە جێی خۆی نەبزوت و هەروا لە ناو ئەو دەرگایەدا وەستا کە بەرەو حەوشەکە دەکرایەوە. پیاوەکەش هەر کە گەیشتە لای دایکم نازانم ئیتر لە ترساندا یان لە ئازاردا بوو نووشتایەوەو کەوتە سەر ئەژنۆ. دایکم لە باوەشی کردم و پێکەوە چووین و سوراحی ئاوەکەمان هێنا. دایکم سوراحییەکەی دایە دەست پیاوەکە، ئەویش ئەوەندەی ئاو خواردەوە کە ئێستاش قوڵتە قوڵتەکەیم لە گوێدایە. ئینجا سوراحییەکەی خستە لای دیوارەکەوە و بە قوڵی کراسەکەی ئەو خوێنەی خەریکبوو دەچووە چاوییەوە سڕی. دایکم لەسەرخۆ ئەو تاکە بازنە پانەی باوکم بۆی کڕیبوو، لە دەست دەرهێناو بۆ پیاوەکەی ڕاگرت. بەڵام ئەو سەرێکی باداو چووە پەنای دیوارەکەوە دانیشت. هەر بە هەمان خوێن ساردی و ئارامییەوە بازنەکەی کردەوە دەست و منی لەسەر زەویەکە دانا. ئینجا چوو لەفافی هێناو گەڕایەوە، دەتووت سەد ساڵە یەکتری دەناسن، برینی سەری پیاوەکەی پێچاو گەڕایەوە ماڵەوە، ئیتر ماینەوە من و پیاوەکە. ئەو بۆم پێکەنی و هەردوو دەستی بە گیرفانەکانیدا گێڕا. دەتووت بە دوای شتێکدا دەگەڕا، بەڵام کە زەردەخەنەکەی وشك بوو و دەستەکانی دەرهێنا زانیم کە بەدوای شتێك یان شیرینییەکەدا دەگەڕا کە بیدا بە من.

پیاوەکە خواردنەکەی خوارد و بێئەوەی سەرهەڵبڕێ قاپەکەی دایەوە بە دایکم. دایکم بێدەنگییەکەی شکاند:

-بە دواتەوەن؟

پیاوەکە زۆر بە ئارامی وتی:

-بەڵێ.

-دیارە کە دزنیت، پیاوت کوشتووە؟

پیاوەکە دووبارە سەری لەقاند.

-بەڵام تۆ ناتوانی زۆر لێرە بمێنیتەوە. خۆرئاوا مێردەکەم دێتەوە.

—پێش خۆرئاوا.. پێش خۆرئاوا دەڕۆم. سێ شەوە نەخەوتووم.

—هەستە برۆ لە ژێر زەمینەکەدا بخەوە، دوایی دێم خەبەرت دەکەمەوە.

پیاوەکە بە نیگاو بە چاو بەدوای ژێرزەمیندا گەڕا. دایکم وتی: "بەدوامدا وەرە!" ئینجا بردییە ژێر زەمین. پیاوەکە ئارام و بێدەنگ وەکو منداڵێکی گوێڕایەڵ خۆی بە توانای دایکانەی دایکم سپاردبوو. لە پاش تۆزێك دایکم لە ژێر زەمینەکە هاتە دەرەوە و دووبارە بە پەتویەکەوە، لە چالآیی پلیکانەکانی ژێر زەمینەکەدا گوم بوو.

عەسر خەبەری کردەوە. جلی پاکی پێدا. پیاوەکە بوخچەی جلەکانی لە برینەکەی سەرییەوە پێچا و هەر بە نیگا لە دایکمی پرسی:

—هێشتا نەهاتووەتەوە. دایکیشم سەرێکی هەڵبڕی کەیانی نەهاتووەتەوە چەند جار سەری کێشایە دەرەوە و سەیری کۆڵانی کرد. کە دڵنیابوو کەسی لێ نییە ئەوسا بە دەست بانگی لێکرد کە بێ و بڕۆ، بەڵام مامم ئەو پیاوەی دیتبوو کە بە هاوکاری دایکم لە ماڵی ئێمە چوو بووە دەرەوە. نازانم بۆچی دایکم هیچی نەدەوت. تەنیا ئەو کاتەی کە قامچییەکە لا چاوی هەڵدڕی و سەرو چاوی بە فرمێسك خووسا، سەیرێکی باوکمی کرد و وتی: "نەمدەناسی". ئیتر باوکم لە داخا قامچییەکەی بە زەویدا کێشا و رۆشت. منیش کە لەو کاتەدا خۆم تەڕ کردبوو زووڕە زووڕ دەگریام، وامزانی ئیتر تەواو بوو. کەچی تازە سەرەتای کار بوو، باوکم سێ رۆژ نەهاتەوە بۆ ماڵەوە. رۆژی سێیەم جوانم لە بیرە، نیوەڕۆ بوو. لە ژوورەکەدا دانیشتبووم و قژی بووکەکەمم لەناودەستدا بوو. لە هەوڵی ئەوەدابووم کە مەمکە مژەکەم بکەم بە گوێچکەمدا. لە پێشدا گوێم لە تەقەی دەرگاکە بوو، پاشان سێبەرەکەی باوکمم دی کە بەخێرایی بەرەو موبەقەکە دەڕۆیشت. زۆر بە خۆشییەوە بەدوایدا رامکرد بۆ ئەوەی وەکو هەمیشە لە باوەشم بکات و بمخولێنیتەوە. دایکم کاتێ باوکمی دی لە پێشدا زەردەخەنەیەکی کرد بەڵام هەر کە زانی چی بە دەستەوەیە تێگەیشت مەسەلەی لێبوردن لە ئارادا نییەو زەردەخەنەکە بە لێوییەوە وشك بوو. قەت لە بیرم ناچێتەوە. دەتووت تێکڕای دەنگەکان بڕابوون و هەرمشەمشی هەناسەی ئەو دووانە دەهات. لەو رۆژەدا چاوەکانی دایکم لە هەموو کاتێك درشتر ببوون بە باوکمی وت: "با بچینە حەوشە بچوکەکە[4]. دەرگاکەش داخە با منداڵەکە هیچ نەبینێ". باوکم زۆر بە دیقەت و پارێزەوە لە دایکمی دەڕوانی. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە دەبینم زۆرتر لەو پیاوە دەچوو کە بییەوێ چێژ لە ساتێکی جووتبوون ببینێ نەك پیاوێك بییەوێ ژنەکەی بکوژێ. وتی: "بڕۆرە حەوشە بچوکەکە". دایکم پشتاو پشت بەرەو حەوشە بچوکەکە رۆشت بەڵام چاوی هەر لە من بوو. منیش بێئاگا لە هەموو شتێك لەناو دەرگای موبەقەکەدا دانیشتبووم و خەریکبووم تالآیی سەری مەمکە مژەکەمم دەمژی. دایکم وتی: "منداڵەکە" بەڵام ئەو چیتر گوێی لێنەدەگرت. هەر کە دایکم گەیشتە دەرگای حەوشە بچوکەکە ئەو بۆ چرکە ساتێك سنگ و بەرۆکی توند گرت و هەڵیدا، دایکم کەوتە ناو حەوشەکە. لەو ساتەدا دووبارە منی دی. بۆ ساتێك وام هەست کرد کە دەپارێتەوە بەڵام دەتووت دەمیان دووریوەتەوە. هەستا و چوار مشقی دانیشت، ئەوسا ئەو تەنەکە نەوتەکەی بەرزکردەوەو وەکو کەسێك بییەوێ ئاو بکات بە یەکێکی تردا ئاوا هەموو نەوتەکەی کرد بە سەریدا و هیچی تێدا نەهێشت. من پێم وابوو شەڕە ئاو دەکەن بە تایبەت کە دایکم هەرچەندە لەو کاتەدا

دەمدی تیله چاوێکی هەر لە منە بەڵام زۆر ئارام و خوێن سارد بوو. کە شقارتەکەی داگیرساند دایکم هەستایە سەرپێ، دەستەکانی ئاوەڵەکرد و هەڵیبڕین، ئینجا کەوتە سوڕانەوەیەکی سەیر. شتێك لە نێوان سەماکردن و خولانەوەدا بوو. ئیتر کە کراسەکەی گڕی گرت و داگیرسا ئەو دەرگای حەوشە بچووکەکەی داخست و رایکرد، ویستی بەسەر مندا باز بدات بەڵام پێی لەمن هەڵکەوت و هەردووکمان توند کەوتین، جا تا ئەو هەستایەوە من چاوم لێبوو دایکم خۆی کێشا بە شووشەی دەرگای نێوان حەوشە بچووکەکەو موبەقەکەدا. شووشەخرمەی کرد و ڕژا، ئەویش زۆر شڵەژاوانە منی هەڵگرت و دەرگای موبەقەکەی پێوەدا و لەو دیویشەوە دەسکەکەی توند قایم کرد. من ئەو دەمە گوێم لە زرمەی کەوتنی دایکم بوو لە موبەقەکەدا ئیتر هیچی ترم نەبیست. لە پاش چەند دەقەیەك بە دوو دڵی و دڵە ڕاوکەوە دەرگای موبەقەکەی کردەوە. جەستەی دایکم هێشتا ئاگری لێهەڵدەستا. منی فرێدایە سەر زەویەکە و سەرەتا بە دەست و پاشان بە راخەرەکەی موبەق ئاگرەکەی کوژاندەوە. بەڵام کار لە کار ترازابوو. دایکم بەختی ببوو چونکە بەر لەوەی زۆر ئازار بچێژێ یەکسەرە دڵی وەستابوو. دەزانی، ئەو پێی وابوو من هیچم نەدیوە یان ئەگەریش دیبێتم لە بیرم نەماوە، دەیووت دایکت لە کاتی چێشت لێناندا ئاگری گرتووە. تەنانەت باوە گەورەشم شوێن ئەم مەسەلەیە نەکەوت. شکاتیشی نەکرد. نە لەبەرئەوەی کەس باوەڕ ناکات دوکتۆرێك ئاگر لە ژنەکەی خۆی بەردات نا، بەڵکو لە بەرئەوەی کە ئافرەتێك دەسوتێ، تەنانەت ئەگەر لە کاتی چێشت لێنانیشدا بێت هەموویان خۆیان بەسەر شۆڕ و سەرکزی هەست و ئیحساسێك دەزانن و دڵیان بۆ شتی تر ناچێ. بە کورتی ئیتر لەوساوە ماینەوە من و باوکم و نەفرەت. لە دوای دەساڵییەوە دەستم کرد بە.. بەڵام زۆر بە زیرەکی دەستبەکاربووم تا ئەو دەمەی دوکتۆرم ناسی. کە هاتیشم بۆ ئێران ئیتر مێشکم زۆر ئاسودە بوو و دەستبەرداری ئەو کارانە بووم.

رەزا پیاڵەی چاییەکەی لە نێوان دەستە عەرەقاوییەکانم دەرهێناو دەسرێکی لە قووتووەکە دەرهێناو بۆمی درێژکرد.

–دوکتۆری مێردی ئەم شتانە دەزانێ؟

–وتی نا، نازانێ.

–پێموایە حەفتەیەکی کات هەیە بۆ بیرکردنەوە، وا نییە؟ نەکا لە کەللەی بدات و بچێتەوە بۆ پاکستان. دەترسێم لەوێ بیکوژن..

–راست دەکەی. منیش دەترسم..

سەر لە بەیانی رۆژی دوایی هەموو ئیشەکانم بە پەلە ئەنجامدا و ئینجا چووم زەنگی ماڵی ژمارە شەشی شوقەکەم لێدا بەڵام کەس دەرگای نەکردەوە. دڵم داکەوت دیسانەوە زەنگەکەم لێدایەوە. دیسان هیچ هەواڵێك نەبوو. بەڵام نا.. کە جوان گوێم گرت، کەسێك بە دەنگێکی نزم دەگریا. رۆژی دووەم و سێیەم و چوارەمیش هەروا بوو. شەو وڕۆژ دەنگی گریان دەهات وەکو بارانی بەهار جارێك کپ و جارێکی تر بە دەنگی بەرز بوو. ویستم دیسانەوە بچم لە دەرگا بدەم بەڵام رەزا وتی، دەبێ لێیگەڕێین تەنیا بێ. ئەوەتا لە پەنای گریانەکانییەوە دەنگی بڕیاردانێکی گرنگ دێت.

رۆژی حەوتەم، هەینی بوو. زڕەی زەنگەکە هەردووکمانی داچڵەکاند. چاوەڕێی کەسیش نەبووین.

رەزا وتی:

–خێزانی دوکتۆرە.

–خۆشحاڵ بووم و بە خۆشییەوە بەرەو دەرگاکە

ڕۆشتم و کردمەوە، بەڵام ئەوەی لەودیو دەرگاکەوە بوو خودی دوکتۆر بوو بە چەپکێ گوڵی جوانەوە. بە نیگاکانیدا تێگەیشتم دەزانێ کە من دەزانم و گوڵەکەی بۆم درێژ کرد و وتی:

-ئەمە هی ڕەخشانە، پێی بدەن. هەرچی لە دەرگام دا نەبوو.

وتم: بەسەرچاو

خەریکبوو لە پلیکانەکان دەچووە خوارەوە کە گوێم لێبوو ڕەخشان بانگی لێکرد. دوکتۆر وەستا و وتی:

-بەڵێ گیانەکەم؟

ڕەخشان بە دەنگێکی ئاسایی وەکو هەمیشە پێی وت:

-بزانە دوکانداەرکە شیری هێناوە یان نە، بوتڵێك ساردیش بێنە!.

چەپکە گوڵەکەم پێی گەیاند و ئەویش بەشێوەیەك کە دوکتۆر عەزیزی گوێی لێبێ وتی:

-سبەی نیوەڕۆ بۆ نان چاوەڕێی تۆ و کاکە ڕەزا دەکەین.

## پەراوێزەکان

1-دانەوێڵەیەکی ڕەنگ نارنجی یەگجار وردە کە لە کونجیش وردترە و لە کاری پزیشکیدا بەکاردەبرێ. هەروەها لەگەڵ ئاو و شەکر و ئاوی لیمودا تێکەڵ دەکرێ و لە وەرزی گەرمادا وەکو شەربەت دەخورێت.

2-ئەم ڕستەیە لە فارسییەکەیدا بەم شێوەیە هاتووە: "هەر جارەی شتێکی ئەم باخە پێدەگات".

3-ئاوی بڕبڕەی پشت: مەبەست لە نوخاعە کە پێی دەوترێ دڕکە پەتك.

4-حەوشەی بچوك یان حەوشەی بچکۆلە: حەوشەیەکی بچوکە لەلای موبەقەوە دروست دەکرێ و دەرگاکەی دەچێتەوە سەر موبەق و بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاری موبەق بەکار دەبرێ، بە عەرەبی (مطبخ مساعد)ی پێ دەڵێن.

## سەرچاوە

ئەم چیرۆکە لە کتێبی (اسیر و عصیان) وەرگیراوە کە (راهیان اندیشه) چاپی کردووە.

# خاڵ

بیژەن نەجدی
لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی

دەلاکی حەمام لێم ناپرسێ، منیش ناڵێم کە خاڵی باسکی چەپم لە کوێ یان چ ساڵێك کوتاوە. تەنیا لێی دەپرسم.

–دەکرێ پاکی بکەیەوە؟

دەلاك دەڵێ: دەکرێ، بەڵام پاککردنەوەکەشی بەقەد کوتانەکەی ژانی هەیە.

ئێستا چووە کەرەسە و کەلوپەلەکانی بێنێ. پێموایە دەیهەوێ بە تێزاب پاکی بکاتەوە.

پشتم دەنێمە سەر کاشییە گەرمەکان و ڕادەکشێم، سەریشم دەکەمە سەر باڵنجێکی چەرمی. هەڵم و بوغێکی نەرم خۆی لە تیشکی خۆر هەڵدەساوێ کە لە جەغزی ڕەنگاوڕەنگی بنمیچەکەوە دارژاوەتە خوارێ. تیخێکی ڕیش تاشین بە دیوارەکەوە نووساوە و سەتڵی پاڵ دیوارەکە بۆنی لفکە و سابووناوی کۆنی لێدێ. ناشترسم، تەنیا ماندووم. دیتنی ئەو خاڵە شینە بە جارێ وەڕەزی کردووم. تەواوی باسکی داپۆشیوم. نازانم بۆ کوتام، بەڵام ئەوەندە دەزانم خۆم پێمخۆش بوو. سەرەتا بە خودکار وێنەی پەنجێرەیەکم لە نێوان هەنیشك و شانمدا کێشابۆوە. تایەکی پەنجێرەکە کرابۆوە و گوڵدانێکی بەتاڵی لێداندرابوو. دەسرەیەکیشم لە دەمم ئاخنیبوو نەکا لەبەر ژانی دەرزی و جەوهەرەکە زمانی خۆم بگەزم. هەر بەشێك لە پەنجێرەکە خاڵ کوت دەکرا، هەر ئەو شەوە ئەو بەشەی دەماسی. ژانەکەی لە بن باغەڵمەوە دەستی پێدەکرد. مێلوورەی دەکرد و دەبوو بە دوو بەشەوە. یەکیان بەرەو لاملم هەڵدەگەڕا و لەبن گوێچکەو لاجانگمەوە تێدەپەڕی و ئەوی دیکەیان بەسەر پەراسوو و شلکەڕانمدا دادەگەڕا بەری پێمی گەرم دادێناو ئازای ئەندام وەسەر ئارەقە دەکەوت. پاشان دەمتوانی سەرخەوێك بشکێنم. ڕۆژێك کە ئاوسانی باسکم نیشتەوە و توانیم ئەم پەنجێرە شینەی سەر باسکم لە هۆدەیەکدا کە تەنانەت پەنجێرەشی نەبوو لەگەڵ خۆمدا بگێڕم، دەنگی مەقامێك کەوتە بەر گوێم. یانی کەسێك مەقامێکی ئەویندارانەی دەچڕی و

بەسەر دەموچاومدا دەگریا. ئێستا دەبوو شێرەی ئاوە گەرمەکە بەردەمەوە بۆ ئەوەی گیانم گەرم دابێ هەتا کاکی دەلاك دێ. دیسان ڕادەکشێم و دەستم بەسەر موزاییکی تەختی حەمامەکەدا دوور لە جەستەم درێژ دەکەم. هەر بەو شێوە کەوانییەی ئەو ڕۆژەی سەر گژ و گیاکە دەستم دانابوو. خەریك بوو خەوم لێدەکەوت. لە ژوور سەرمەوە لقو پۆپی دارەکان وەك تاق وێك هاتبوونەوە. هەر کەڕەتێ کە با لقوپۆپی دارەکانی دەجوولاندەوە پەڵەیەك هەتاو بەقەد سفرەی ناشتایەك دەکەوتە سەر گژوگیاکە. یان دەکەوتە سەر سینگم، جاری واش بوو لەسەر سینگمەوە دەخزێ و دەکەوتە سەر گیاوگژەکە، مەبەستم سفرەکەیە.

لایەکی دەموچاوم ڕووی لە دالآنی ئەو سپیدارانە بوو کە لە چۆمەکەوە دەهاتنە دەرێ و لەملاو ئەولای پردەکەوە کۆتایی دەهات. لەوبەری پردەکەشەوە دارستانی تووسکا لە چاو ون دەبوو.

گیاوگژ هێشتا بۆنی بارانێکی لێدەهات کە بەیانی نمێك باریبوو و خێراش خۆشی کردبۆوە. تاپۆی ڕەشی ژنێك لەسەر پردەکە دەجوولآیەوە. هێندە دوور بوو کە هەم دەتگوت ڕاوەستاوە و هەم دەتگوت دێتە پێشێ و هەمیش دەتگوت دوور دەکەوێتەوە.

پێموایە چەن ساتێ چاوم چووە خەو ماوەکەشی هێندە کورت بوو کە نەکرێ خەون بە کەسەوە ببینی. ئێستا چ ڕەشپۆش و یان.. کە چاوم هەڵێنا ژنە گەیشتبووە نێو دارەکان. لەو سەری دالآنی سپیدارەکانەوە جل و بەرگەکەی لە پەنا قەدی دارەکاندا قاوەیی دەهاتە بەر چاو. هێشتا دەموچاوی نەبوو. ترپەی پێشیم نەدەبیست. بە پاڵ دارەکاندا دەهاتە پێشێ. دەتگوت هێندێ جار دارە و هێندێ جاریش ژنێك.

چاوم قووچاند. دیسان هەم دارم دی، هەم ژنێك. دارەکەش ڕەشپۆش بوو ژنەکەش. ئەوان هەر بەو ڕادەیە دوور بوون کە لەوە دەچوو نزیك بن.

ئەگەر لەو ساتەدا چاوم هەڵنەهێنایە، ئێستا ئەو یەکێ لە خەونەکانی من دەبوو. بەڵآم چاوم هەڵێنا. دیسان دیتم. جانتایەکی چکۆڵەی بە دەستەوە بوو.

مانتۆ درێژەکەی سەوز بوو. هەر ئەو ڕەنگە بوو کە ئەوی لەو شەقامە دوور و درێژەی سپێدار و ئەو هەموو سەوزاییەی لق و پۆپەکاندا لەبەر چاوم ون دەکرد و چاوی خستبوومە ڕێشکە و پێشکە. شانێکی ئەوەی لای جانتاکەیەوە لەگەڵ هەر هەنگاوێك دادەنەوی. نیوەی لەشی شەکەت دەهاتە بەر چاو. نیوەکەی دیکەشی دەکرا دایە گەورەم بێ. یان ژنێك کە تەنیا جارێك بە خەونی پیاودا تێدەپەڕێ و ئیتر قەت لە هیچ کوێ نایبینییەوە. تەمەنێکی مەعلوومی نەبوو. یان لانی کەم بۆ من وابوو کە لایەکی ڕوومەتم لەسەر گژوگیاکە بوو و ناچار بووم هەموو شتێك لە خوارەوە بۆ سەرێ ببینم و سالآنێکی زۆر لە تەمەنم لە هۆدەیەکدا گوزەرابوو کە بە ڕۆژا گولۆپ ڕووناکی دەکرد و تا برسیمان نەبوایە نەماندەزانی نیوەڕۆیە. هەتا سەرماشمان نەبوایە نەماندەزانی پایز هاتووە. بە تایبەت من کە دەبوو سەرم لە تاقی دووهەمی چرپاکەوە شۆڕکەمەوە تاکوو شەمچەیەك شتێك لە کەسێك وەرگرم. دەبوو هەموو شتێ لە سەرەوە بۆ خوارێ ببینم. بۆیە ئەو ژنە تەمەنێکی مەعلوومەی نەبوو.

دیسان خەریك بوو نزیك دەبۆوە. (بۆنی گیاوگژ لەسەر دەموچاوم بوو). ترپەی هەنگاویم لەبن خۆڵەکەوە دەبیست و دڵم وەك دڵی ئەو ئەسپانەی چەن سات بەر لە بوومەلەرزە گوێزنگی لاقیان پڕ دەبێ لە ترس، داخورپابوو. ژنە تەنیا چەند

هەنگاوێ لێم دوور بوو. جل و بەرگەکانی زەیتوونی و لەچکەکەی ڕەش بوو. هێندێ لە پیریی دایکم جحێڵ تر بوو. بەڵام زۆر پیرتر بوو لەو سپێدارە تازە چەقاوەی کە جانتاکەی پێوە هەڵپەساردبوو. خەریك بوو بە بەری دەستی چەپەی شانی ڕاستەی دادەماڵی. هێندە کز بوو کە دەتکوت قەت زگی نەکردووە و منداڵی نەبووە. گرێی لەچکەکەی کردەوە و بە لۆیەکی ئارەقەی بن ملی سڕی. لەچکەکەی گرێ نەدایەوە و دەستیدا جانتاکەی. لەبیرم نییە بە کام دەستی هەڵیگرت. تەنیا دەهات، دەهات، دەهات.

ئێستا لە هیچ ژنێك نەدەچوو. کەس نەیدەتوانی بە خەون بیبینێ. نەدەبوو ناوی ببێ. ناوی هەر نەبوو. لە کەسیش نەببوو، دایکم نەبوو. شتێك بوو. چۆن بڵێم. گڕاوێك کە پیر بووە. یان دایکێك کە لە پاش من وەلحاسڵ ڕۆژێك دەبوو لە دایك بێ، ڕەنگە ئەگەر دانیشتبایەم بەلامدا تێدەپەڕی و یان ئەگەر بە پێوە بوایەم بە ڕێی خۆیدا دەگەڕایەوە یان ڕەنگە، نازانم. ئەگەر خەریکی پیاسە کردن بوایەم، وای دانێین لە پێیانەڕێیەکدا هەر نەدەبینرا.

تەنانەت ئەگەر لێی بپرسیایەم کاکە، موسافیرخانەی فلان لە کوێوەیە؟

تەنانەت ئەگەر بمگوتایە: کوێ؟ نازانم ها، لەوسەری ئەم شەقامەیە.

ڕەنگ بوو هەنگاوێ دوور کەومەوە دیسان بپرسێ:

—خۆ گران نییە. کاکە لەگەڵ تۆمە!

منیش جوابی بدەمەوە: نازانم باوەڕ بکە نازانم.

ژنەش درێژە بە قسەکانی دەدا: خراپیی ئەو موسافیرخانانە ئەوەیە هۆدەیەك کە خۆری تێدەکا، دەیدەن بەو موسافیرانەی کەساڵی پێشووش هاتبێتنە ئەوێ.

پاشان حەتمەن هەردووکمان بزیەکمان دەهاتێ.

ئەم بیرو خەیاڵانە هەر ئێستا بە زەینمدا تێپەڕین، نەك ئەو کاتەی کە ژنە لە پەنام ڕاوەستابوو و ڕەشایی لەچکەکەی نەیدەهێشت کە ئەو سفرەیە بکەوێتە سەرم. هەر بە جانتاکەیەوە، کە دەسکەکەی توند لە مشتی گرتبوو، بەو دەموچاوە کە وردەتیشکی نێوان لك و پۆپەکان نەیدەهێشت ببینم، خۆی کرد بە پەنجێرەکەی باسکی چەپەمدا. ئەم پەنجێرە خاڵکوت کراوە. ئێستا پیاسەی دەکرد. بە ژێر پێستی لەشمدا دەڕۆیشت. تەقەی پاژنەی کەوشەکەیم لەسەر یەسقانی باسکم هەست پێدەکرد. هەر کە جانتاکەی دانا ئیتر هیچ دەنگێکم نەهاتە بەر گوێ. ڕاستەوە بووم و دانیشتم. چاوێکم لە پەنجێرەکە کرد. پاشان چاوم لە دەوروبەرم کرد و ئەو دارانەی کە بەڕێدا دەڕۆیشتن. نەك ئەوەی هەر بە ڕاستی بەڕێدا بڕۆن. سەرنجم لەم دار بۆ ئەو دار بە شوێن کەسێکدا دەگەڕا کە کتوپڕ بزر ببوو. ئەو گەڵایانەی کە داوەریبوون، خشەخشیان لێوەنەدەهات. گەڵایەکیش کە تازە داوەریبوو، وەك مەچەکی دەستێك دەچوو کە قرتابێ و چنگی لە هەوای دەوروبەری خۆی گیر دەکرد و دەهاتە خوارێ، بێ ئەوەی بتوانێ چنگ لە شتێك گیر بکا.

باسکم گرت، بەری دەستم لەسەر خاڵەکە دانا. ترسی ئەوەم بوو کە ئەو گەڵایەش خۆ بکات بە پەنجێرەکەدا.

ژنە گوتی: ئێرە بۆ وا کتوپڕ تاریك داگەڕا؟

ئەوە یەکەم جار بوو کە گوێم لە دەنگی دەبوو. باسکم بەردا. دەنگی هەر وەك ئەو ژانەی کە گەیشتە بن باغەڵم، بوو بە دوو کەرتەوە، یەکیان ڕۆیی بۆ لای ملم و لە گوێچکە و لاجانگم تێپەڕی. ئەوی دیکەشیان بە پەراسووەکانمدا ڕۆیشتە خوارێ. بریسکێك بە ئازای لەشمدا گەڕا و بەری پێم

گەرم داهات. ئەم جۆرە ژانە کە وەك خوێن بە لەشی مرۆڤدا تێدەپەڕێ، هێواش و لەسەرەخۆ. لەسەرەخۆ و هێواش دەبێتە چێژێکی خۆش کە تەڕە یان ڕەشە. یان من پێموابوو کە تەڕە یان ڕەش. یان هەر بە ڕاستی ڕەش و تەڕە. ئێستاکە وەبیرم دێتەوە وەشك دەکەوم.

لە هەوەڵین ساتی ئەو ڕۆژەدا، ئەم چێژە جا چ ڕەش چ تەڕ هەر نازانم، دەستی کرد بە گەڕیان. لەولای پردەکەوە سپیدار بە سپیدار بە پەنای دارستانەکەدا من و پەنجێرەکە دەستمان کرد بە هەڵاتن. ژنە لە نێو باسکمدا لەم دیوارەوە بۆ ئەو دیوار فڕی دەدرا. لەچکەکەی داکەوتبوو، جانتاکە لەبەر پێیدا دەخزی. دەوروبەری پڕ لە هاسکە هاسکی من بوو. بۆ نەیدەقیژاند؟ تەنانەت ئەو کاتەی بە سینگەوە فڕێدرا بۆ لای گوڵدانەکەش نەیقیژاند. تەنیا بە هەر دوو دەستی لێواری پەنجێرەکەی گرت و بەری نەدا تا ئەو کاتەی من بە پاڵ پۆمپی بێنزیندا (چوار گۆڕ لەسەر عەرزەکە ڕاوەستابوون) تێپەڕم و بە گۆڕەپانێکدا کە منداڵان تۆپێنیان لێدەکرد (ناکەس لەوێ تۆپێنی نەدەکرد) دەور لێدەم و بگەمە کۆڵانێك کە هەواکەی لە هەینی دەچێ و لە حەوشەی ماڵەکەدا شڵپێك ئاو بە دەموچاومدا بدەم.

وتاغەکەم هەر بۆنی شێدارییەکەی جارانی لێدەهات. کراسێکی ژنانە کە ساڵانێکی زۆر لەسەر کورسیلەکە کەوتبوو، ئێستاش هەر لەسەر کورسیلەکە بوو. دەکرا هی دایکم بێ. ماوەیەکی زۆر بوو دەستم لە کەلوپەلی هۆدەکەم نەدابوو. خاولییەکە، بۆنی لەشی کەسی لێنەدەهات. تەنیا گۆرەوییەکی تەنك کە لە پاڵ چرپاکەدا کەوتبوو ترپەی پێی کەسێکی لێدەهات. جووتێ چاوم وەبیر هاتەوە کە لە پشت چاویلکەی سەر تاقەکەوە دیار بوون. وە بیرم هاتەوە و ئەوەش دەزانم کە دایکم قەت چاویلکەی لە چاو نەدەکرد. یەکێ لە باڵنجەکان بە قەد چەن کاتژمێرێك خەوتن، بە قووڵدا چوو بوو. دۆشەکەکەش هێشتا تێك قوپاویی بەژنی ژنێکی پێوە دیاربوو. ژنە جانتاکەی کردەوە. جلوبەرگە گرمۆڵە کراوەکانی وەلاخست و قەتحە ئەکسێکی چکۆڵەی لە بنی جانتاکە دەرهێنا. پاشان گوێم لە دەنگی بزمارگەلێك بوو کە بە یەسقانی باسکمدا ڕۆچوون. پاشان دەنگە نەما، ژنەش قەتحەکەی بە دیوارەکەدا هەڵواسی و هاتە بەر پەنجێرەکە. هەنیشکی دا سەر لێواری گوڵدانەکە و چەنەی ناسەر لە پی دەستی.

گوڵدانی بێ خۆڵ و گیا..

قسەی نەدەکرد، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا خەریکی گۆڕینی جلەکانم بووم، یان ئەو کاتەی هێلکەوڕۆنم ساز دەکرد، چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا. ڕوومەتی وەك نەجیم زادان دەچوو. هەر جارێ کە چاوی دەقووچاند، دەموچاوی دایە گەورەم لە دوایین ساتەکانی نوێژدا وەبیر دەهاتەوە. پێستێکی جحێڵی بوو. لێوی تەڕبوو. دەتگوت تازە لە ماچێك دوور کەوتۆتەوە. جمگەی هەموو قامکەکانی خوار بوونێکی خەماوی و ڕۆماتیسمێکی کۆنەی پێوە دیاربوو. یان دانەوینەوەی ساڵانێکی زۆر شەتڵە برینج لێدان لە چەڵتووك جاڕدا. قسەی نەدەکرد، پاروویەك نان و هێلکەم لە دەمدا بوو. ڕۆژ گەیشتبووە کاتێك کە هەموو دوو دڵن لەوەی چرای وەتاغەکەیان هەڵکەن یان نا. هێشتا زەردەیەکی نەگرتبوو کە ددانی ببینم.

ئەم جۆرە ژنانە یان ناویان پەروانەیە، یان.. تاهیرە.

گوتی: هەمیشە بە تەنیا نان دەخۆی؟

گوتم: هەمیشەش نا.. ئەم ڕۆژانە هەمیشە.

گوتی: هێلکە و ڕۆنەکەت خراپ ساز کرد.

گوتم: دەبوو چۆنی سازکەم؟

گوتی: دەبوو لێی گەڕێی ڕۆنەکەی وا قرچ بێ دووکەڵی لێ هەستێ. دەبوو خۆی لە ڕۆنەکەی بکەی، پاشان هێلکەکان بشکێنی. ئەویش نەك بە هەر دوو دەست، بە یەکیان ئاوا. دەستی لە لێواری گوڵدانەکە هێنا خوارێ.

پاشان گوتی: هەر بە ڕاستی تۆم لە کۆی دیتووە.

ئەو پارووە نان و هێلکەیە هەر لە زارمدا بوو، بەڵام ئیتر نەمدەتوانی قووتی بدەم.

پرسیی: ناوت چییە؟

من تەنانەت نەمتوانی بڵێم مورتەزا.

ناوم مورتەزا نییە. هەر ئەو کاتەی ژنە گوتی: ناوت چییە؟ بە بیرمدا هات کە بڵێم "مورتەزا" ڕەنگە.

ڕەنگە لەبەرئەوە بێ لە شوێنێك کەسێك بە ناوی مورتەزا مردبوو و من دەمناسی و ئەم ژنە دەکرا دایك یان ژنی ئەو مورتەزایە بێ.

یان ڕەنگە کاتێك کە لە دایك بووم کەسێك لە پەنا مەلۆتکەکەمدا گوڕاندبووی:

—چەندە لە مورتەزا دەچێ.

وەلحاسڵ ژنە هەر کە وشەی مورتەزای بیست، گوڵدانەکەی بەجێهێشت و تا ئەوکاتەی بگەڕێتەوە و هەنیشکی بداتەوە سەرلێواری پەنجێرەکە و چەنەی لەسەر هەردوو لەپیدەستی دانێ، من تاوەکەم شۆرد و هەوڵمدا چاوێك لە نێو پەنجێرەکە بکەم. هەڵبەت نەك ئەوەی کە گوێی پێنەدەم. تەنیا دەمویست بزانم چیم بەسەرهاتووە و دەبێ چیبکەم لە خۆم.

ترپەی پێی دەهات، کە لە دوای هەر سێ هەنگاو ساتێك دەبیستراو دیسان سێ هەنگاوی دیکە. حەتمەن خەریك بوو لە نێو قەتحە ئەکسەکەدا هەنگاوی دەنا.

هێندێك ڕاکشام و هەر ئەو دەستەمم بە لێواری چرپاکەدا شۆڕکردەوە. دەماری پشتی دەستم وەدەرکەوتبوون و ژنە هەر خەریکی پیاسە بوو. کە مستم دەقووچاند پەنجێرەکە تۆزێ دەجوولا. ئەوەندە کە پێموابوو هەر ئێستا گوڵدانەکە دەکەوێتە خوارێ. ژنەش هەنگاوی دەنا. هەنگاوی دەنا. هەنگاوی دەنا، هەنگاوی دەنا.

تا وای لێهات گوتم: ئەگەر تۆ بتهەوێ تا بەیانی ئاوا بە ڕێدا بڕۆی من ناتوانم بخەوم هاتە بەر پەنجێرەکە. گوتبووم کە چۆن هەنیشکی دەداتە سەر لێواری پەنجێرەکە و بە لەپی دەستی دەموچاوی لە باوەش دەگرێ. وەك ئەوەی کەسێك باڵندەیەك لە نێو قامکەکانیدا بگرێ.

گوتی: بە هیچ شێوەیەك نایەتەوە بیرم تۆم لە کوێ دیتووە. ئەگەر چی ناوت مورتەزایە.

گوتم: من پێموایە..

ژنە گوتی: نا پێت وانەبێ و ئەسڵەن بیریشی لێ مەکەوە. تا ئەو کاتەی کە خەیاڵ پلاومان لە دەست دێ بۆ دەبێ بیر بکەینەوە. بەو جۆرە دەتوانم بڕوا بکەم کە لێرەم. خەریك بوو بەسەر پردەکەدا دەڕۆیشتم کە ئەم دالانی سپیدارانەم دی. کاتێ هاتمە نێو دالانەکەوە، لەشم شەلاڵی ئارەقە بوو. بەڵام لق و پۆپەکانی هێندە چڕوپڕ بوون کە فێنك بوومەوە. لەبەر ماندوویەتی بوو کە جانتاکەم دانا. قەتحەی ئەکسەکە لە نێو جانتاکەدا بوو. ئێستا ئیتر لە بیرم نەماوە، کاتی وەڕێکەوتن کام قەتحەی ئەکسم لەگەڵ خۆم هێناوە. هی کوڕەکەم، یان هی مێردەکەم؟ هەر لە بیرم نییە. ئارەقەی بن ملم بە لەچکەکەم سڕی و دیسان وە ڕێکەوتمەوە. پێم خۆش بوو چاوم بە کەسێك بکەوێ و لێی بپرسم لەو

دەوروبەرانە مسافیرخانەیەك هەیە یان نا؟ دیتم پیاوێك لەسەر گژوگیاکە ڕاکشاوە. یان خەوی لێکەوتبوو. دەبوو دوسێ جار بکۆخم تا خەبەری بێتەوە و لێی بپرسم:

—کاکە ئەم دەوروبەرانە مسافیرخانەی لێیە؟

حەتمەن دەیگوت: هەر ئاوا بڕۆ تا کۆتایی دارەکان. پاشان بەلای ڕاستدا بایدەوە. ئەوێ پڕە لە کاغەزی ئاگاداری و پڕوپاگەندەی مسافیرخانە. تەنیا خراپیی ئەو مسافیرخانانەش ئەوەیە کە بەبێ ناسنامە وەتاغ بە کەس نادەن.

منیش دەبوو جانتاکەم بکەمەوە و بزانم ناسنامەم پێیە یان نا.

بریا لانی کەم مارەیی نامەکەم بهێنایە. هێنابووم یان نەمهێنابوو؟

کلیلی جانتاکە لە نێو گیرفانی ڕووپۆشەکەمدا بوو. لە ژێر ئەو هەموو سەوزایی دارانەدا ڕەشایی کراسەکەم زەیتوونیی دەنواند. جانتاکەم بە یەکێ لە سپیدارەکانەوە کە لەوانی دیکە ساواتر بوو هەڵپەسارد، دەتکوت تازە چەقاندوویانە..

ژنە لە باسکم هاتە دەرێ. دایکم دیسان مرد. دایە گەورەم و تەواوی ئەو ژنانەی کە لەو ساڵانەدا وا من ئەو خاڵەم لەسەر باسکم کوتابوو مردبوون، دیسان مردنەوە. پەنجێرەکە دیسان کرابۆوە. کەس لەبەر پەنجێرەکەی باسکم نەبوو.

لە گوڵدانەکەدا گیایەك هەڵدەچوو کە گەڵاکانی دەتکوت برینی چکۆلەن لەسەر باسکم. ئێستا من و ئەو خاڵە کوتراوە شینەی پەنجێرەکە، لە نێو جەستەی دایکی مورتەزا یان ژنی مورتەزادا بووین. یان لە ژێر پێستی گراوێکی دایك کە بەسەر پردەکەدا ڕادەبرد، نازانم.

هێندە دوور بوو کە بۆم دەرنەدەکەوت دەیهەوێ لە پردەکەوە تێپەڕێ یان لە پردەکە تێپەڕیوە. پێموایە گرفتی من نەخۆمم، نە ژنێکە کە بەبێ مورتەزا ساڵانێکە بە جانتاکەیەوە لەم شار بۆ ئەو شار دەگەڕێ. ڕەنگە کوتانی وێنەی پەنجێرەیەك لەسەر باسکم لەو ساڵانەدا کە دیوارەکانی دەوروبەرم بێ پەنجێرە بوون هەڵەیەکی گەورە بووبێ.

ڕەنگە هەموو پەنجێرەیەك ئێستا خۆی لە خۆیدا هەڵەیەك بێ.

دەلاکی حەمام بە فۆتە و قاپی تێزابەوە هاتووە و من هێندە لە ئەم تیخی ڕیش تاشینە کە بە کاشییەکانەوە چەسپاوە دەترسم کە دیسان گیانم سڕ بووە. چونکە لەوانەیە مشتەرییەك شادەماری خۆی پێ بڕیبێ و ئاو پاشەکەی بەردابێتەوە و پاشان تیخەکەی بە دیوارەکەوە نووساندبێ و دوایی هەر لێرە ڕاکشابێ. چەندەم سەرمایە.

حەتمەن دوای ڕاگوێستنی تەرمەکە ئێرەیان شتۆتەوە. کاشی و موزاییکەکانیان گۆڕیوە، ئەی کەوایە چۆن هێشتا ئەم تیخە هەر بە دیوارەکەوە ماوە.

دەبێ هەوڵ بدەم تەنیا بیرم لای باسکم بێ. لەو کاتەوە کە خۆم ڕووت کردۆتەوە چاوم لێنەکردووە.

**تێبینی:** سەرجەمی چیرۆکەکانی ئەم کتێبە کراوە بە کوردی و بەم زوانە بڵاودەبێتەوە.

**سەرچاوە**

دیسان لەو شەقامانەوە

چاپ اول- 1379- نشر مرکز

# پیاوی ماڵ

فرانك ئوكونور
لە فارسییەوە: حەمە ڕەسوڵی حەسەن پوور

"فرانك ئووكانر" ناوە ڕاستەقینەکەی "مایکل جون ئودونووان"ە، ساڵی 1903 لە شاری (کورك)ی ئیرلەندا هاتۆتە دونیا. خوێندنی سەرەتایی لەم شارەدا تەواو کردووە، بەڵام نەیتوانی بچێتە زانستگە و وەك کتێبدار دەستی بە کارکردن کرد.

"ئووکانر" لە ڕێنیسانسی ئەدەبی وڵاتەکەیدا ئەندامێکی چالاك و گەنجبوو. ماوەیەکی دوورودرێژ بەڕێوەبەری شانۆی "ئیبی" لەسەر شانبوو. جگە لە بڵاوکردنەوەی سێ کۆمەڵە کورتە چیرۆك، دەستیدایە هەڵبەستوانی، سەفەرنامە نووسین، وەرگێڕان و ڕەخنەگرتنی ئەدەبی. لێکۆڵینەوەیەکیشی لە مەڕ ژیانی "مایکل کاینز" و شۆڕشی ئیرلەندا ئەنجامداوە. ئەو بە ماموستای کورتە چیرۆکنووسی ئەمڕۆ دەناسن و زۆربەی چیرۆکەکانی لە گۆڤاری "نیۆیۆکر"دا بڵاودەبۆوە. ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئیرلەندایەو دۆستایەتی و ڕوو ڕاستی ئەو لە وەسفکردنی کەسایەتی و فەزای ڕاستەقینەی چیرۆکەکاندا و تەنز و شێوازی شاعیرانە بوونەکەی لە یاد ناچێت و نیشانەی توانستی ئەوە لە بواری چیرۆك نوسیدا.

"ئووکانر" ساڵانێکی زۆری تەمەنی لە ئەمریکا بەسەربرد، لە زانستگاکانی هاروارد، نۆرس ویسترێن وانەی دەگوتەوە و لە ساڵی 1966دا کۆچی دوایی کرد.

کە لە خەو هەستام دەنگی پژمینی دایکم لە خوار دەرگای مەتبەخەکەوە بیست . بە ڕۆژان بوو دەکۆکی، بەڵام زۆر بە هێندم نەگرتبوو. لەو ڕۆژگارەدا ئێمە لە سەر جادەی کۆنی یووگاڵ دادەژیاین. ئەو جادە بەردەڵانی و گاگەلە ڕێیە بەرەو ڕۆژهەڵاتی کۆرك دەڕۆیشت. کۆکەکەی دەنگێکی ترسناکی هەبوو. جلەکانم پۆشی و گۆرەوی لە پێ چووومە خوار لەبەر بووڵێڵەی بەیانیدا دیتم. بێ ئاگا لەوەی یەکێك ئاگای لێیە، بە بێحاڵی لەسەر کورسییەکی خەیزەرانی بچوك کەوتبوو و دەستی بە کەلەکەی گرتبوو، هەوڵیدابوو ئاگر بکاتەوە، بەڵام نەیتوانیبوو. هێندە ماندوو کز دەهاتە پێش چاوان،

**که دڵم پێی سووتا. بەرەو لای هەڵهاتم و لێم پرسی، حاڵت باشە دایە؟**

**لە کاتێکدا هەوڵی دەدا خەندە ڕووبێت، جوابیدایەوە: ئێستا حاڵم چاکدەبێت. دارەکان تەربوون دووکەڵەکەیان وەپشمینی خستم. گوتم: بچۆ بخەوە خۆم ئاگرەکە هەڵدەکەم.**

**بە پەشۆکاویەوە گوتی: چۆن دەتوانم کوڕەکەم. دەزانی، کە دەبێت بچمە سەر ئیش. گوتم: ئەتۆ نابێت ئاوا کار بکەیت، من ناچمە قوتابخانە و لە ماڵێ دەمێنمەوە و ئاگام لە تۆ دەبێت. یەکێك لە تایبەتمەندییە خۆشەکانی ژنان، گوێبیستییانە لە هەر بوونەوەرێکی پانتۆڵ لەپێ. تەنانەت ئەگەر کوریژگەیەکی دەساڵانەشبێت.**

**بەدەنگێکی گوناه ئامێزەوە گوتی: ئەگەر بتوانی پیاڵەیەك چا بۆ خۆت لێنێی، لەوانەیە من پاشان چاکبمەوەو بەلەرزەلەرز هەستاو لە قادرمەکان وە سەرکەوت. ئەوە کاتە بوو زانیم حاڵی زۆر خەراپە.**

**لە خەڵووزدانەکەی ژێر قادرمەکان داری زۆرترم هەڵگرت. دایکم هێندە دەست پێوەگربوو لە ئاستی پێویستدا شتی مەسرەف نەدەکرد هەر بۆیە جاروبار ئاگرەکە دەکوژایەوە باوەشێکی پڕاوپڕ دارم وەئاگرەکە هاوێشت هێندەی نەخایاند ئاگرەکە خەریکبوو کڵپەیدەسەندو کترییەکەشی لە سەربوو. لە قەراغ ئاگرەکە نانم بۆ دایکم برژاند. من لایەنگری ئەمجۆرە نانەبووم بەکەرەوە لە سەرانسەری رۆژێدا. لە پاشانیش چام لێناو پیاڵەیەکم لەسەر سینی رۆنا و بۆم برد. پرسیم: باشە؟**

**بەگومانەوە پرسی. ئاوی کولاّو لەکەترییەکەدا ماووە؟**

**بەرووێکی خۆشەوە پشت راستمکردەوە کە زۆر خەستەو بەوە بیرهێنانەوەی سەبرو سیکەدانەی پاپاکان لە رەنج و کوێرەوەرییە زۆرەکانیان گوتم: نیوەی لێ بەتاڵ دەکەم.**

**ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: من پیرەژنێکی سەربارم.**

**گوتم: تاوانی منەو لەکاتی تێکردنی کوپەکەدا گوتم: قەت چاڵێنان فێرنابم. هەتا رونیشتووی مل پێچەکەت لەدەوری خۆت بپێچە. دەتەوێ دەلاقەکە داخەم؟**

**بەبێ باوەڕ یانە پرسی: دەتوانی؟**

**گوتم: ئەوە کارێکی ئەوتۆ نیە، کورسییەکەم بردە پێشەوە. پاشان ئیشەکانی دیکە ئەنجام دەدەم. بەرچایی یەکەم بەتەنیا لەبەر دەلاقەکە خواردو پاشان چوومە دەرەوەو لەبەردەرگای ماڵەوە راوەستام. تاکو سەیری منداڵان بکەم، کە دەچوون بۆ قوتابخانە ئەوان بە قیژەوە دەیانگوت: سالیوان وا چاکە پەلە بکەی دەنا پان دەبییەوە. گوتم من نایەم بۆ قوتابخانە، دایکم نەخۆشە و دەبێ ئاگام لە ماڵێ بێ . لە بنەڕەتدا من مناڵێکی شەڕانی نەبووم. بەڵام حەزم دەکرد خۆشییەکانی ژیانم لە ژێر رۆشنایی رۆژە رەشەکانی خەڵکانی دیدا سەیر بکەم. دیسانەوە کەترییەکەم کولاند. پێش شوشتنی دەمووچاوم. دەفرەکانی بەرچاییم کۆکردنەوە و بە زمبیلەی کڕینەوەو لاپەڕێك کاغەز و پێنووسێك چوومە هۆدەی ژێر شیروانییەکە.**

**گوتم ئەگەر وردە ئیشەکانم بۆ بنووسی ئێستا ئەنجامیان دەدەم. دەتەوێ دوکتۆرت بۆ بێنم؟**

**دایکم بە بێوازییەوە گوتی: ئاخ، تەنها کاری ئەوەیە بمنێرێتە خەستەخانە، ئاخر چۆن دەتوانم بچمە خەستەخانە؟ دەتوانی سەرێك لە دەرمانخانە هەڵێنی و شووشەیەك دەرمانی بەهێز و چاکی کۆکەم بۆ بکڕی.**

**گوتم: بینووســـە، ئەگەر نەینووسی لەوانەیە لە**

یادم بچێت. ووشەی "چاك" پڕرەنگتر بنووسە بە ڕاستی بۆ نانی نیوەڕۆیی چ بکرم هێلکە؟.

چونکا تەنها ئەو شتەی دەمتوانی لێ بنێم هێلکەی کولاو بوو. کەم و زۆر دەمزانی بۆ نیوەڕۆ دەبێ هێلکە بێ. بەلاّم دایکم گوتی "سووسیس"یش بکرم تاکوو ئەگەر توانی هەلّسێ و دروستی بکات.

لەسەر ڕێگەکەمدا بەلای قوتابخانەدا تێپەڕیم. رووبەڕووی قوتابخانە تەپۆلکەیەك بوو. هێندێکی لێوە سەرکەوتم‌و دەچرکەیەك لەوێ ڕاوەستام‌و چوومە نێوبیرکردنەوە جگە لەهەراوهوریای منالّەکان کە لەپەنجەرە کراوەکانەوە دەهاتە دەرێ و جگە لەئاغای "دنی دلانی" مامۆستای قوتابخانە، کەدارێکی لەپشتەوەی گرتبوو لەکاتی هاتوچوندا و رووبەڕووی دەرگای هاتنە ژورەوە بەدزییەوە چاوێکی بەدونیا دەرەوەدا دەخشاند، بینای قوتابخانەو حەوشەکەی وەك وێنەیەکی ئارام و ناداخراو بوو بەئاسانی دەمتوانی هەموو رۆژم لەوێڕا بەسەربەرم لەنێوان خۆشییە قوولّ‌و ساکارەکاندا ئەو ڕۆژانەدا ئەمەیان لە هەمووان باشتر بوو. کە گەیشتمەوە مالّ بە پەلە چوومە قاتی سەرەوە و "مینی ریان"م لەلای دایکمم دیت. ژنێکی تەمەن نێونجی دونیا دیتووی فرە ڕێس و رەوشت بەرزبوو.

پرسیم: چۆنی دایکە؟

دایکم بە پێکەنینەوە گوتی: زۆرباش.

"مینی ریان" گوتی: بەم حالّەش ئەمرۆ ناتوانی هەلّسی.

گوتم: کەترییەکە وەسەر دەنێم و پیالّەیەك چا دروستدەکەم.

"مینی ریان" گوتی: ئەمن وەسەریدەنێم.

بە ئارامی گــوتم: نیــگەران مەبە خانمــی ریان، دەتوانم ئەمکارەی بکەم. گوێم لێبوو بە گوێی دایکمی داچرپاند: "دیشا" کوڕێکی زۆرباشە، وانییە؟

دایکم گوتی: سەراپا گەوهەرە.

"مینی" گوتی: وەك دی زۆر نین. لەمڕۆژانەدا زۆربەیان وەك وەحشییان دەچن هەتا وەك مەسیحی یان.

دوای نیوەڕۆیی دایکم ویستی بچمە دەرێ و کایە بکەم بەلاّم من زۆر لە مالّەوە دوور نەکەوتمەوە. دەمزانی ئەگەر زۆر لە مالّە دوورکەومەوە دووچاری دلّەراوکێ دەبم. خوارەوەی مالّی ئێمە دۆلّێکی باریك و تەسکی لێبوو، کە سەرەوەی لەسەر تاشەبەردێکی سپی مەیدانی یەس یەسی سەربازان بوو و بنەوەی لە چالاّییەکی قوولّدا کۆرەگەی ئاشی لێبوو کە ئاوەکەی بە نێو تەپۆلکە و دارستاندا تێدەپەڕی و ئێمە لەبەر ئەو زەوق و حەزەی هەمان بوو ناومان لێنابوون "راکی هیمالایا" یان "هایلەند". هەر کە پێم دەگەیشتە ئەوێ، دونیای راستەقینەم فەرامۆشدەکرد. بۆیە لە دەرەوەی مالّ لەسەر دیوارەکە دانیشتم و هەر نیو سەعات جارێك سەرم لە دایکم هەلّدەهێنایەوە بۆ ئەوەی بزانم چۆنە و ئیشێکی هەیە یاخود نا.

شەو داهات، چراکانی کۆلاّنی رۆشن بوون و کورە رۆژنامە فرۆشەکە بە هاوار هاوار لە سەرەو ژوورکایی جادەکەوە سەرکەوت. رۆژنامەیەکم کڕی. چرای مەتبەخەکەو شەمعی هۆدە بچووکەکەی دایکم هەلّکرد و هەولّمدا رۆژنامەی بۆ وەخوێنم، بەلاّم زۆر سەرکەوتوو نەبووم. لەبەرئەوەی تەنها وشەیەك کەرتییەکانم بۆ دەخوێندرانەوە. بەلاّم زۆر حەزم لێی بوو دایکم خۆشحالّ بکەم و ئەویشدەیویست خۆشحالّ بێت. بۆیە لە سۆنگەی ئەم وێناکردنەوەوە، بە باشی پێکەوە ڕێککەوتین.

هێندێك دواتر "مینی ریان" دیسانەوە هاتەوە و کاتی ڕۆیشتن هەتا بەر دەرگا لەگەڵیدا ڕۆشتم.

کاتی ڕۆیشتن سەری وەرسووراند و گوتی: ئەگەر تاکوو بەیانی باشنەبێت پێویستە دوکتور "فیلاری" ئاگادار بکەم.

بە پەشۆکاوییەوە پرسیم: بۆ خانمی ریان، وا دەزانیت خەراپتر بووە؟

بەبێ تەفاوتییەکی ساختە جوابیدایەوە: ئاخ، مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵام دەترسم گرانەتای گرتبێت.

نای نێرنە خەستەخانە، خانمی "ریان"؟

لە کاتێکی داکۆڵوانە کۆنەکەی دەخۆیەوە دەپێچا، شانی بادان و گوتی: "ویشا" ناینێرن، تازە ئەگەر بیشی نێرن لەوە باشتر نییە بیسپێرین بە خواو لێی گەڕێین لە ئاکامی گرانەتا و ئەوەی لە دوایی دا بە سەر منداڵەکانیان دادێت، ئاگاداربووم.

"مینی" گوتی: ئەگەر چای گەرمی پێبدەیەت و چەند قەترە ئاوی لیمۆشی تێبکەی، لەوانەیە بێتەوە سەرخۆی.

دایکم لە دوای خواردنەوەی چای گەرم خەوی لێکەوت. ئەمنیش چراکانم کوژاندەوە چوومە قەرەوێڵەکەم، بەڵام خەوم لێنەدەکەوت, چەندەها جارێك بە دەنگی کۆکەی دایکە خەبەرم بۆوەو کاتێك چوومە ژوورەکەی دیم سەری زۆر گەرمە و وڕێنە دەکات. بەڵام ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێك ترساندی ئەوە بوو کە نەیناسیمەوە. بۆیە نەخەوتم و لە بیری ئەوەدا بووم ئەگەر بە ڕاست گرانەتای گرتبێت من چیم بەسەردێت؟

نیگەرانییەکەم کاتێك زۆر تربوو کە بەیانی تەندروستی دایکم قەت باشتر نەبوو بوو. هەر چیم لە دەست هاتبوو کردبووم، ئێستا بەنا هومێدی دەکرد. ئاگرەکەم کردەوەو بەر چایی دایکم بۆ برد.

بەڵام ئەمجارەیان لەبەر دەرگا ڕانەوەستام تا سەیری مناڵان بکەم، کە دەچن بۆ قوتابخانە. هێندە سەر قاڵبووم مەجالی ئیرەیی بردنم پێیان نەمابوو. لە بەرامبەردا چووم بە دوای "مینی ریاندا" و قەزیەکەم پێگوت.

بە لێبڕاوییەوە گوتی: من دەچم بە دوای دوکتۆردا، دڵنیابوون باشترە لە پەشێمانی.

پێویست بوو لە پێشدا سەرێك لە بونیادی پشتیوانی کران لە هەژاران بدەم تا نامەیەك وەرگرم سەبارەت بەوەی کە ناتوانین هەقی پشکنینی دوکتۆر بدەین و لە پاشان دەچوومە دەرمانخانە کە لە قووڵایی پشتەوەی قوتابخانە کە بوو. گەڕامەوە بۆ ئەوەی ماڵێ بۆ هاتنی دوکتۆر ئامادە بکەم.

دەبوایە دەفرێك ئاوی گەرم و سابوون و خاولییەکی خاوێن بۆ دوکتۆر ئامادە بکەم و پاشانیش نانی نیوەڕۆ ئامادەبکەم. دوکتۆر لە دوای نانی نیوەڕۆ هات. پیاوێکی قەڵەوی دەنگ بەرز بوو. لە بارەیدا دەیانگوت ئەگەر بە خۆی ڕاگەیشتبایە باشترین دوکتۆری "یۆرك" دەبوو.

لە کاتێکی دا لەسەر قەرەوێڵەکە ڕۆ دەنیشت و دەفتەری دەرماننووسینەکەی لە سەر ڕانی دادەنا نەڕاندی و گوتی: ئێستا ئەمە چۆن ئامادە دەکەی؟ تەنیا جێگەیەکی کراوەیە دەرمانخانەی باکوورە. خێرا گوتم: دوکتۆر دەچم و لەبەرئەوەی هیچی لە بارەی خەستەخانە دانەگوت ئاسوودەبووم. بە گومانەوە گوتی: وردیلەیەکی ئازایە، وانییە؟

دایکم گوتی: لە دونیادا هاوتای نییە دوکتۆر، کچێکیش لەم بە باشتر نەیدەتوانی بەمن ڕابگات.

دوکتۆر گوتی: ڕاستە، ئاگات لەدایکت بێت، لەبەرئەوەی زیاتر لەهەرکەسێك بەکارتدێت. تا ماون قەدریان نازانینوپاشان روی لەدایکم کردو لێی زیاد کرد: پاشان لەگشت تەمەندا بۆیان خەمبار دەبین.

حەزم دەکرد ئەوەی نەگوتبایە لەبەرئەوەی زۆر لەگەڵ پەشۆکانیەکەمدا دەهاتەوە یەك. خەراپتر لە هەموو شتیٚ ئەوە بوو، دوکتۆر تەنانەت دەستی لەو ئاوو سابوونەش نەدا کە بۆم ئامادەکردبوو.

دایکم ڕیٚگەی دەرمانخانەی نیشاندام‌و من شووشەیەکی پیٚچراو لە کاغەزی قاوەیی لە بن هەنگڵم نا وەڕیٚکەوتم. ڕیٚگە سەرەوژووربوو تا سەربازخانەکە، کەلەسەر تەپۆلکەی بەرەو شار بوو.

بە مەیدانی پڕ لە حەشمەتی گەڕەکی فەقیراندا تیٚدەپەڕی و پاشان لیٚژدەبۆوە و بە نیٚو دیواری بڵیٚنددا تیٚدەپەڕی و دەگەیشتنە شویٚنیٚك کە لە پڕ دەبوو بە ڕیٚگەی بەردەلاٚن و کۆمەڵیٚك خانووی بەخشتی سوور لە لایەکیدا دروستکرابوون و وردە وردە تا دۆڵی چۆمە بچووکەکە و نزیك کارگە لیٚژایی بوو، نەدەما لە تەپۆلکەکانی رووبەروودا ئەو هەمووە خانووە پڕ لە هەراو هوریایەی و پورە ئاسا دەوراندەوری تەپۆلکەکەیان تا سەر ریٚ داپۆشیبوو قەلاٚیەکی بەردینی رەنگ ئەرخەوانی دیٚرەکەو منارە قسڵییەکەی کەنیسەی "شاندۆن" لەسەرەوە و لە شویٚنیٚکی بەرچاودا، راوەستابوو. دیمەنەکەی هیٚندە بەر بلاٚو بوو کە قەت رۆشنایی هەمووی دانەدەپۆشی. وتیشکی هەتاو بەسەر پانایییەکەیدا تیٚدەپەڕی. ریزیٚك لە سەربانەکان بە درەوشانەوەیەکی بەفر ئاساوە دەردەکەوتن. پاشان بە چوونە قولاٚیی کۆلاٚنە تاریکەکان و هەیکەلی سیبەر ئاسای کەژاوەکان لە کاتی ڕۆشتندا ئەسپە هەوڵ دەرەکانی دیاری دەکرد. لەسەر دیواریٚکی کورت خوار بوومەوە و بیرم لیٚ دەکردەوە، کە مرۆڤ بە دیتنی ئەم دیمەنانە بەسەر دیواریٚکی کورتدا خوار بوومەوە و بیرم کردەوە کە بەنی ئادەم بە دینی ئەم روانگەیە ئەگەر خەمیٚکی لە دڵدا نەبیٚت، چەندە دەتوانیٚت چیٚژ وەربگریٚت بەلاٚم بە ئاخ

هەڵکیٚشانیٚك خۆم لیٚ دوور کردەوە و بیٚ ڕاوەستان تا خوارەوە هەڵخلیسکام و بە چەند کۆلاٚنی تەنگ و تاریك و پلیکانە پلیکانەی پشتی دیٚرەکە کە ئیٚستا گەورە دەهاتنە پیٚش چاوان، چوومە سەر بڕیارمدا لە دوای ئەنجامدانی ئیشەکەم بچمە کەنیسە و بە پیٚنی ییەی دایکم بۆ دڵخۆشی دابوو یمیٚ، مۆمیٚکی بکڕم و نەزری مریەمی پیرۆزی بکەم تا دایکم زووتر چاك بکاتەوە. دڵنیابووم ئەمکارە لە کەنیسەیەکی بەم گەورەییە و ئەم هەموو شکۆیەوە ئەم هەمووە نزیك بوونە لە خوا، کاریگەر تر دەبیٚت.

دەرمانخانەکە دالاٚنیٚکی تاریك و دڵگیر بوو، رەحلەیەك لەلایەك، دەلاقەی هەمان (گیشە) شویٚنی بلیت فرۆشتنی ویستگەی قەتار لەولای دیکەی بوو، کیژۆڵەیەکی شاڵ ئاوریشمی سەوزی کۆڵوانە لە کۆڵ لەسەر رەحلەکە رۆیشتبوو، دەستیٚکم لە دەلاقەکەدا، پیاویٚکی مۆن و تووڕەو تۆسنی دەنواند دەرگای کردەوە. بیٚ ئەوەی ئیزن بدات قسەکەم تەواو بکەم شووشە و کاغەزی دەرمانەکانی لە دەستم رفاند و بیٚ ئەوەی قسەیەك بکات دەلاقەکەی دادایەوە. ئیستیٚکم کرد و پاشان دەستم بەرزکردەوە بۆ ئەوەی دیسان لە دەرگا بدەم کچەکە گوتی: دەبیٚت راوەستی، کوریژگە ئاغاکە.

پرسیم: بۆ دەبیٚ راوەستم؟

بۆی شیکردمەوە: ئاخر پیٚویستە دروستی بکات، تۆش وەرەدانیشە.

دانیشتم‌و لەوە کە بەتەنیا نەبووم خۆشحاڵبووم.

پرسی: خەڵکی کامە گەڕەکی؟ و لە دوای ئەوەی جوابم دایەوە گوتی من لە "بارلی لین"دا دەژیم. لە پاشان پرسی: دەرمانەکە بۆ کیٚیە؟

گوتم: بۆ دایکم.

—نەخۆشییەکەی چییە؟

زۆر خراپ دەکۆکیٚت.

بیریار ئاساییانە گوتی: لەوانەیە ئازارە باریکەی بێت و هەر ئەو نەخۆشییە پارەکە خوشکمی پێمرد. ئەم شەربەتەش بۆ خوشکەکەی دیکەمە. ئەو پێویستە لێی بخوات. ئەو جێگەی لێی دەژین قەشەنگە؟

من باسی دەربەندەکەمانم بۆ کرد، و ئەو لە چۆمی نزیك ماڵەکەیان، لە پێدا هەڵگوتنی دی، وا تێگەیشتم گەرەکەکەیان دەبێت قەشەنگ بێت. کیژۆڵەیەکی هەڵسوکەوت جوان و بە قسە بوو و من هەستم بە تێپەڕینی زەمان نەکرد تا کاتێك دەلاقەکە بۆوە و شووشەیەکی سووری لێ دەرپەڕی.

پیاوە مۆنەکە گوتی: "دولی" و دیسانەوە دەرگای داخست.

کیژەکە گوتی: ئی منە. ئی تۆ بەم زوانە ئامادە نابێت. من لەلات دەبم.

بەلە خۆبایی بوونەوە گوتم: من پینی یەکم پێیە.

چاوەڕوانم بوو تا کاتێك شووشەکەی منیش دەرپەڕی. ئەمجار هەتا ئەو پلیکانانەی دوایی بە،کە بەرەو کارگەی بیرەسازی دەهات، لەگەڵمدا هات. لەسەر ڕێگەکە بایی پینییەك شوکلاتم کڕی، لەسەر پلیکانەی دەرمانگە دانیشتین و خواردمان. جێگەیەکی خۆشبوو. منارەی کلیسای "شاندۆن" کە سێبەرەکەی لەپشت سەرمانبوو بەداری سەوزەوە کە بەسەر دیوارەکاندا شۆڕبووبوونەوە و هەتا کاتێك تیشکی زێڕینی دوبارە نیشان خۆیدەدا، نسی پێکەوە نووساوەکانی مانگی دەخستە سەر جادەکە.

کچەکە گوتی: قومێکم لە دەرمانەکەت بدەیە لێی بچێژم، کوڕی باش.

پرسیم: بۆ؟ لە ئی خۆت ناتوانی بچێژی؟

گوتی: ئی خۆم تامی زۆرناخۆشە. ئەم شەربەتە تامێکی ترسناکی هەیە. ئەگەر پێت خۆشە دەتوانی تاقی بکەیتەوە.

لێمخوارد و بێ راوەستان رۆمکردەوە. راستیدەکرد، ترسناکبوو پاشان ئیتر ناچار بووم بیڵێم ئەویش لە دەرمانەکەی من بچێژێ. لە دوای خواردنی قومێکی دەرمانەکە قوشقی بوو گوتی: زۆر باشە. بە زۆری هەموو شەربەتەکانی سینگ تامیان خۆشە. ئەتۆش تاقیبکەوە، ناتەوێت؟

منیش خواردم و دیتم دیسان هەق بەوییە، شیرنایەکی خۆشی هەبوو. کیژە قوشقی بوو و گوتی: قومێکی دیکەم بدەیە بیخۆم و شووشەکەی لە دەستی فڕاندم. گوتم: تەواو دەبێت.

بە پێکەنینەوە جوابیدایەوە: نە بابە، تەواونابێت، دەریایەکی تێدایە.

نازانم بۆ نەمتوانی داواکەی رەدبکەمەوە. لە حاڵی سروشتی خۆم کێشرابوومە دونیای نەناسراوێکی منارەکان، قەڵا، دار، پلیکانە و کۆڵانە سێبەراوییەکان. قومێکم بۆ خۆم خواردەوە و قومێکم دا بەو. لە پاشان ترسم لێنیشت. گوتم خەریکە تەواو دەبێت، ئێستا چ قوڕێکی بەسەرمداکەم؟ جوابیدایەوە: تەواوی بکە و بڵێ سەرەکەییم لێکەوت و دیسانەوە قسەکەی دووپات کردەوە.

تا ڕادەیەك قسەکانی لام مەنتقی بوو. ئەوەی دەشووشەکەدا بوو پێکەوە تەواومان کرد ئەو کات هەر بەم چەشنەی سەیری شووشە بە تاڵەکەی دەستم دەکرد، شووشەیەکی ئاوا بەتاڵ کە دەگەڵ خۆمم هێنابووم، هاتەوە بیرم، ئەو بەڵێنەی کە دابووم مریەمی پیرۆز بە جێم نەگەیاندبوو پینی

یەکەیم دابوو بە شوکلات. بۆیە بێ هیوابییەکی ترسناك سەرتاپای داگرتم. هەموو شتێکم فیدای کچەکە کردبوو ئەو تەنانەت سەرنجیشی نەدەدامێ. لە هەمووی ئەو ماوەیەدا تەنیا شووشە دەرمانەکەی من بوو، کە چاوی تێبڕیبوو. بەڵام من زۆر درەنگ بە فێڵەکەییم زانی و هەر بۆیە سەرم دەنێو دەستانم گرت و گریام.

گوتم: دایکم نەخۆشە، ئێمە شەربەتەکەمان تەواوکرد.

بە سوکایەتی پێکردنەوە گوتی: مناڵۆکەی نازدار بێ دارەی و بارەیی نەکە. هەر ئەوەندە بەسە بڵێی سەری شووشەکەت لێ کەوتووە. باشە! لەوانەیە ئەوە بۆ هەموو کەسێك رووبدات.

هاوارم کرد: من مۆمێکم نەزری حەزرەتی مریەم کردبوو، بەڵام پارەکەییم خەرجکرد: لەپڕ شووشە بەتاڵەکەم فڕاندو بە گریانەوە بەرەو سەرەو ژووری جادەکەوە رێکەوتم ئێستا تەنیا یەك رێگە چارە و یەك هیوام بۆ مابۆوە. تەنیا موعجیزەیەك.

چوومە دێرکەوە لە بەرامبەر هەیکەلی حەزرەتی مریەمدا چۆکم دادا. داواملێکرد لەبەر ئەوەی پارەکەییم خەرجکردووە، بمبەخشێت و بەڵێنم پێدا ئەگەر موعجیزەیەك بکات و پێش ئەوەی بگەمەوە ماڵ دایکم چاك بکاتەوە، بەو پارەیەی دەگاتە دەستم مۆمێکی بۆرۆشن دەکەم.

پاشان بە هەورازی جادەکەدا بەرەو ماڵ رێکەوتم. بەڵام ئیتر شوێنەوارێك لە ڕووناکی هەتاو نەمابوو و پانتایی تەپۆلکەی وێردبێژ بووبوو، دونیایەکی نامۆ و دڵ ڕەق، وێڕای ئەوەش حاڵم زۆر خراپ بوو. وامدەزانی خەریکە دەمرم کە لە ئاست خۆیدا زۆر خەراپ نەبوو. کە گەیشتمەوە ماڵ لە بێدەنگی مەتبەخەکە و ئاگری خامۆشی سۆبەکە ئەم بیرە ترسناکەم بە مێشکدا هات کە حەزرەتی مریەم قسەکەی لە عەرزیداوم و موعجیزە نەبووە و دایکم هەردەنێو جێگادابوو. لە پڕ دەستم بە هاوارکردن کرد.

دایکم بە ترسەوە لە تاقی سەرێ پرسی: چی بووە کوڕم؟

هاوارم کرد: دەرمانەکەم گومکرد بە پلیکانەکاندا هەڵاتمە سەرێ و خۆم هاویشتە سەر قەرەوێڵەکەو دەمووچاوم لەبن پێخەفەکە شاردەوە.

دایکم بە سێبوورییەوە گوتی: ئاخ "ویشا" هەموو دەردەکەت ئەمەیە و پاشان دەستی بەسەریدا هێنام و گوتی: چیتە؟ لەشت زۆر گەرمە.

بە گریانەوە هاوارم کرد: من دەرمانەکەم خوارد.

بە میهرەبانییەوە گوتی: ئاخ، چەندە خەراپە، بەستەزمان کورەکەم، خەتای من بوو کە هێشتم ئەم هەموو رێگەیە بە تەنیا بچی و بە دەستی بەتاڵیش بگەرێیەوە. جلەکانت داکەنەو هەر لێرە راکشێ. هەڵسا، چاکەتەکەی دەبەرکرد و نەعلەکانی دەپێ کردن و قەیتانی پۆستاڵەکانی منی کە لەسەر لێواری تەختەکە راکشابووم، کردەوە و پۆستاڵەکانی لەپێ داکەندم و کەوتمە خەوێکی قورسەوە. هەستم بە جل پۆشینی و چوونە دەرەوەی وی نەکرد، بەڵام پاش ماوەیەك هەستم پێکرد دەستێك لەسەر نێو چاوانمە و "مینی ریان"م دیت لە پشت سەرم وێستاوە سەیری دەکردم و پێ دەکەنی.

گوتی: شتێکی گرینگ نییە و لە کاتێکی دا ملپێچەکەی دەملییەوە دەپێچا، لێی زیادکرد: ئەگەر تا بەیانی بخەوێت چاکدەبێت.

خانمی "سالیوان" بەخوا ئەوەی دەبێت لە نێو جێگادا بێت ئەتۆی.

دەمزانی خەریکە پلارم تێدەگرێت. بەڵام هیچم لە دەست نەدەهات. پاشان دایکمم دیت کە بە مۆم و رۆژنامەکەیەوە هاتە ژوورەوە و من بۆی پێی پێکەنیم. ئەویش پێکەنی. هەرچی "مینی ریان"یش رقی لێم بوو، ئی وا هەبووم رقیان لێم نەدەبۆوە بە هەرحاڵ موعجیزە روویدابوو.

## سەرچاوە

کتاب جدول

– ژمارە 81–دی، 1383 –12/2004.

# چەند كورتە شیعرێكی "حەمید موسەدیق"

**لە عەرەبییەوە: سەروەر عومەر**

## هێز و قەڵەم

"یەكەم هەنگاوی ئەم ڕێیە وەك قەڵەم بڕینی سەرە..."
سائیب

سەدان قەڵەم لە نێو كوورەی ترسێكدا توانەوە
تاببنە خەنجەرێك
لە دەستی كەسێكدا كە بە بادەی هێز مەست بوە.
لە دەستی پیاوە مەستەكەدا
خەنجەر شەقی بردو
سەری قەڵەم؟
—نا
سینەی، سەدان قەڵەم بەدەست

## بەڵام تۆ!!

لەبیرتدیٚ پێتدەوتم:
"هیچ كەس،
تەنانەت تۆ"
من باوەڕم پێكردی،
—بەڵام تۆ...؟!

## خۆ كوشتن

"بەخۆ دوژمن و تینووی خوێنی خۆمم
كە پارچە پارچەی دەستی گورگی دەروونی خۆمم"
هەرگیز كەسێك هەڵنەساوە
بەمجۆرە داخ لە دڵ،
پەرێشان بۆ كوشتنی دوژمن
بەمشێوەیەی كە من بەستوومە
—پشتوێنی خۆ كوشتن

## گۆچانی پەرجوو

مارە درۆینەكان زۆربوون لەم شارەدا
مارە درۆینەكان
لە هەر گۆشە و
كەنارێكدا
موسا لە كوێیە تا لەم ڕۆژ و ڕۆژگارەدا
گۆچانی پەرجووی خۆی ئاشكراكا

## بێهوودەیی

ئاخ، تا لوتكە هیچ ڕێگایەك نییە
دەیانوت، لە دوای ئەم لوتكەیەوە،

لە پشتی ئەم کێوەوە، ژیان بەردەوامە
لوتکە گیرا
داخ، بەڵێ
دیسان لوتکەگەلی دیکە
دیسان هەوراز و نشێوی تر

## حەرەکەت و بەرەکەت

وەختێك ڕووبارەکە
بەخەرمانەی حەرەکەتدا دەڕۆیشت
لێوان لێو بەرەکەتی
تا گوندی غەمزەدە دەهێنا

## هێشتاکەش

بیردەکەمەوە،
نەك هەر شەو
بەڕۆژیش باوەڕ ناکەن
باوەڕ ناکەیت تۆ
کە تەنانەت ئێستاکەیش

## تاهەتایە

کاتێك لە جودایی دەگەڕێیتەوە
تەقەتەقی هەنگاوەکانی تۆ
لەسەر بەرد چ ئاوازێکی خۆشە،
خۆزگە ئەم هاتنەت
-تاهەتایە دەڕۆیشت

## داڵە بیابانییەکان

"ئەم هۆزە لە کوژراویش دەسێنن غەرامە"
حافز

دیسانەوە بێگومان
هەڵفڕینی داڵەکان
بۆ لوتکەی ئاسمان
ئاخۆ:
تەرمی چ ئازیزێکیان
لەم بیابانە گەرمەدا فڕێداوە
جەللادەکان

## تێپەڕین لە جیهان

با-م بینی
ئەو گوڵە جوانەی پەڕ پەڕ کرد
-کە لەوپەڕی شکۆفەدا
نازی بەسەر مێرگو چیمەندا دەکرد و
جاویدانە
بەو هەموو جوانییەوە -
باوەڕی بە بوون دەهێنا

## هاو دڵی

لەگەڵ مندا کاتێك بۆ قسەکردن
لێوەکانی تۆ دەجووڵان
لە خۆشیدا، ڕۆح و جەستەم دەکەوتنە سەمایە
هەر چەند لەگەڵ تۆدا
پێ بەپێ دەڕۆیشتم
خۆزگە دڵیشت لەگەڵ دڵما بهاتایە!

## سەروای دواین شیعر

"بەڕاست شیعرەکانم دەخوێنیتەوە؟"
ژیان سەروای شیعری منە
شیعری من وەسفی دلآرایی تۆیە
ڕەنگە هەر لە ئەزەلەوە
ئەمە چارەنووسی من بووبێت
شیعر دەڵێم بەو ئومێدەی کە تۆ بیانخوێنیتەوە،
-ئەگەرنا

دواین بەیتی من
-سەرواکەی "مردن" دەبێت.

تەواوی کێڵگەکە
لێوانە لە گوڵەگەنم
هیچ دەستی ئومێدێک
جەخار
سونبولەکان دروێنە ناکات
دروێنەکاران، هەمووان
بەر لە درەو
دروێنەکراون
* * *

هەڵۆی ستەم باڵی بەسەر تەواوی شاردا کێشاوە
کەوانێکی گۆشە نشین و تیری ئاهێك لە ئارادا نییە
* * *

چۆن دیسان غەرقی ماتەم بووماڵی ئێمە
هەزار نەفرەت
لەو دەستە چەپەڵانەی
کە بەردی دوو بەرەکی هەڵدایە نێوانی ئێمە
* * *

تۆ پێم پێکەنیت و
نەتزانی من
بەچ دڵەڕاوکێیەکەوە لە باغچەی دراوسێکەمان
سێوەکەم دزی

باغەوان توند بە دوای مندا ڕایکرد
سێوەکەی بەدەستی تۆوەدی
بە ڕقەوە تەماشای منی کرد
سێوی گازلێگیراو لە دەستی تۆدا کەوتە سەر زەوی
و
تۆ ڕۆیشتی و هێشتا،
ساڵانێکە لە گوێی مندا ئارام،
ئارام
خشە خشی هەنگاوەکانی تۆ،
دووبارە دەبێتەوە و ئازارم دەدات

من حەپەساوانە
غەرقی ئەم خەیاڵەم
-کە بۆچی
-ماڵە بچووکەکەی ئێمە
درەختی سێوی تیانەبوو

## سەرچاوە

دیوانەکانی "شێری سوور"، "دوو قەسیدە" و "لە جودایییەکان".

# پشتی فەڕشی تورکی[1]

لە فارسیەوە: ڕەزا مەنوچەری

## سەبارەت بە وەرگێڕان

(ئەوەی دەیخوێننەوە دیداری گۆڤاری ئوستورالی (هیمس فیر)[2]ە. (بە واتای نیوەی گەردون) کە لەگەڵ چوار وەرگێڕ و نوسەری پلەیەکی وڵاتی چیندا ئەنجامدراوە).

**همیس فیر:** لەو بڕوایەدام قبوڵتان بێت کە یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی وەرگێڕان گواستنەوەی چەمکەکانە لەگەڵ باکگراوندی گونجاودا، ئەویش بەجۆرێك کە خوێنەر بتوانێت بە باشی و بە تەواوەتی لە گرنگی ئەو چەمکانە بگات. بەڕێز یانگ بە بڕوای ئێوە وەرگێڕانی بەرهەمە کلاسیکیەکانی چین بۆ سەر زمانی ئینگلیزی کارێکی دژوارە؟

**بەڕێز یانگ**[3]: کارێکی ئەوەندە ئاسانیش نییە. لەلایەك خەریکی وەرگێڕانی بەرهەمێکە کە دەبێت ئەوەی لە تواناتا هەیە بیخەیتە گەڕ و چەمکێك بگوازێتەوە بۆ زمانێکی دیکە، بەڵام دەبێت هاوتایەك بدۆزیتەوە کە زۆر نزیك و وردبێت، تاکو ئەو شوێنەی دەکرێت لە چەمکی یەکەم نزیك بێت و لێی دورنەبێت.

**هیمس فیر:** سەرنجڕاکێشانی ئینگلیزی زمانەکان بۆ بەرهەمە کلاسیکیەکانی خۆیان کە تەمەنیان چەند ساڵێك دەبێت کارێکی دژوارە. بێگومان وەرگێڕانی شوێن و فەزا و کاتەکان و دیمەنی ئەدەبیاتی کلاسیکی چین بەشێوەیەك کە قبوڵ و هەرس بکرێت لە ئاست خۆیدا دژوارترە، وەك ئەو کارەی کە تۆ و خاتوو (یانگ) کردوتانە، مەبەستم وەرگێڕانی ڕۆمانی کلاسیکی (خەونی حوجرەی سورە) کە لە نوسینەکانی (کائۆ زوئەکواین)[5]ە و لە سەدەی سیانزەیەمی چیندا نوسراوە.

**بەڕێز یانگ:** بە بڕوای من قۆناغی ئەدەبی و مێژویی گرفتێکی ئەوتۆ بۆ کاری وەرگێڕان دروست ناکات و جیاوازیەکی ئەوتۆ دروست ناکات. هەڵبەت ئەگەر خەریکی وەرگێڕانی بەرهەمێکی کە بۆ چەند سەد ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە دەبێت خۆت لە باتی خەڵکانی ئەو سەردەمە دابنێیت و هەوڵ بدەیت لە شێوازی بیرکردنەوەکانیان تێبگەیت و کاتێك دەتەوێت وەریبگێڕیتە سەر زمانی ئینگلیزی دەبێت خۆت

لەباتی خوێنەری ئینگلیزی زمان دابنێیت و ئەوەندە هەوڵت دابێت کە خوێنەر لە چەمك و دیالۆگەکانی زمانی یەکەم تێبگات.

**خاتوو یانگ:** ئەوەی کە لە وەرگێڕاندا بۆ من دژوارە، وەرگێڕانی دەستەواژەی چوار پیتی کلاسیکی چینییە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی. ڕەهەندی مانا لەو دەستەواژانەدا بەشێوەیەکی دەوڵەمەند و بەرفراوانە و هەندێکجار ئاماژە دراوە بە گوتەزا کلاسیکیەکان، لە کاتی وەرگێڕان و دەربڕینی بۆ سەر زمانی ئینگلیزی لەوانەیە ناچار بیت لەیەك یان تەنانەت هەندێکجار لە دوو ڕستە سود وەربگریت، وێڕای ئەوەش ناتوانیت توانای بەسەردابڕین و کاریگەریی چەمکی سەرەکی (یەکەم) دەربڕیت.

**هەمیس فیر:** مەبەستتان لە کاریگەری چ جۆرە کاریگەرییەکە؟ مەبەستتان ئەوەیە کە هەر یەك لەو ڕستە چوار پیتانە کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە؟

**خاتوو یانگ:** ئەگەر ئەوە هەیە ئەو دەستەواژەیە بگەڕێتەوە بۆ ڕووداو و کارەساتێکی مێژوویی یان بەرەنگدانەوەی کەسایەتیەك لە ئەدەبیاتی چیندا ئاماژە کرابێت کە باس لە ڕووداوێك یان پەیوەندی کەسایەتیەکان بکات.. چۆن دەکرێت ئەو چەمك و دەستەواژانە بگوێزرێنەوە بۆ خوێنەرێکی ئینگلیزی زمانی؟ ڕێگا چارەیەك ئەوەیە کە هەندێك پەراوێزی لێ زیاد بکەیت، یان ئەوەی کە خودی دێڕەکە شیبکەیتەوە فراوانی بکەیت، ئەوەش لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کە بە قەبارەیەکی زۆر دەقە ئینگلیزیەکەی زۆر زیاتر بێت لە قەبارەی دەقە چینیەکەی و لەگەڵ ئەوەشدا بە هەموو لێ زیادکردنانەوە توانایی بەسەردا بڕینی لە دەقی یەکەم کەمتر دەبێت.

**هەمیس فیر:** سەبارەت بە زمانی ژاپۆنیش ئەو کێشە و گرفتانە بوونیان هەیە، دەستەواژەی (ساموڕایی) و "دەوڵەمەندەکانی گوند"[6] لە رووی واتاوە دومانای جیاواز بەسەر زەینی ژاپۆنی و ئینگلیزیەکاندا دەردەبڕێت، مەبەستتان شتێکی لەمجۆرەیە؟

**خاتو یانگ:** بەو ڕادەیە جیاوازیەکان زۆرن کە بیانیەکان تێناگەن. دەبێت سود لە تەکنیك و شێوازی جۆراوجۆر وەربگریت، یەکێك ئەوە کە هەندێك وشە بە دەقی وەرگێڕدراو زیاد بکەیت کە لە دەقی یەکەمدا بوونیان نییە، دووەم پەراوێز بنوسیت یان ئەوەی کە بە تەواوەتی تایبەتمەندیەکانی دەقی یەکەم بسڕیتەوە و هەوڵ بدەیت سەرلەنوێ کەشی ئەو بارودۆخە تایبەتە لە زمانە وەرگێڕدراوەکەدا دابڕێژیتەوە.

**هەمیس فیر:** لە کاتی وەرگێڕاندا تا چ ڕادەیەك بەدەست کراوەیەوە کاری وەرگێڕان دەکەیت؟

**خاتوو یانگ:** لەو بڕوایەدام تاکو ڕادەیەکی زۆر کەم خۆم دەست ئاوەڵا دەکەم. بە گشتی ئێمەی وەرگێڕ زۆر حەز لە (دیڤید هاکز) دەکەین و شێوازەکەیمان پێخۆشە. توانای داهێنانی زۆر لە ئێمە زۆرترە. کەم و زۆر ئێمە وشە بە وشە وەرگێڕان دەکەین و خوێنەر زۆرشتی لەکیس دەچێت، چونکە دەمانەوێت کاری وەرگێڕانەکەمان زۆر بە وردی بێت.

**هەمیس فیر:** دەتەوێت بڵێیت، دەبێت وەرگێڕ سەرلەنوێ دەقەکە بنوسێتەوە؟

**خاتوو یانگ:** داهێنانە تر. بە بڕوای من دەبێت وەرگێڕ بە کردەوە هەر ئەو کارە بکات، بەڵام ئێمە ئەوەندە لە ژێر کاریگەریی و هەلومەرجی کەشی وەرگێڕاندایین و ئەوەندە مەرجمان بۆ خۆمان داناوە و فێربووین کە بە زۆری وشە بە وشە و وشك

وەرگێڕان بکەین، هێشتا شێوازە کۆنەکانی وەرگێڕانی کەسانی پێشوو سنورمان بۆ دادەنێن و دەست و باڵیان تەوق کردووین.

**بەڕێز یانگ:** من لەو بڕوایەدا نیم کە دەبێت لە وەرگێڕاندا ڕاڤە بۆ دەقەکە بکرێت. دەبێت وەرگێڕ تاکو ئەو شوێنەی لە توانایدایە خۆی نزیك بکاتەوە لە دەق و دەستەواژە و زاراوەکانی دەقی یەکەم و خۆی لە زێدەڕۆیی بپارێزێت و شتێك بە دەقی یەکەم زیاد نەکات، ئەگەر وشە و دەستەواژەی هاوتابوونی نەبوو ئەوە دیارە کە شتێك (دەستەواژە، چەمکێك) لەناو دەچێت، بەڵام ئەو مافەمان نییە لە کاری داهێناندا زێدەڕۆیی بکەین، چونکە لەو کاتەدا کارەکەمان دەبێتە سەرلەنوێ نوسینەوە نەك وەرگێڕان.

**همیس فێر:** واتە بەو جۆرە بیردەکەیتەوە ئەگەر وشە و زاراوەی زۆر بنێیت بەدەم کەسایەتی ڕۆمانەکەوە و لێی زیاد بکەیت یان وەسفکردنەکان زۆر بەملاولادا بکێشیت خیانەت بە دەقی یەکەم دەکەیت؟

**بەڕێز یانگ:** بەڵێ بە تەواوەتی وایە و ئیدی ناکرێت بەو وەرگێڕانە بڵێیت وەرگێڕان. دەبێت وەفاداربیت بە دەقی یەکەمەوە.

**خاتوو یانگ:** لە زمانی چینی نوێدا گەلێك زاراوەو دەستەواژەی زۆر بوونیان هەیە کە بە شێوەیەکی کورتکراوە دەگوترێن و دەنوسرێن، شتێك کە لێکچووی پەروەردەکردنی بەپەلە نوسین و خێرا نوسین بێت. چینیەکان پێیانخۆشە بابەتەکانیان بە ژمارە پێناسە بکەن و شەیدای ئەو کارەن، بۆ نمونە وەك بزوتنەوەی سێ دژ (بزوتنەوەی دژایەتیکردنی سیانە)[7] ئەگەر چینیەکان ئەو دەستەواژەیە ببیستن یەکڕاست تێدەگەن کە مەبەستی ئەو کەسەیە کە ئەو دەستەواژەیە دەڵێت دژایەتیکردنە بە دژی گەندەڵی، دژایەتیکردنە بە دژی واستە و واستەکاری، دژایەتیکردنە بە دژی تەکەتولات و گروپ چییەتی. بۆ بابەتی لەمجۆرە دەتوانین پەراوێز بەکار بێنیت، بەڵام ئەو شێوەیە هێز و کاریگەری دەقی یەکەم کەم دەکاتەوە، چونکە کاتێك بە چینی دەڵێن "خەباتی دژ" یان "ئەو چیا سیانیانە کە قورساییان کەوتۆتە ئەستۆی گەلی چین" شێوازی دەربڕینە کە زۆر ڕوون و خێرایە. دەبێت لە وەرگێڕاندا بۆ سەر زمانی ئینگلیزی ئەو زاراوە و دەستەواژانە بە فراوانی شیبکرێنەوە.

**بەڕێز یانگ:** بە بڕوای من کێشەکە لێرەدا نییە، ئەوە پەیوەندی بە بابەتی فۆرمەوە هەیە. ناتوانین بە شێوەیەکی ورد زمانێك (زمانی یەکەم) وەربگێڕینە سەر زمانێکی دیکە. ناکرێت چوار وشە بە چوار وشە وەربگێڕدرێت یان پێنج وشە بە پێنج وشە. سەرەڕای کێشەیەکی تایبەت لە ئەدەبیاتدا هەیە کە ئەویش لایەنی مانایی هەندێك لە ئیماژەکانەو ناکرێت ئەو ئیماژانە بگوێزرێتەوە بۆ کەسانێکی دیکە کە سەر بە کولتورێکی دیکەن. دار بیێ بە نمونە دێنمەوە، لە شیعری چینیدا داربی کۆمەڵێك واتا و ڕەنگدانەوەی هەیە کە چینیەکان بۆ خۆیان لێی تێدەگەن و ئەو واتا و کاردانەوانە بە زەینیاندا دێت، چونکە لە زمانێکی دیکەدا بەو جۆرە نییە ناتوانیت چاوەڕوان بیت کە خۆی لە خۆڕا و بە ئاسانی لە زمانێکی دیکەدا هەڵگری ئەو واتایە بێت.

**همیس فێر:** هەر لەم بارەیەوە ڕاتان دەربارەی "ئارتورڤیلی" وەرگێڕیی بابەتە کلاسیکیەکانی چین چییە؟

**بەڕێز یانگ:** وەرگێڕانی ئەو بۆ کتێبی هەڵبەستەکان زۆر پسپۆڕانەیە، وەرگێڕانێکی زۆر

باشە، بەڵام بە بڕوای من لاوازیەکی تێدایە، ئەویش ئەو وێنایەیە کە لە جوتیارانی چاخی (چۆ)[8] کردویەتی. وێنای ئەو جوتیارە چینیانە وێنای ئەو کەسانەیە کە لە قۆناغە خۆشەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپادا دەژیان.

**خاتوو یانگ:** لە وەرگێڕاندا وشەی (قەلاّ)ی بەکارهێناوە، ئەوە لە کاتێکدایە کە چینیەکان قەت (قەلاّیان) نەبووە.

**بەڕێز یانگ:** هەروەها دەستەواژەی (شۆڤالیە)ی بەکارهێناوە، شیعرەکانی ئەو کۆمەڵە شیعرە بە زۆری هاوشێوەی "بالاد"[9]ەکانی سەدەی ناوەڕاستی ئینگلتەرایە تاکو شیعری چینی.

**خاتوو یانگ:** بەڵام شیعرەکان زۆر جوان دەرچوون.

**بەڕێز یانگ:** بەڵێ زۆر جوانن.

**همیس فیر:** بەگشتی لە رووی شیعریەوە باشن، بەڵام نەك وەك خستنە ڕووی زەینیەتی چینیەکان؟ وەرگێڕان لە ئەڵمانیەوە بۆ ئینگلیزی یان لە لاتینیەوە بۆ ئینگلیزی یان ئەو زمانانەی کە بە گشتی ریشەیەکی هاوبەش و واتا و کاردانەوەی هاوبەشیان هەیە تاکو رادەیەك ئاسانن، بەڵام وەرگێڕان لە چینیەوە یان ژاپۆنی و کۆریای بۆ سەر زمانێکی ئەوروپی کە لە رووی زمانناسیەوە زۆر لەیەك دورن گوتەزایەکی دیکەیە، هەر لەم رووەوە لەو بڕوایەدا نین کە ئەو شتانەی دەیدەنە پاڵ (ڤیلی) شایانی پاساو بۆهێنانەوەیە؟

**خاتوو یانگ:** هەر چۆنێك بێت کاتێك من لە دەقێکی پەیوەندیدار بە زمانی چینیەوە "قەلاّ" دەبینم زۆر ئازار دەچێژم.

**همیس فیر:** پرۆفیسۆر (وانگ[10]) تۆیش ئازار دەچێژیت؟

**پرۆفیسۆر وانگ:** ئەگەر راستت دەوێت، ڕێك بە تەواوەتی نازانم سەبارەت بەم قەلاّیە چ هەستێکم هەیە، بەڵام دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو بابەتەی سەبارەت بە واتای چەمکە جیاوازەکان لە زمانەکاندا کە باستان کرد. من وەك خۆم بڕوام بە تیوریەکەی چۆمسکی هەیە دەربارەی رێزمانی گشتی [11] (گرامری گشتی) کە پێشڕەو و پێشەنگە بۆ دارشتنی بناغەی زمانێکی گشتی. بە بڕوای من ئەگەر لە توانادا نەبێت هەموو چەمکەکان وەربگێردرێن بەڵام بەلانیکەمەوە لە توانادا هەیە زۆربەی چەمکەکان وەربگێردرێن. ئەو شتەی کە وەرگێڕانی ئاسان نییە فەزایان کاریگەری بەهەمەکەیە بە تایبەتی ئەو خاڵە دەربارەی وەرگێڕانی شیعر دروستە. ئەگەر بە هەڵەدا نەچم وابزانم یەکێك لە شاعیرە ئەمریکیەکانە کە ناوی (رابرت فراست)ە و دەڵێت: ئەوەی لە وەرگێڕانی شیعردا دەدۆڕێت خودی شیعرە، ئەو رستەیەی (رابرت فراست) بەو واتایە دێت کە لە راستیدا شیعر وەرناگێردرێت، بەڵام وەك "گۆتە" دەڵێت لە شوێنێکدا لە نێوان ئەو روانگەیەدا کە وەرگێڕانی شیعر بە ئاستەم دەزانێت و لە شوێنێکی دیکەدا کە پێویستیەکی رەها بە وەرگێڕانی شیعر دەبینرێت ناکۆکیەك لە ئارادایە. راستیەکەی ئەوەیە هەمیشە زۆر کەس بوون کە بەدوی وەرگێڕانی شیعرەوەن. من بۆ خۆم چێژێکی زۆر لە وەرگێڕانی شیعر وەردەگرم (بە زۆری خۆم لە وەرگێڕانی دەق (پەخشان) دەپارێزم. رۆمان لە رادەبەدەر درێژە، کورتە چیرۆك کاتێکی زۆری دەوێت. ئەو چێژەی لە وەرگێڕانی شیعر وەریدەگرم لە وەرگێڕانی پەخشاندا بە دەستی ناهێنم).

**خاتوو یانگ:** لە کوێی ئەو شاعیرە خۆرئاواییانەی کە شیعرەکانیانت وەرگێڕاوە لە کام یەك لەو

کارانەی کە وەرتگێڕاون زێدەتر لە هەموویان هەست بە ڕەزامەندی دەکەیت؟

**پرۆفیسۆر وانگ:** زێدەتر لە هەمووان لە وەرگێڕانی شیعرە درێژەکانی (ڕابرت برۆنز) هەست بە ڕەزامەندی دەکەم، بەڵام لە کورتە شیعرەکانی نا. وەرگێڕانی ئەو کورتە شیعرانە چاك دەرنەچوون، مەبەستم لەو شیعرانەیە: بۆ نموونە عەشقی من وەك گوڵێکی سوورییە، گوڵێکی سوری کە زمانەکەی زۆر زیندوو ساکارە، گێڕانەوەی من لەو شیعرانە بۆ سەر زمانی چینی ئەوەندەش باش نییە.

**خاتوو یانگ:** زۆرتر حەزتان لە چیرۆکە شیعرە؟

**پرۆفیسۆر وانگ:** لەو بڕوایەدام کە من یەکەم کەس بم کە شیعرە درێژەکانی برۆنز، شیعرگەلێکی وەك (تۆم ئۆشانتر) یان (سواڵکەرە سەرخۆشەکان)م وەرگێڕابێتە سەر زمانی چینی. من زۆر حەزم لەو جۆرە شیعرانەیە، هەروەها بەرهەمی دیکەی وەك تێزی شاعیرانەی (پاڕانەوەی ڤیلی پیرۆز)م وەرگێڕاوە و بە بڕوای من یەکێك لە باشترین شیعرە تەنزەکانی جیهانە.

**هیمس فیر:** بێگومان ئەو ناوەرۆکە جیهانی و گشتگیرە، چونکە چەندەها ڤیلی لەم سەرو ئەوسەری جیهانی و لە خوا دەپاڕێنەوە کە داوا دەکەن پێشتر بن لە خەڵکانی دیکە.

**پرۆفیسۆر وانگ:** ڕاستە جیهانی و گشتگیرە، هەر بۆیە بە دژی تیۆریەکەی تۆم کە سەبارەت بە جیاوازی لە نێوان چەمکەکاندایە، لەوێڕا کە گوتت چەمکەکان لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا لە یەکدیکە جیاوازن. دەمەوێت بڵێم کەم و زۆر هەموومان بیرکردنەوەمان لەیەك هێڵدایە، چونکە گەر بەم جۆرە نەبێت ناتوانین قەت پەیوەندی لە نێوان یەکدیکەدا دروست بکەین. بەڵام کاتێك باس لە جیاوازی ورد و ناسکی دەستەواژەیەك دێتە مەیدان یان سەبارەت بەو کاردانەوەو ڕەنگدانەوەیە کە بە بیستن یان خوێندنەوەی هەندێك دەستەواژەی تایبەت بە زەینمان دەگات، ئەوە گومانی تێدا نییە کە هەندێك تایبەتمەندی لە دەست دەچن. لەم بوارەدا هاوڕای (ڕابرت فراست)م کە دەڵێت: بە دڵنیاییەوە لە وەرگێڕانی شیعردا هەندێك تایبەتمەندی لەدەست دەڕۆن. ئێستا (زیبیانی ئەی یانگ) داربی بە نمونە هێنایەوە، بەڕاستی ئەو وەرگێڕانە دژوارە. کاتێك لە جەنگی جیهانی دووەمدا کەسێك کە لەگەڵ هاوپەیمانانندا بووە وشەی (دونکرك)ی بەکاربهێنابا یەکڕاست وێنایەکی تەواوی لە زەیندا دروست دەکرد، بەڵام بۆ نمونە بە چینیەکان بڵێیت "باشوری ڕووباری یانگ تسە" (لە چینیدا تەنها دوو وشەیە، چیانگ نان – چیانگ بە واتای ڕووبار و نان بە واتای باشورە). یەکڕاست کەسی بەرانبەر هەموو جوانیەکانی ئەو ناوچەیەی یاد دەکەوێتەوە، جوانترین ڕەزو باخات و جوانترین ژنی چینی لە ناوچەی چیانگ نانەدا دەبینێت. دەستەواژەی "باکوری دیواری مەزن" وێنایەکی تایبەت لە زەینی چینیەکاندا دروست دەکات: وێنای تاریکی و بەفر یان ڕەوەی خەڵکانی هۆڤ (وەحشی)، هەڵبەت ئەو وێنایە وێنایەکی کۆن و مێژوییە، هەر لەم ڕووەوەیە کە بەبڕوای من وەرگێڕانی شتی لەم شێوەیە زۆر دژوارە. بۆ نمونە میلتۆن مامۆستای بەکارهێنانی ناوی شوێنەکانە، ئەو ناوانەی کە واتادارن و ئاوازیان هەیە و بە ئاڵووالآن. بۆ نمونە بە (بیجینگ) کە هەمان پەکینە دەڵێت: "*Paquin*"[12] پیکین. بۆ نمونە شتێکی دیکەی وەك "زانادو"[13]ی کە (کالریج) بەکاریهێناوە، ئەو جۆرە وشانە لە زەینی میلتۆندا زۆر ڕۆمانسیانەن. بە بڕوای من ئەو جۆرە شتانە

وەرگێڕانیان دژوارە. ئەگەر نا تیوریەکەی تۆ لە رووی لۆژیکیەوە لە کۆتاییدا وا دەکەوێتەوە کە بە ناچاری هەموو جۆرە وەرگێڕانێك بە تەواوی بدەینە دواوە.

**هەمیس فێر:** من لەو بڕوایەدا نییم کە بیداتە دواوە، بە بڕوای من دەبێت هەندێك پەراوێز و شیکردنەوە بۆ ئەو جۆرە وەرگێڕانانە زیاد بکرێت، واتە هەر هەمان شێواز کە خاتوو یانگ پێشنیازی دەکات، بەڵام پرۆفیسۆر، بە بڕوای من تۆ سەبارەت بە وەرگێڕانی شیعرەکانی (برۆنز) زۆرف کە ڕایی دەکەیت و کارەکەت زۆر بە بچوك دەزانیت، ئەویش لە کاتێکدایە کە تۆ دەربارەی یەکێك لە هەڵکەوتوترین کەسایەتیەکانی ئەدەبیاتی کلاسیکی ئینگلتەرا لە سەردەمی (ئیلیزابت)دا تێزیکت نوسیووە، مەبەستم ئەو کتێبەیە کە دەربارەی (جان ڤبستێر) نوسیوتە، وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ڤبستێر بۆ سەر زمانی چینی دژوارە؟

**پرۆفیسۆر وانگ:** وەرگێڕانی نمایش نامەکانی لەرادەبەدەر دژوارن، هەڵبەت وەرگێڕانی هەندێك لە شیعرەکانی دژوارترن، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە شیعری وردزورس دەچن زمانی ئەو شیعرانە زۆر زۆر ساکارن، جوان و فرە مۆسیقان. گواستنەوەی ئەو توخمانە بۆ سەر زمانی چینی بۆ من زۆر دژوارە و هەمیشەیش دژوار بووە. کێشەی من لە وەرگێڕانی دەستەواژەی زۆر قورسدا نییە، لە زۆربەی بابەتەکاندا کێشەی وەرگێڕان لە ئارادا نییە. لە ئاکامدا هەر گرفتێك، هەر کێشەیەك ڕێگاچارەیەکی هەیە. کێشەی راستەقینە لەوێدایە کە بۆ نمونە بتەوێت چیرۆکێکی رەشۆکی (ئاسایی) کە لە زمانی یەکەمدا زۆر ساکارە وەربگێڕیتە سەر زمانی چیرۆکە رەشۆکێیەکانی چین.

**هەمیس فێر:** هۆکاری ئەو کێشەیە ئەوە نییە کە چیرۆکە رەشۆکییەکان ریشەیەکی قوڵیان لە میتۆلۆژیا و بڕوا کۆنەکانی وڵاتانی خۆیاندا هەیە؟ وەك هەمان کێشە کە لە وەرگێڕانی (ئالیس لە وڵاتی سەرسوڕماندا) بۆ سەر زمانی (پیت جان تجات جارا) هاتۆتە ئاراوە، ئەو زمانە زمانی خەڵکە خۆجێیەکانی ئۆستورالیایە؟

**پرۆفیسۆر وانگ:** ئێمە لە چیندا وەرگێڕانێکی زۆر باشمان هەیە لە (ئالیس لە وڵاتی سەرسوڕماندا). وەرگێڕەکەی یەکێکە لە زمانناسە هەڵکەوتووەکانی چین واتە (ژائۆیوئان ڕێن) کە ئێستا لە ئەمریکا وانە دەڵێتەوە. کارێکی زۆر باشە، بەڵام بەداخەوە درێژەی پێنەداو بەشی دووەمی ئەو کتێبە واتە (لەناو ئاوێنەوە) وەرنەگێڕدرایە سەر زمانی چینی.

**خاتوو یانگ:** وەرگێڕانی شیعری منداڵان لە هەمووان دژوارترە.

**پرۆفیسۆر یانگ:** زۆر حەز دەکەم (لەناو ئاوێنەوە) وەربگێردرێتە سەر زمانی چینی، چونکە بەشی یەکەمی زۆر بە جوانی وەرگێردراوەتە سەر زمانی چینی.

**هەمیس فێر:** لەو بڕوایەدا نیت بتەوێت یان نا ئەو قسانەی ئێوە رەهەندێکی (مازو شیتی) تێدایە؟

**خاتوو یانگ:** بەڵام ئەو جۆرە پەیڤانە بە ئەنقەست نیین.

**هەمیس فێر:** بەڕێز (یوو)[15] ئێوە کێشەی لەو جۆرەتان نییە؟ بۆخۆتان نوسەرن، کێشەی تۆ تەنها ئەوەیە کە ئەو شتانەی لە زەینتاندایە ووشەی گونجاوی بۆ بدۆزیتەوە — نەك بۆ ئەو شتانەی کە لە زەینی نوسەرانی دیکەدایە؟

**بەڕێز یوو:** من کورتە چیرۆك دەنووسم و هیچ لە وەرگێڕان نازانم، هەر ئەوەندە دەزانم وەرگێڕان کارێکی زۆر دژوارە، نوسەریش بەو جۆرەی کە دێتە

بەرچاو کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە. لە نوسینی چیرۆکدا چەندەها سنور هەیە، بەڵام سنورەکانی چیرۆك نوسین بەرادەی سنورەکانی وەرگێڕان نییە. لە وەرگێڕاندا فەزا و تەکنیکەکانتان سنوردارن و دەبێت بەو فەزا و تەکنیکە سنوردارانەوە ئەوەی لە تواناتاندایە جێبەجیٚ بکەن کارەکەشتان لیٚ قبولٚ و پەسەند بکرێت، بەڵام ئەو کەسەی کە خۆی شتێك دەخولٚقێنێت (دەینوسێت) ئەو سنورانەی وەرگێڕانی نییە و دەستی ئاوەڵاترە.

**همیس فێر:** خاتوو یانگ تۆ بە بەراوردکردن لەگەڵ هاوسەرەکەتاندا بڕواتان بە ئازادی زۆرتر هەیە لە کاری وەرگێڕاندا؟

**خاتوو یانگ:** بە بڕوای من و بەشێوەیەکی گشتی نەریتی وەرگێڕان لە چیندا نەریتی وەرگێڕانی وشە بە وشە بووە، زۆریش وشە بە وشە بووە. ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زۆر جار خوێنەر تێنەگات کە باسی چیدەکەین بە تایبەتی ئەو کێشەیە بۆ بابەتە سیاسیەکان زۆر راستن.

**همیس فێر:** لەو بڕوایەدا نییت کە لە نێوان کاری وەرگێڕانی دەقی ئەدەبی و کاری رۆژنامەنوسانی بیانیدا لێکچونێك هەبێت؟ چونکە ئەوان هەوڵدەدەن وڵاتی شوێنی کارەکەیان راڤە بکەن و بە سەرنجەوە فەزای ئەو وڵاتە روون بکەنەوە کە تیایدا دەژین، وڵاتێك کە خەڵکەکەی بیروبڕوای تایبەت بە خۆیان هەیە و دەزانن بۆچی فلاٚن سیاسەتزان لە فلاٚن کاتدا ئەو لێدوانە دەدات، لە کاتێکدا کە خەڵکی نیشتمانەکەی خۆی (نیشتمانی رۆژنامەنوسەکە) تێناگەن و ئەگەری ئەوەش هەیە بۆیان بێمانابێت. رۆژنامەنوسانی بیانی هەوڵدەدەن پەیڤی ئەو سیاسەتزانانە بۆ هاوولاٚتیانی خۆیان راڤە بکەن و بڵێن "مەبەستی ئەو سیاسەتزانە ئەوە بوو کە..." راتان لەم بارەیەوە چییە؟

**خاتوو یانگ:** هۆکاری ئەوەی کە رۆژنامەنوسان ئەو کارە دەکەن و دەرەقەتی دێن ئەوەیە کە بە باشی خوێنەرەکانی خۆیان دەناسن، دەزانن بۆ هاونیشتمانیەکانیان دەنوسن، بەڵام ئێمە بۆ خەڵکانی نادیار و نەناسراو دەنوسین. بە تایبەتی ئەو دیاردەیە سەبارەت بە وەرگێڕانی چینی بۆ سەر زمانی ئینگلیزی راستە، ئێمە تەنها وەرگێڕان بۆ ئەمریکیەکان یان ئوستورالیەکان ناکەین، بەڵکو بۆ هەموو ئینگلیزی زانەکانی ئاسیا و ئەفریقاش وەرگێڕان دەکەین. لە وەرگێڕاندا خوێنەرەکان و کەسانی بەرانبەرمان ناناسین.

**بەرێز یانگ:** من تاکو ئەو رادەیە بیٚ ئومێد نییم. من وا بیر دەکەمە کە ئێوە لە زەینتتاندا روانگەیەکتان هەیە کە خەریکین لەگەڵی دەدوێین. ئەو روانگەیەی خۆتان زۆر ناچێتە ناو وەرگێڕانەکەوە. چیشمان لە توانادا هەیە دەیخەینە گەڕ تاکو بەوەفا چەمکی سەرەکی (یەکەم) بگوێزینەوە بۆ ئەو خوێنەرانەی کە جیاوازن لە خوێنەری زمانی یەکەم. هەوڵ دەدەین. تا ئەو شوێنەی دەگونجێت خوێنەرانی نویٚ بەرادەیەکی زۆر لەو چەمکە سەرەکییانە تێبگەیەنین. نابێت لە خۆتان شتی زۆر بێننە ناو وەرگێڕانەکەوە، چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەبێت ئەوا خەریکی سەرلەنویٚ نوسینەوەین نەك وەرگێڕان.

**همیس فێر:** بەرێز یوو ئێوە کورتە چیرۆك دەنوسن، ئایا لەو بڕوایەدان کە وەرگێڕان بتوانێت تایبەتمەندی و کەشی ژیانی شار یان لادێکانی چین کە لە چیرۆکەکانی تۆدان بگوازێتەوە سەر زمانێکی دیکە، ئەویش بە جۆرێك کە بۆ نموونە ئوستورالیەکان یان خەڵکانی ئینگلیزی زانی باشوری رۆژهەلاٚتی ئاسیا لەو تایبەتمەندی و فەزایە بگەن؟

**بەڕێز یوو:** بەڵێ لەو بڕوایەدام کە وەرگێڕان توانایی بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارەی هەیە.

**بەڕێز یانگ:** وێڕای ئەوەش بە بڕوای من نابێت ئەوەندە لە خەمی قۆناخ و سەردەمی داهێنانی بەرهەمەکەدا بین. بۆنمونە کتێبی هەڵبەستەکان لەبەرچاو بگرە، هەندێك لە شیعرەکانی دەگەڕێنەوە بۆ هەشت سەد ساڵ پێش زایین و بەشێوەیەکی تەواو رەنگدانەوەی هەست و خولیای ئەمڕۆی گەلی چین نییە، وێڕای ئەوەی کە ئەو شیعرانە پەیوەستن بە چاخێکی دیکەوە، بەلام حەزیان لێدەکەین، چونکە لە رووی شیعریەوە شیعری باشن.

**هەمیس فیر:** مەبەستتان ئەوەیە کە ئەو هەڵبەستانە زۆر بە گوێی خودی چینیەکانیش ئاشنانین و تەنها جیاوازییان لەگەڵ خوێنەرانی بیانیدا ئەوەیە کە بیانیەکان هەندێك زۆرتر لە چینیەکان ئەو هەڵبەستانە بە گوێیان نامۆیە؟

**بەڕێز یانگ:** تەواو دروستە.

## پەراوێزەکان

1-دەستەواژەی ".. پستی فەرشی تورکی.." لە نامە ئاشناکانی (جیمز پاڤێلی) سەدەی هەژدەیەم وەرگیراوە، هەموو دێڕەکە بە مجۆرەیە: "هەندێك لەو بڕوایەدان کە وەرگێڕان لێکچووی پشتی فەڕشی تورکییە".

*2-Hemispere, vol. 25, No.1, 1980*

3-بەڕێز یانگ *Mr. Yang Xiangi* سەرنوسەری گۆڤاری ئەدەبیاتی چینە، وەرگێڕی بەرهەمی چینییە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی، بەناوبانگترین کاری وەرگێڕانی ئەو "خەونی ژووری (حوجرەی) سورە".

4-خاتوو یانگ (گلادیس یانگ) هاوسەری بەڕێز یانگە و بەرەچەڵەك ئینگلەندییە و لە کاتی خوێندندا لە زانکۆی (کەمبریج) بەیەکدیکە ئاشنابوون، گلادیس یانگ لە بەڕێوەبەرایەتی راگەیاندنی (رۆژنامەکانی) دەرەوەی چیندا کاردەکات و بۆ خۆی وەرگێڕ و نوسەرە.

*5-Eao Xuequin*

6-*Country gentry* وەك کەسایەتی هەندێك لە بەرهەمەکانی (تامس هاردی) بۆ نمونە (پاڵەوانی دور لە کۆمەڵگایەکی تورە).

*7-Three- Anti Movement*

8-چاخی چوو لە 1122 تاکوو 256ی پێش زایین، سەردەمی دەرکەوتنی کۆنفوسیوس و تائۆ.

9-بالاد *Ballad* بەزۆری چیرۆکە شیعری ساکارن کە زۆر پوخت نین و چاوگەیەکی رەشۆکی هەیە و بۆ گۆرانی و خوێندنەوە دەستکاری دەکرێت. "بالاد سێر پاتریك ئەسپنسی" بەناوبانگترین بالادی ئینگلتەرایە.

10-پرۆفیسۆر *Wang zuoliang* مامۆستای ئەنستیتۆی زمانە بیانیەکانی چینە، هەروەها وەرگێڕ و رەخنەگری ئەدەبییە، وانگ دەرچووی زانکۆی کەمبریجە، باشترین وەرگێڕانەکانی وەرگێڕانی شیعرەکانی (رابرت برۆنز)ە ساڵی 1796-1759 بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە بەزاراوەی خەڵکی (لالانز *Lallans scots*) نوسراوە کە لە دانیشتوانی پێدەشتە نشێوەکانی سکۆتلەندن.

11-*universal grammar*، چۆمسکی زمانناسی ئەمریکی لەو بڕوایەدایە کە هەموو زمانەکانی جیهان گرامەرێکی هاوبەش و بنچینەییان هەیە.

12-ئەو وشەیەی کە پرۆفیسۆر وانگ بە نمونە دەیهێنێتەوە لە "بەهەشتی ونبووی" میلتۆنە 1608-1674 گەشتی یانزەیەم. میلتۆن لە نزیکەی پانزە دێڕدا زیاتر لەسی ناوی بەکارهێناوە، بۆ نمونە ئەکباتانا، سەمەرکەند، ئەکسۆس (جەیحوون) کامپالۆ، بیزانس و...

*13-Coleridge, Samuel Taylor (1772-1834)*

*14-Wordsworth, William (1770-1834)*

15-بەڕێز بوو ***yu Lin*** لە بەناوبانگترین نوسەری کورتە چیرۆکە لە چیندا، ئەندامی کارای یەکیەتی نوسەرانی پارێزگای (جیانگ زی)یە.

## سەرچاوە

گۆڤاری کارنامە ژمارە 44. 1383.

# ناسینی بەشەكانی ئاوێستا

لە فارسییەوە: وریا قانیع

پێشەكی دەبێت ئەوە بزانین كە هەر بیست و یەك (نەسك = جزء)ەكەی ئاوێستا لە ڕووی بابەتەكانییەوە بەسەر سێ بەشی گشتیدا دابەشدەكرێن. ئێستاش ناوی هەر بیست و یەك نسكەكە دەنوسین و لە خوارەوە لە بارەیانەوە ئەدوێین.

نسكی یەكەم: سوتكر *Sutkar* یان شودكر *sudkar*.

نسكی دووەم: ورشت مانسر *varst mansar* یان وهیشت منتر *vahistmantar*

نسكی سێهەم: بغ *bay* یان بك *bak*.

نسكی چوارەم: دامدات *damdat*.

نسكی پێنجەم: ناترە *natar*.

نسكی شەشەم: پاجك *pajag* یان پاجم یان پاگگ.

نسكی حەوتەم: رتودات ئاتیك *rato-dat-aitig* یان رتوش تائی *ratustai*

نسكی هەشتەم: بریش *baris*.

نسكی نۆهەم: كش كیسرب *Kaskisrob*.

نسكی دەهەم: ویشتاسپ سات *Vistasp-sast*.

نسكی یازدەهەم: وشتگ *Vastag* یان *Vasti* یان *dodak*.

نسكی دوازدەهەم: چیترادات *citradat* یان *jirast*.

نسكی سیازدەهەم: سپند *spend*.

نسكی چواردەهەم: بغان یشت *bayan-yast*.

نسكی پازدەهەم: نیكا توم *nikatum* یان نیارۆم *nyarum*.

نسكی شازدەهەم: گنباسرنی جت *ganaba-sar-nijat*.

نسكی حەڤدەهەم: هوسپارم *husparam*.

نسكی هەژدەهەم: سكاتوم *sakatum* یان ئاسكارام *askaram*.

نسكی نۆزدەهەم: وندیداد *vidivdat*.

نسكی بیست: هادخت *hadoxt*.

نسكی بیستویەك: ستوت یشت *stot-yast*.

نسكی یەكەم 22 (فەرگرد = فەسڵ)ە زۆربەی باس و بابەتەكانی ئەم (نسكە) لە بارەی خوا ناسییەوەیە، لە فەسڵی چوارەم لە كتێبی دینكردا دەتوانین كورتەی ئەم نسكە بخوێنینەوە. لە بابەتە

درێژو سەرنجڕاكێشی ئەم نسكەدا بابەتێك لە بارەی بەسەرهاتی گرشاسب و كەی خوسرەو و كەیكاوسەوە هەیە هەروەها لەوە دەچێت كە نامەی پەهلەوی (زەند و، هومن، یسن)، فەرگردی حەوتەمی نسكی یەكەم بوبێت.

نسكی دووهەمیش بریتیبووە لە (22 فەرگرد)، لە فەسڵی 32ی بەرگی نۆیەمی دینكردا بە كورتی ناوەرۆكی ئەم نسكە تۆماركراوە. بابەتێكە لە بارەی كاروباری پیرۆزی ئاینییەوە وەكو دووعا و نوێژ و بیری خواپەرستی.

نسكی سێهەم: لە 22 فەرگرد پێكهاتووە، ناوەرۆكی بابەتەكانی لە بارەی مەراسیم و زانستی ئاینییەوەیە، كورتەیەكی لە بەرگی نۆی دینكردا تۆماركراوە، تا ئێستا تەنها سێ فەرگردیان ماونەتەوە كە بریتین لە سێ نوێژی ناسراوی وەكو: ئەشم وەهو، یەتائەهو، وینگەهاتام، كە لەو ئاوێستایەی، ئێستا لەبەردەستدایە بریتییە لە یسنا= یەسنا هاتی وینگە 19 و 20 و 21.

نسكی چوارەم: بە دوازدە هاماست *davazdah-hamast*[1] ناسراوەو 32 فەرگردە، بابەتەكانی لە بارەی جیهانی دووهەم و هەستانەوە (قیامەت)ەوە دەدوێت.

نسكی پێنجەم: 35 فەرگردە، بابەتێكە لە بارەی ئەستێرە ناسیەوە ئەدوێت.

نسكی شەشەم: 22 فەرگردە، لە بارەی كردار و نەریتی مزدی یەسناوە دەدوێت.

نسكی حەوتەم: نسكی حەوتەمی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەكان لە پێش هێرشەكەی ئەسكەندەردا بریتیبووە لە 50 فەرگرد، لە دوای هێرشەكەی ئەسكەندەر تەنها 13 فەرگردیان ماونەتەوە، بابەتەكانی لە بارەی مەسەلە سیاسیی و سەربازی و كۆمەڵایەتیەكانەوە دەدوێت.

نسكی هەشتەم: لە پێش هاتنی ئەسكەندەردا 60 فەرگردبووە، بەڵام لە دوای ئەسكەندەر زیاد لە 12 فەرگردی نەماوەتەوە، ناوەرۆكەكانی بریتیبووە لە ماف و یاسا.

نسكی نۆهەم: بریتیبوو لە 60 فەرگرد، لە دوای هێرشەكەی ئەسكەندەر تەنها پازدە فەرگردیان ماونەتەوە، كە لە بارەی كاروباری ئاینییەوەیە.

نسكی دەیەم: لە كاتی نووسینەوەی ئاوێستای ئێستادا تەنها دە فەرگردی دۆزرایەوە كە لە بارەی یادەوەری، ویشتاسپی شای كەیانییەكانەوەیە، لە بارەی پاراستنی زەردەشتیشەوە بابەتێكی تێدایە.

نسكی یازدەهەم: بریتیبوە لە 22 فەرگرد، تەنها شەش فەرگردیان دۆزرایەوە، ئەویش لە بارەی كردار و ڕەفتاری ئاینییەوەیە.

نسكی دوازدەهەم: یەكێكە لە بەشە گرنگەكانی ئاوێستا، بریتیبوو لە 22 فەرگرد، دوو بابەتی گرنگ تەوەرەی باسەكانی بوو، یەكەمیان لە بارەی پزیشكی و بارودۆخی تایبەتی پزیشكی لەگەڵ چەند داستانێك هەر لەو بارەوە، دووهەمیان چەند لێدوانێكە لە بارەی سەرەتای دروستبوونی گەردوون و ژیانی زەردەشتیشی لە خۆ گرتووە، لەگەڵ لێدوان لە بارەی ڕەگەز و تیرەو تایەفەكان و داب و نەریت و ڕەسم و یاساكانیان، لەم نسكەدا بە دوور و درێژی پاشاكانی "پیشدادی" و "كەیانی" باسیان لێوە كراوە. لە ڕاستیدا ئەم نسكە بناغەی كتێبەكانی (سیر الملوك و شانامە)كانە، بێگومان ناڕاستەوخۆ گەلێك لەو چیرۆك و بابەتانە یان بەهۆی شانامەو كتێبەكانی دیكەی وەك شانامەوە بە ئێمە گەیشتووە.

نسكی سیازدەهەم: لە بناغەدا شەست فەرگردبووە. بابەتەكانی لە بارەی ڕەوشت و كردار

چاکی و داستانی سەردەمی ژیانی منداڵی زەردەشتەوەیە.

نسکی چواردەهەم: حەڤدە فەرگردەو لە بارەی ئاهوورامزداو فریشتەکان و شێوەی دۆعا و پاڕانەوە و ستایشیانەوەیە، لێدوانێکە لە بارەی فریشتەکانی ئەمشاسپندانو ئەو یەشتانە کەبەشێکە لە ئاوێستای سەردەمی ئێمە، دەبێت بەشێك بووبێت لەم نسکە.

نسکی پازدەهەم: لە بناغەدا پەنجاو چوار فەرگردبووە، لە بارەی ڕاستی و دادوەری و پەیڕەوکردنی ماڤی مرۆڤ و سەنگ و کێشانە و پێوانە، کە چەند سەنگ و پێوانەی تایبەتی هەبووە، هەروەها بریتیبووە لە چۆنییەتی دادوەری و جۆری بەکارهێنانی لە بەرانبەر تاوانباراندا لەگەڵ هەموو جۆرە سزایەك و دیاریکردنی سزاکان و تاوانەکان و شێوەی شکاتکردن و هەموو وردەکارییەکی دادگاییکردن، لەم ڕووەوە کۆمەڵێك لە یاساکان لەم نسکەدا نووسراونەتەوە و نیشاندراون.

نسکی شازدەهەم: لە بناغەدا شەست و پێنج فەردگردبووە کە چەند فەرگردێکیان لە بارەی ئافرەت و هاوسەر گرتن و بنچینەی دینداری و یاسای مافەکان و دادگایی و چەندین مەسەلەی دیکەش بووە.

نسکی حەڤدەهەم: لە بناغەدا شەست و چوار فەرگرد بووە، چەن بابەتێکی لە بارەی ئەودنیاو (قیامەت) و پاداشت و چەند فەرمانێکی دیکە لە بارەی کشتوکاڵ و جوتیاران و مافەکانیان، لەم نسکەدا تۆمارکراوە.

نسکی هەژدەهەم: پەنجاو دوو فەرگردبووە لە بابەتی جۆراوجۆر، وەکو پێداویستییەکانی داد و دادوەری دەوڵەت و پاشاکان. ڕووداوەکانی هەستانەوە (قیامەت) و پێداویستییەکانی، ڕووبەڕووبوونەوەی کرداری بەد و ناشیرین. مەرجەکانی دادگایی و دادوەران و دادگاکان. لەگەڵ چینەکانی دادوەرو ماڤ مڵکایەتی.

نسکی نۆزدەهەم: بریتییە لە بیست و دوو فەرگرد، تەنها نسکێکە دەقە ئاوێستایی و زەندیەکەی، واتە وەرگێڕان و شیکردنەوەی دەقە (پەهلەوی)یەکەی بەڕاست و دروستی ماوەتەوە و بە ئێمە گەیشتووە. کە بریتییە لە وەندیدادی ئاوێستای ئەمڕۆکە. یەك فەرگردی لە بارەی جوگرافیاوەیە. فەرگردێکی دیکەشیان لەبارەی داستانی جەمشیدەوەیە، دوو فەرگردیان لە بارەی کشتیاری و کاری پێویستەوەیە. فەرگردێکی دیکەیان لە بارەی داستانی بەسەرهات و ژیانی زەردەشتەوەیە. یەکێکی دیکەیان لە بارەی پزیشکی و نەخۆشییەکانەوەیە، ئەوانی دیکەشیان لە بارەی پاك و خاوێنییەوەیە. ئەم نسکە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەگەڵ داب و نەریت و ڕەسم و یاسای ئاوێستایی و دانیشتوانی ئێراندا جیاوازە.

نسکی بیستەم: سیودوو فەرگردە، گرنگترینیان لە بارەی ئیزدەکان و فریشتەکانی ئەمشاسپیندانەوەیە، بەشێکیان لە ئاوێستاکەی ئێستادا تا ئەم سەردەمە، ماوەتەوە کە هەمان سروشتی (یەشتهادوخت)ە لە سی فەرگردا. فەرگردی یەکەمـــیان لە بارەی نوێـــژی (اشم وهو)وەیە، فەرگردی دووهەم و سێهەم باسی بەسەرهات و چۆنییەتی چارەنووسی ڕۆحی پیاوچاکان و بەدکردارەکان دەکەن لەو جیهانەکەی دیکە.

نسکی بیستو یەك: لە بناغەدا سیوسێ فەرگردبووە. لە بارەی ئاهورا مزداو ستایشی

ئاهوراو ئەمشاسپندانەوەیە. لە ئاوێستاکەی ئێستادا ئەم نسکە بە ناوی ستوت یسینە *satota yasnya* واتە بەناوی یسناکانی ستایشکراوان هاتووە.

لەو بیست و یەك نسکەی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان، تەنها نسکی نۆزدەهەم کە وەندیدادە بەشێوەیەکی تەواو لەگەڵ پەرچەڤەکەی کە بە زمانی پەهلەوییە بە ئێمە گەیشتووە. ئەو بەشانەی ئاوێستای دێرین کە لە ناو ئاوێستاکەی ئەمڕۆکەدا ماونەتەوە، بریتین لە بەشێکی گشتاسب یەشت، هادخت نسك، ئافرینگان، سی رۆژەی مانگ، ویسپردو یسنا لەگەڵ پەرچەڤە پەهلەوییەکەیان. هەروەها نیرنگ ستان، کە بەشێکە لە هۆسپارم نسك، واتە نسکی حەڤدەهەمی ئاوێستای ساسانییەکان و بەهمەن یەشت یا زندو، وەهومن یسن، لەگەڵ چەند بەشێکی دیکەدا. کە بە زۆری تەنها پەرچەڤەی ئاویستای ساسانییەکانە بە زمانی پەهلەوی.

ئەوەی کە لە چیرۆکەکانی کتێبی دینکردەوە بە دەست هاتووە و ئەژمار دەکرێت ئەوەیە: کە ئاوێستای سەردەمی هاخامەنشی بریتیبووە لە 21 نسك و 815 فەرگرد. بەڵام لە سەردەمی ساسانییەکانا کە دەستکرا بە کۆکردنەوەی ئاوێستا لە دوای هەوڵ و گەڕانێکی زۆر 348 فەرگرد لەو ئاوێستایە دۆزرایەوە ئەویشیان لەسەر هەمان نەریت بەسەر 21 نسکا دابەشکرد. لەدوای ئەو وەرچەرخان و ئاڵۆزیانەوە کەلە کۆتایی سەردەمی ساسانییەکانەوە لە ئێراندا ڕوویاندا بەو هۆیەشەوە کە عەرەبەکان پەلاماری ئێرانیانداو بەهۆی دەمارگیری و ڕقی دێرین و دوژمنایەتی پیشەدار، شوێنەواری شارستانییەتی و فەرهەنگی ئەم وڵاتە گۆڕانیان بەسەرداهات. لە زیندوکردنەوەی ئاوێستادا زیاد لە هەشتاو سێ هەزار واژە (وشە = کەلیمە)ی لێ نەمایەوە. واتە نزیکەی چوار یەکێکی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکان ماوەتەوە.

بیستویەك نەسکەکەی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکانمان خستەبەرچاو کە بەرانبەر بە 21 واژەی نوێژی (یتااهو) هاتوتە خوارەوە. نوێژی یتااهو لە سێ شێعر یان گاس (*GAS*) پێکهاتووە. هەرگاسێك بریتیە لە حەوت (ماریك) یان وشە، یانی سێ شیعر، هەر شیعرەش لە حەوت وشە پێکهاتووە. هەر بیستویەك نەسکەکەی ئاوێستا لە ڕووی بابەتەوە بەسەر سێ بەشی گەورەدا دابەشدەکرێت. هەر بەشەی بریتیبوو لە حەوت نسك. کە بەرانبەر بوو بە یەك شیعر یان یەك گاس لە سێ شێعرەکەی نوێژی یتااهو. یەك بەش یا (بهرە = فەسڵ)ی گاسانیك (*Gasanik*) یان، ئەدەبیاتی مینۆیی = فریشتەییان ناونابوو، کە لە بارەی زانست و کاری (مینۆیی= فریشتەیی، یان بەهەشتی)یەوە بووە. دووهەم بەشی نسکەکانی داتیك (*datik*) یانی ئەدەبییاتی جیهانی پێدەوترا. کە لە بارەی زانست و کاروباری جیهانییەوە بووە. بەشی سێهەمی نسکەکانی هاتك مانسریك (*Hatak Mansrik*)ی ناوبووە کە هەم ئەدەبییات و زانستی ئەم جیهانەو هەم ئەدەبییات و زانستی ئەو جیهانی دیکەش بووە. بەڵام ئەم دابەش کردنە بە دروستی لە ڕووی بابەتەکانەوە نەبووە. چونکە هەر بەهرەیەك زۆر و کەم چەند مەسەلەو باسێك لە خۆ دەگرێت کە ئەو دوو بەهرەکەی دیکەشی دەگرتەوە.

نسکەکانی یەك و دوو سێ و یازدەو سیازدەو

بیست و بیست و یەك لە كۆمەڵەی نسكەكانی گاسانیكدا بوون. نسكەكانی چوار و پێنج و شەش و هەشت و نۆ و دە لە كۆمەڵەی نسكەكانی هاتك مانسریك دابوون. نسكەكانی دوازدەو چواردەو پازدە و حەڤدەو هەژدە و نۆزدەش لە كۆمەڵی نسكەكانی داتیكدابوون.

بە پێی ئەو ئاماژەیە كە لە كتێبی دینكردا هاتووە، ئاوێستا لە چوارچێوەی بیستویەك نسكدا بە فەرمانی گشتاسب شا ئامادەكراو نووسرایەوە، ئەو ئاوێستایە بە دوو نوسخە و بە ئاوی زێڕ لەسەر پێستی گا، نووسرا بوەوە. لە دوو شوێنی پیرۆزدا چاودێرییان لێدەكرا. یەكێكیان لە (گەنجی شیپیگان) ئەوی دیكەشیان لە (دژنپشتك = كتێبخانەی شاهی)دابوو.

لە كاتێكدا كە ئەسكەندەر دەستی بەسەر ئێراندا گرت دژنپشتكی سوتاند، لەمڕووەوە ژمارەیەكیش لە كتێبی دیكە و نوسخەكەی ئاوێستاش سووتا. دژنپشتك یان كتێبخانەی گەورەی شاهی كە بەشێك بوو لە كۆشكی پاشایەتی، واتە تەختی جەمشید لە ساڵی 331 پ.ز. لە كاتی سوتاندنی تەختی جەمشید ئەم كتێبخانەیەش لەناو چوو. نوسخەكەی دیكەشیان كە لە كتێبخانەی شیپیگان بوو لە شاری (شیز) كە لە نزیكی ورمێدا بوو، لە ئازربایجان لە پەنای ئاتەشگەدەی (ئازەرگشسب)دا چاودێری لێدەكرا. بەپێی سەربردەیەك ئەسكەندەر كە لە گرنگی ئاوێستا ئاگاداربوو. فەرمانیدا كە بیبەن بۆ یۆنان. لەویٚ وەریان گێڕایە سەر زمانی یۆنانی. لەوانەشە ئەسڵی دەقەكەشیان لەناو بردبێت.

جگە لەمانەش لە سەردەمی ئەشكانییەكاندا، یەكێك لە پاشا ئایندارەكانی ئەشكانی، بەناوی (ولخش) كە پەیڕەوی ئایینی مزدایی زەردەشتی بوو. فەرمانیدا بەهەر شێوەیەك بووە ئاوێستا كۆبكەنەوە، سەرلەنویٚ ڕێكی خەنەوە. لە دوای ئەویش لە سەردەمی ساسانییەكاندا (ئاردەشێر)ی شای ساسانی. یەكێك لە مووبدە زاناكانی بەناوی "تنسر" ڕاسپارد تاوەكو بە وردبینییەوە ئاوێستای لە دەستچوو كۆ بكاتەوە. لەدوای مردنی ئاردەشێر، كوڕەكەی كەناوی شاپوور بوو فەرمانیدا ئەو بەشانەی ئاوێستا كە سەبارەت بە ئەستێرەناسیو فەلسەفەو جۆگرافیا ئەدوا. كە لەلای هیندییەكان و یۆنانیەكان بەشێوەیەكی پەرشوبڵاو هەبوو، كۆبكەنەوەو، بیخەنەوە سەر ئاوێستا. لەسەردەمی شاپووری یەكەمدا لە بارەی ئاوێستاوە، وتووێژی زۆركرا، شاپوور بۆ لابردنی ئەو ناكۆكییانە كە هاتبوونە ئاراوە، فەرمانیدا تاكو (ئازەر باد مهر ئەسپندان) دووبارە بەوردبینییەكی تەواو ئاوێستا لەسەرخۆ بنوسێتەوە. بەشێوەیەكی وەها ڕێكیخستەوە كە هەموو لایەك پەسەندیان كرد.

مێژوونووسان سوتاندن و لەناوبردنی ئاوێستایان بەهۆی بەدكردارییەكانی ئەسكەندەرەوە ڕاگەیاندووە. لە (نامەی تنسر) دا هاتووە كە كتێبی ئایینی ئاوێستا لەسەر ڕووی دوازدە هەزار پێستی گا نوسرابوەوەو، ڕازێنرابوەوە، كە بەهۆی هێرشەكەی ئەسكەندەرەوە سوتا. لە كتێبی (ئەرداویراف نامە)شدا ئاماژەیەك بۆ ئەم بابەتە كراوە.

زەردەشتی پاك و خۆپارێز، یەكەم جار كە دینی

پەسەند کرد، بە جیهانی ڕەوا بینی ماوەی سێ سەد ساڵ، تەواوی دینەکەی بەتایبەتی لەلایەنی دانیشتوانەوە لێی بێگومان بوون. لە دواییدا ئەهریمەنی ناپاك بۆ لەدین لادانی دانیشتوان. ئەسکەندەری هێرشبەری ڕۆمی هەڵخڵەتان و بەهەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر، بۆ جەنگ و وێرانکردنی ئێرانشاری ڕەوانە کرد. ناوبراو، واتە ئەسکەندەر (مەرزبان = سنورەوان)ی ئێرانی کوشت، پایتەختی شاهەنشاهی ئێرانی پەرێشان و وێرانکرد. ئەو کتێبە ئاینییانەی وەکو ئاوێستا و زەند کە لەسەر پێستی گا بە ئاوی زێڕ نووسرابوونەوە لە (ئەستەخر)ی بابکان لە گەنجینەی نووسراوەکاندا دانرابوون. ئەسکەندەری ڕۆمی شێت و پەتیارە و بێدین و بەدکردار ئاوێستاو کتێبی زەندی دەرهێناو سووتاندنی.

مێژوونوسی یۆنانی بە ناوی پلی نیوس (*Plinius*) کە لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوە چەند کتێبێکی لە بارەی زەردەشت و ئایینەکەیەوە نووسیوە. دەگێڕێتەوە دەڵێت: کتێبی ئاینی ئێرانییەکان، زەردەشت لە دوو ملیون شیعردا ڕێکی خستووە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم کتێبەی بە وردی خوێندووەتەوە. لە زۆربەی سەربردەی مێژوونوسانی ئێرانی و عەرەب هەواڵێکی وەها کە لە بارەی گەورەیەتی و شکۆمەندی ئاوێستاوە دەدوێت کە لە سەردەمی ئەسکەندەردا سوتێنراوە. بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێت.

لە دوای سەردەمی پاشاگەردانی کە لە دوای ڕووخانی هاخامەنشییەکانەوە ڕوویدا. لە ڕۆژگاری ئەشکانییەکاندا بزوتنەوەیەك بۆ ئامادەکردن و نووسینەوەی ئاوێستا هاتە کایەوە. لەبەرگی سێهەمی دینکردا ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی ئەم بزوتنەوەوە بە کورتی هاتووە و ئاماژەی بۆ کراوە. بە پێی ئەم ئاماژەیە لە دوای ئەسکەندەر، یەکەم کەسێك کە دەستی بە کۆ کردنەوەی بەشەپەرش و بلاْوەکانی ئاوێستا کرد (ولخش) یان (بەلاشی) پێنجەم بوو. کە لە نێوان ساڵەکانی 51 تا 78ی زاینی لە ئێراندا فەرمانڕەوا بوو، هاوچەرخی (نەیرون)ی ئیمپەراتوری ڕۆمی بوو.

لە سەردەمی ساسانییەکاندا یەکەم کەسێك کە فەرمانی بە نووسینەوەو ڕێکخستنەوەی ئاوێستادا، ئاردەشێری بابەکان بوو کە لە نێوان ساڵەکانی 224 تا 242ی زاینی فەرمانڕەوایی کرد، بە فەرمانی ئەو بە هەوڵ و کۆششی فراوان ئەوەندەی لە تواناداد بوو بەشەکانی ئاوێستایان کۆکردەوە، لە دوای ئەویش کوڕەکەی کە ناوی شاپوور بوو لە نێوان ساڵەکانی 242 تا 272ی زاینی فەرمانڕەوا بوو، لەم کارە گرنگەدا کۆششێکی فراوانی کرد. لە دوای شاپووری یەکەم لە سەردەمی شاپووری دووهەمدا (310–379) زاینی ئازاربدمهر ئەسپندان، کە لە زاناکان و ڕۆحانییە بەناوبانگەکان بوو، جێگەی باوەڕپێکردن بوو ئاوێستای بە تەواوی نوێ کردەوەو بەشێوەیەکی ورد و جوان نووسییەوە. لەوەشبەدواوە شاپوور فەرمانیدا کە کتێبێکی پیرۆز و بێخەوشە و نابێ هیچ کەسێك گومانی لێهەبێت. ئەو ئاوێستایەی ئەمڕۆ لەبەردەستی ئێمەدایە نزیکەی چواریەکی قەبارەی ئاوێستای سەردەمی ساسانییەکانە. چونکە بەرهەمی ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوون و کۆکردنەوەو بەسەربردنی کاتی زۆر و فراوانە کە لەدوای ئەو هەموو ماندووبوونەوە بەدەست هاتبوو لە هێرشی عەرەبەکانا، لەگەڵ گەلێك لە شوێنەواری

دیکەی شارستانییەت و فەرهەنگی ئێران زەمین لەناوچوون و وێران بوون. ئەو ئاوێستایە کە ئێستا لەبەردەستایە، ئەو بەشەیە کە لەدوای ئەو ڕووداوە تالأنەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە.

## پەراوێز

1-دوازدەهاماست: چەند دوعایەکی زۆر دوور و درێژە کە بۆ تۆبەکردن و داوای بەخشین و پاکبوونەوە لە تاوان دەخوێندرێتەوە، بە تایبەتی بۆ ئەو ژنانەیە کە لە کاتی نەخۆشی مانگانەدا تووشی تاوان ئەبن، ئەویش بریتییە لە خوێندنەوەی هەر بیست و دوو فەرگردەکەی وەندیداد کە لە حەفتاو دوو هاتەکەی یەسنا، فەروەردین یەشت (یشت) ئافرینگان، دەهمان، کردەی سروش، وهمازوردهمان. (تەماشای وەندیداد بەرگی 3 لاپەڕە 1543 بەدواوە بکە).

**تێبینی:** (فرگرد، بەهرە، هات، کردە) هەموویان بە مانای فەسڵ یان بەش دێن.

## سەرچاوە

زەردەشت پیامبر ایران باستان، لە نووسینی هاشم ڕەزا، لە لاپەڕە 191-197.

# لەنێو ئەم وێرانەیانەدا هەنگاو دەنێم

## گفتوگۆیەکی کورت لەگەڵ شەهریاری مەندەنی پور و راپۆرتێ دەربارەی بەرهەمەکانی

**مهدی یزدانی خرم**

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

هەموومان شەهریاری مەندەنی پور واتە نووسەری کۆمەڵە چیرۆکی (مومیا و عسل – مومیا و هەنگوین) دەناسین*، کە نووسەرێکی شیرازییە و بە ستایلی نەوەدەکان دەنووسێ و ئەمڕۆ بووە بە یەکێك لە چیرۆکنووسە گرنگەکانی ئێران، ئەمەش رێك لەبەرئەو چیرۆکە تازانەیە کە بە زمانی جیاواز نووسیونی. مەندەنی پور لە ساڵی (1956)دا لە شیراز لە دایکبووە و دوای تەواوکردنی سێ قۆناغی سەرەتای خوێندن چووەتە تاران و لە زانکۆ لە بواری (زانستە سیاسیەکاندا) درێژەی بە خوێندن داوە. (لە کاتی مناڵیدا گەورەترین یارمەتیدەر بۆ من گۆڤاری (کیهان بچەها– جیهانی مناڵان)بوو، ئەو بەشەی من حەزم لێیبوو چیرۆکی وێنەیی بوو کە وێڕای ئەوەی وزە و توانای بە خەیاڵدانی من دەبەخشی تەنیاییشمی لەماڵەوە پڕ دەکردەوە" لە قۆناغی زانکۆدا نووسین لای مەندەنی پور جدی تر دەبێت و بەقسەی خۆی چەندین سەعات لە تەنیایی نووسیندا بوو بە هۆی ئەوەی کە دەربارەی وشە و نووسەریی مەشقێکی جدی بکات. دەربارەی بەرهەمەکانی ئەو قۆناغە کە بە بناغەی سەرەکی چیرۆکەکانی کۆمەڵە چیرۆکی (سایەهای غار – سێبەرەکانی ئەشکەوت) لە قەڵەم دەدرێن، مەندەنی پوور دەڵێت "دوو قۆناغی تازەم تاقیکردەوە، قۆناغی یەکەم ئەو قۆناغە بوو کە زۆر لە ژێر کۆنترۆڵی سادقی هیدایەتدا بووم بە ڕوانینێکی ڕەشبینانەوە کە لەسەردەمی مێردمناڵی و پێگەیشتنەوە سەرچاوەی گرتبوو. وەسفی ئەم قۆناغە بەمجۆرەیە: نا ئومێدییەکی زۆر ترسناك بەهەمان ڕادەش ساکاریی کە هەندێ جار بەرەو دیدی (رۆمانسی و سانتی مانتاڵ (هەستیار)

سەبارەت بە ژیان دەكشا". مەندەنی پور دان بەوەدا دەنێ کە بەرهەمەکانی سەرەتای کاریگەریی زۆری سادقی هیدایەتیان بەسەرەوە بووە هەڵبەتە زیرەکی و هۆشیاری خۆی بووە هۆی ئەوەی هەرگیز ئەم چیرۆکانە چاپ نەکرێن کە زۆر دوبارە و لاسایی کردنەوەبوون، کۆمەڵێ چیرۆك بوون بە فەزای رەشبینانەی سادقی هیدایەت و ناوەرۆکی چیرۆکەکانی سادقی چوبەك و غەولامحسێنی ساعیدی ئاوێتەبوون و تێکەڵەیەکیان دروست کردبوو کە هیچ ناسنامەیەکی تایبەتی چیرۆکیان پێوەنەبوو. هەڵبەتە کاریگەریی سادقی هیدایەت لەسەر مەندەنی پور بە چیرۆکە چاپکراوەکانیشیەوە دیارە بەڵام ئەم ڕوانینە بووە بە ڕوانینێك دەربارەی تەنیایی بەم پێیە مەسەلەی لاساییکردنەوەی سادقی هیدایەت رەتدەکرێتەوە. "قۆناغی دووەم بەمجۆرە بوو، رۆمانتیزم و ئەم قۆناغە کەمێك بابەتی تر ببو، زیاتر لە ریالیزم یان سوریالیزم نزیکدەبۆوە" مەندەنی پور بەهۆی چەند هەلومەرجێکی تایبەتەوە سەردەمی مێردمناڵی و سەرەتای لاویی هەمیشە لە تەنیایی دا ژیاوەو بە قسەی خۆی ئەم تەنیاییە لە هەردوو سەردەمەکەدا بەشێوەی جیاواز کاری لە کەسێتی کردووە ئەمەش بە ناچاریی هەندێ جار بەرەو نیگەرانیی کۆمەڵایەتی چوبەك ئاسایان بەرەو ماخولیای هیدایەت ئاسا رێنمایی کردووە. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگدا (مەبەستی جەنگی عێراق — ئێران)ە، مەندەنی پور کە مامۆستا بوو بەرەو ناوچە جەنگیەکان بەڕێدەکەوێ، "من نووسەرم چۆن دەکرێ جەنگ بێت و نووسەر لەو جەنگەدا ئامادە نەبێت (هەڵبەتە کاریگەریی هەمەنگوای ناشارمەوە)" لەم ماوەیەدا کە چەند چیرۆکێکی پرشنگداری مەندەنی پور لەوێوە سەرچاوەی گرتووە هەوڵدەدات بەهۆی خەم و نیگەرانیی کۆمەڵایەتی و ریالیستیی خۆیەوە جۆرێك لە ژیان تاقیبکاتەوە، چیرۆکەکانی مەندەنیپور سەبارەت بەجەنگ تەواو جیاوازن، لەم چیرۆکانەدا هەوڵدەدات هەواڵی مرۆڤ لە بەرامبەر مەرگدا لە تێڕوانینی کەسێکی پەیامنێرەوە وێنە بکێشێ. دەڵێت "خاسیەتی جەنگ ئەوەیە کە کەسێتییەکان زۆر رووت و قووتن و هەموو شتێ لە حاڵەتی زیادەڕەوییەکی سەیردا بەسەر دەبەن، زۆر لە فاکتەرەکان رێك و خێران. خاڵی دوای ئەوە تێگەیشتنی نزیکە لە زیندوێتی کە من ئەمەیان بە قەرزارباری جەنگ دەزانم.. ئەو هەستەی کە مرۆڤ بە جێگایەکدا بڕوات کە قیر بێت لەو رۆژانەدا بەلای منەوە سەیر بوو. دوای چل رۆژ کە لە ناوچەکە گەڕامەوە ئەو هەستەی کە من لە جێگایەکدام کە پێویست ناکات بەردەوام تەماشای بەرپێم بکەم و سەرم شۆڕبێتەوە لەزەتێکی زۆری پێدەبەخشیم.

مەندەنی پور ساڵانی جەنگ بە ماوەیەکی گرنگ دەزانێ لەسەرهەڵدانی تەرح و پلانی چیرۆکەکانیدا. لەبەر شوێنی تایبەتی جەنگ کارەکتەری ئەو چیرۆکانەی مەندەنی پور کە دەربارەی جەنگن هەمیشە لە بازنەیەکدا زۆر هەستیارن و بەشێوەیەکی ئەبستراکتن. "هەستکردنی پێ لەوێدا مانا دەبەخشێ ئێمە بەشێوەیەکی ئاسایی هەست بەوە ناکەین چونکە پێی ئاشنانین بەڵام لە شوێنی جەنگدا پێی ئاشنا دەبین" مەندەنی پور لەگەڵ ئەزموونی جەنگدا یەکێکی تر لە رووداوە گرنگە کۆمەڵایەتییەکان دەهێنێتە ناو بابەتی چیرۆکەکانییەوە. ئەو بابەتانەی کە بەجۆرێك لە سەراپای چیرۆکەکانیدا هەن. کارەکتەرەکان و هەستی تایبەتییان لە بەرامبەر مەرگ و نەبووندا بە ناچاریی دەکەونە حاڵەتی کاردانەوەوە. دواجار

پاش ئەو هەموو مەشق و پاکژکردنەوەیە لە بواری نووسیندا مەندەنی پور لە چاپکردنی یەکەم بەرهەمی خۆی نزیك دەبێتەوە. دوای تێپەڕاندنی قۆناغی جەنگ و گەڕانەوەی بۆ تاران دکتۆر عەباسی میلانی مەندەنی پور بە هۆشەنگی گوڵشیریی دەناسێنێ. یەکەم چیرۆکی جدی مەندەنی پور بە چیرۆکی (عیسی سایە– سێبەری عیسا) لە قەڵەم دەدرێ کە تەسلیمی گوڵشیریی کرا "گوڵشیریی جوابی ناردبوو کە سەرێکی لێ بدەم و چاوم پێی بکەوێ لەم ماوەیەدا من دوو چیرۆکی ترم نووسیبوو بەناوی (اگر فاختە رانکشتە باشیر – ئەگەر کوکوختیەکەتان نەکوشتایە) و (نمیازە در اینە – باوێشك لە ئاوێنەدا) گوڵشیریی زۆر شتی فێرکردم بەتایبەتی کارامەیی ئەو بۆ من ئیجابی و ڕێنیشاندەر بوو" مەندەنی پور ڕێگای بۆ دەکرێتەوە بۆ ئەوەی لە کۆڕی چیرۆك خوێندنەوەی پێنج شەمواندا ئامادەبێ کە گوڵشیریی لە تاران ڕێکی دەخست و بەم پێیە زۆربەی چیرۆکەکانی سەرەتای خۆی لە پاڵ کەسانێکی وەکو محەمەد محەمەد عەلی و ناسری زەراعەتی و بیجاری و هتد دەخوێنێتەوە. "ڕەفتاری گوڵشیریی بەشێوەیەك بوو کە وەهمی مرید و مەبەست کاریی سەرهەڵنەدات. گوڵشیریی بە ڕەفتاری ئەمەی دەسەلماند" بەهەرحاڵ مەندەنی پوریش وەکو زۆربەی کەسانی تری ئەونەوەیە لە قۆناغێکی گرنگدا دەرفەتی سوود وەرگرتنی لە کۆڕە بەناوبانگەکانی گوڵشیریی بۆ دەرەخسێ و یەکەم چیرۆکی کە بڕیار بوو لەگەڵ حەوت چیرۆکی تردا لە کتێبێکدا چاپ بکرێ دەبێت بەهەویدا پاش ماوەیەك مەندەنی پور نموونەی ئەم کۆڕانە لە شیراز بەڕێوە دەبات. هەر لەم ماوەیەدا یەکەم کتێبی لەلایەن چاپخانەی (نوید شیراز)ەوە چاپ دەکرێت کە بەناوی (سایەهای غار – سێبەرەکانی ئەشکەوت)و. "کۆمەڵێ چیرۆکنووسم کۆکردەوە بۆ سازدانی کۆڕی چیرۆك خوێندنەوە وەکو ئەبوتوراب خوسرەوی، ئەمین فەقیری، منیر و ڕەوانی پور (کە جاری وا بوو لە (بوشهر)ەوە دەهات بۆ کۆڕەکان)، شاپور بونیاد، جورکش و.. هەڵبەتە ئاستی کۆڕەکان وەکو تاران نەبوو بەڵام وەکو کۆمەڵێ کە لە شیراز کۆ ببووینەوە بەو توانا کەمەوە دیسان بە سوود بوو و مایەی ڕەزامەندی بوو، من لەم کۆڕانەدا ناچارکرام باسی تیۆری ئەدەبی بخوێنمەوە". سێبەرەکانی ئەشکەوت کە کۆمەڵە چیرۆکێکە ولای نووسەرەکەشی خۆشەویستە ساڵی 1989 چاپ دەبێت و دیسان لەبەر بەهێزی چیرۆکەکانی نووسەرەکەی دەهێنێتە مەیدانەوە بە تایبەتی چیرۆکی (ئەگەر کوکوختیەکەتان نە کوشتایە) سەرکەوتووترین چیرۆکی تەمەنی چیرۆك نووسینی مەندەنی پور–ە. دەربارەی (سێبەرەکانی ئەشکەوت) دەڵێت "ئەم کۆمەڵە چیرۆکە جۆرێك ئەزموون و جۆرێك بوو لە یەقین بۆ ئەدەبی تایبەتی من، کاتێ دوبارە تەماشای ئەم کۆمەڵە چیرۆکە دەکەم (چیرۆکی سێبەرەکانی ئەشکەوت) وەکو جۆرێ لە دەستپێشخەریی دێتە بەرچاو. سەراپای چیرۆکەکە لەبەردەم سەرهەڵدانی جۆرێك لە توندوتیژیی و جۆرێك لە ئاژەڵێتی تازەدایە" مەندەنی پور بە جۆرێك بەم کۆمەڵە چیرۆکە هەوڵی خۆی بۆ گەیشتن بە زمانێکی تایبەت لەگەڵ ناوەرۆکی نوێدا دەست پێدەکات کۆمەڵێ بیروبۆچوونی جیاواز دەوروژێنێ و چەند سەرچاوەیەکی وەکو ئەدەبی کلاسیکی پڕ بەرەکەت بە بنەمای گرنگ دەزانێ بۆ گەیشتن بەو زمانە. دوورکەوتنەوەش لە باس و مشتومڕی چەقبەستووی ڕۆشنبیریش بە فاکتەرێکی گرنگ دەزانێت لە ئەزموونی تایبەتی مرۆڤ و فەزاکانیدا.

"جێگایەك نەبوو كە بتوانم بۆ نموونە سەبارەت بە (مەسنەوی) باس و مشتومڕ بكەم و ئەمەش بۆ من مایەی خۆشبەختی بوو چونكە ئەم قسە و باسانە بەتاڵ نەكرانەوەو بە پێچەوانەوە لە ناخدا مانەوە" لە دوای (سێبەرەكانی ئەشكەوت) لە ڕێگەی گفتوگۆی گوڵشیریی و چاپخانەی (نیلۆفەر)ەوە بڕیار دەدرێ ئەم دەزگایە یەكێ لە كۆمەڵە چیرۆكەكانی نووسەرە لاوەكان چاپ بكات، لە تیروپشكەكەدا ناوی مەندەنی پور دەردەچێ و باوەڕی گوڵشیریی بە مەندەنی پور دەبێتە هۆی چاپكردنی كۆمەڵە چیرۆكی (هشتمین روز زمین– هەشتەمین ڕۆژی زەوی) لەساڵی 1992دا. هەشتەمین ڕۆژی زەوی و ستایل و سیاقی تایبەتی زیاتر ئەم نووسەرە دەباتە پێشەوە و دەیناسێنێ، ڕەخنەی جدی لەسەر دەنووسرێ و كەم كەم چاوپێكەوتنی گرنگ لەگەڵ مەندەنی پور دەكرێ یەكێك لە چاوپێكەوتنە سەرەتاییەكان گۆڤاری (شباب) ئەنجامی دەدات. چیرۆكەكانی ئەم كۆمەڵەیە هەموویان لەسەرخولگەی زمان و جوڵەن. بۆ نموونە چیرۆكی (هنگام – كات) بەشێوە گێڕانەوەیەكی تازە و چەند جارە مامەڵەكردنی تازە لەگەڵ كاتدا بەدەستەوە دەدات. پاش هەشتەمین ڕۆژی زەوی، دۆستێك زمانی چیرۆكەكانی مەندەنی پور بە (جوینی چەو لەناو دەمدا) دەچوێنێ! كۆمەڵە چیرۆكە گرنگەكەی مەندەنی پور واتە (مۆمیا و هەنگوین) لە ساڵی 1993دا ئامادە دەبێ بۆ چاپ و چیرۆكی درێژتر بەدوای خۆیدا دێنێ. مەندەنی پور دەڵێت "لەم ساڵەدا لەگەڵ ناشرێكی جێی متمانەی شیرازیدا كە بۆ نموونە كتێبی (تقی صفدری) چاپكردبوو، گرێبەستم نووسی بەلاّم لە دوا قۆناغدا لەبەر هەڵوەشاندنەوەی مۆڵەتی ناشرەكە چاپكردنی كتێبەكە وەستا پاشان چووم بۆ لای چاپخانەی (مەركەز) ئەوانیش باسی ئەوەیان كرد كە دەبێ تا دوو ساڵ سەرەبگرم. دواجار كارەكە كەوتە دەست چاپخانەی (زندەرود) (ئەحمەدی میر عەلایی لەوێ سەرقاڵبوو)، لەم بگرە و بەردەیەدا كتێبەكە مایەوە تا چووینە ساڵی 1996ەوە لەبەر چەند هۆیەكی تایبەتی مەندەنی پور چاپكردنی مۆمیا و هەنگوین بە چاپخانەی (نیلۆفەر) دەسپێرێ بەلاّم لەبەر سیاسەتە تازەكانی وەزارەتی (فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی) دوبارە كتێبەكە دەكەوێتە ژێر سانسۆرەوە و هەر بەڕاستی یەك دوو چیرۆكی لێ لادەبرێ، دواجار بە هەزار بێنەو بەردە كتێبەكە لەلایەن چاپخانەی (نیلۆفەر)ەوە چاپ دەكرێ. ئەمەش لە كاتێكدا بوو كە نووسینی ڕۆمانی (دل دلدادگی – دڵی شەیدایی) تەواو دەبوو كە لە ساڵی 1990ەوە دەستی بە نووسینی كردبوو. مۆمیا و هەنگوین كۆمەڵە چیرۆكێكی سەركەوتووە لە ڕووی بەكارهێنانی زمانێكی ئاڵۆزەوە بە هەستێكی مۆدێرن. بۆ نموونە چیرۆكێكی وەكو (اوازهای درباد خوانده داوود – گۆرانییە لەبەر بادا وتراوەكانی داود) دەبێ بەجۆرێ لە بەیاننامە بۆ مردنی نووسەرەكەی كە ئێرانییە. لە مۆمیا و هەنگویندا مەندەنی پور بۆ دروست كردنی هارمۆنیایەكی ناوەكی سوود لە ئەدەبی كلاسیك و بنەماكانی وەردەگرێ. خاڵی گرنگ دەربارەی ئەم كۆمەڵە چیرۆكە ئەوەیە كە وێڕای ئاڵۆزیی لە ڕووی فۆرم و زمانی تایبەتییەوە چیرۆكەكان جوانن و لەوەش گرنگ تر دەخوێنرێنەوە. مۆمیا و هەنگوین سەركەوتنی گشتیشی بەدواوەیە و ئەمەش لە ژێر ركێفی كەش و هەوای كتێب نەخوێندنەوەدا سەركەوتنێكە دەكرێ پشتی پێ ببەسترێ. دوای هەردوو كۆمەڵە چیرۆكی هەشتەمین ڕۆژی زەوی و مۆمیا و هەنگوین، لە ماوەی دوو ساڵی دواییدا لە

ڕێگەی چاپخانەی (مەرکەز)ەوە هەردوو کۆمەڵە چیرۆکی (ماه نیمروز – مانگی نیوەڕۆ) و (شرق بنفشه – وەنەوشەی خۆرهەڵات) دەخاتە بازاڕەوە. ئەم چیرۆکانەش نیشانە دیارەکانی بەرهەمەکانی پێشوویان پێوەیە بەتایبەتی دووەمیان بەدوای جۆرێ لە چیرۆکی عاشقانەدا وێڵە. بەهەرحاڵ دەتوانرێ بگوترێ کە مەندەنی پور لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی دواییدا کەمێك لە بەهێزیی مۆمیا و هەنگوێن دوور کەوتۆتەوە بەڵام دیسان دوو کۆمەڵە چیرۆکەکە چیرۆکی جوانیان تێدایە. ئامادەیی مەندەنی پور لە چیرۆکی (رودبار – رووبار، هنگام – کات، ان زلزله تاسف برانگیز – ئەو بوومەلەرزە غەمهێنەرە)، دەبێتە بنەمای سەرەکی بۆ نووسینی ڕۆمانی (دڵی شەیدایی) مامەڵەی مەندەنی بە وێنەگرتنی ئەو کارەساتە دەبێتە غەمێك بۆ چیرۆك، دەزانین نووسەرێکی زۆر کۆمەڵایەتییە "کامێرا هەشت ملیمەترییەکەم دەگرت بە دەستمەوە و بەناو ئەم وێرانەیانەدا هەنگاوم دەنا، لەو ناوەدا جار بەجارێ خۆشم وندەبووم، ڕووبەڕووبوونەوەی سەرینێکی خوێناوی، ترسناك بوو، کۆڵانێك کە هەردوو لای ڕوخابوو.. هەستم بە شتێکی خراپ دەکرد" ئەزموونی پرۆسەیەکی مردن بە جۆرێکی تر ئاوا شیدەکاتەوە "ئەم جۆرە مردنە بۆ من ئەشکەنجە هێنەر و ئازاراوی بوو، لە شەڕدا بۆ مردن ڕێڕەوێکی لۆجیکی هەیە، ئەگەرچی ئەم لۆجیکە قابیلی قبوڵ نییە بەڵام بە چوونە ناو شوێنەکەوە وێناکردنی مەرگیش دێتە پێشەوە واتە پەیوەندییەکی هۆکاریی هەیە. بەڵام بوومەلەرزە بریتیە لە بەکۆمەڵ مردنێکی بێ هۆ. لە چوونی مندا بۆ (منجیل) لە سەرەتاوە تا کۆتایی پەلکە زێرینەیەکی حەوت ڕەنگ باڵی بەسەر شارەکەدا کێشابوو. هەستی گاڵتەپێکردن لەو پەلکە زێرینەیەدا شەپۆلی دەدا". ڕۆمانی (دڵی شەیدایی) دوای چاپکردنی مایەی سەرنج دەبێت، بەڵام ڕۆمانەکە بە هەموو بەهێزییەکیەوە یەك شت دەردەبڕێت، ئەویش ئەوەیە کە مەندەنی پور لە نووسینی کورتە چیرۆکدا بەلای کەمەوە تا ئەم قۆناغە سەرکەوتوو ترە. (دڵی شەیدایی) کۆمەڵێ کورتە چیرۆکی سەرکەوتووە کە دەتوانرێ لەیەك جیابکرێنەوە بەڵام بە گشتی وەها فۆرمێکی هۆمۆجینی لێنەکەوتۆتەوە کە لە پێناسەی ڕۆماندا هەیە! پێکاهەڵپژانی هونەرمەندانی ئەم وڵاتە (ئێران) بۆ مەندەنی پور جێگەی داخەو لەم بارەیەوە دەڵێ "ئێمەدەبێ لەو تێگەیشتنە نزیك بکەوینەوە کە هەموو هونەرمەندان لە دوای یەکترەوە ڕیز نابن. زەوی بۆ هونەرمەندان فراوانە و هونەرمەند لە تەنیشت هونەرمەندی ترەوە دەوەستێ. ئیدی یەکێ چەند هەنگاوێ لە پێشتر، ئەوی تر چەند هەنگاوێ لە دواترەوەیە. ئەو بۆچوونە کەمن لە پێشترم یان ئەو لە پێشترە جۆرێکە لە بۆچوونی هەمەنگوایی کە خراپ خوومان پێوە گرتووە".

مەندەنی پور ڕۆمان بە دیاردەیەکی شار دەزانێت کە زادەی قۆناغی مۆدێرنە. شەفافتر لە هەموو کاتێ دەڵێت "ڕۆمان دیاردەیەکی سەردەمی پیشەسازییە. ئەوەی کە هێشتا (دۆن کیشۆت) خوێنەری هەیە بێهوودە نییە پەیامی دۆن کیشۆت کۆتایی قۆناغی ڕۆمانس و شاسوارە کلاسیکیەکانە ئێمە چیتر لە سەر جادەکان زەبەلاح نابینین. زاراوەی ڕۆمانی دێهاتی دەستەواژەیەکی ناکۆکە چونکە ڕۆمان حەقیقەتی شارە. ئەو شوێنەی کە ڕۆمانەکەی تێدا ڕوودەدات پێوەر نییە بەڵکو دەبێ ببینین کە ئایا ڕوانینی نووسەر بۆ ڕۆمانەکەی، کارەکتەرەکانی، ڕەفتار و زمانەکەی ڕوانینی شارە یان دواکەوتووە".

مەندەنی پوو نووسەری چیرۆکە قورسەکانە!
جەخت کردنەوەی لەسەر زمانێکی تایبەتی و ئاڵۆز جار بە جارێ بۆتە هۆی رەخنەی توندلێی لەم بارەیەوە ئاوادەدوێ "من ناتوانم بە شێوازێکی تر چیرۆك بنووسم.. ئێمەی ئێرانی کاتێ لە شتێ تێناگەین بە خراپی دەزانین بەڵام قەت خەوشەکە ناگەڕێنینەوەبۆ خۆمان" لەم بارەیەوە مەندەنی پور بەڵگەی وای بەدەستەوەیە کە قابیلی قبوڵکردنن و لە هەمووشی گرنگتر سەلیقەی خۆیەتی، جیهانبینی تایبەتی ئەو فۆرمێکی وا دەخوازێ ئایا ئەمە خەوش و گوناهە!! دەربارەی زمان مەسەلەکە دەخەینە ئەستۆی خوێنەر با خۆی بڕیار بدات.
دەربارەی ناونانی سەرکەوتوانەی چیرۆکەکانی لە مەندەنی پور دەپرسین، ئەو ناو نانانەی کە بۆ نووسەرە لاوەکان بووە بە جۆرێ لەسەرمەشق. "ناوی چیرۆك دەبێ لە چیرۆکەکەدا رۆڵی هەبێ بەڵام نەك رۆڵێکی هەڵخەڵەتێنەر یان یارمەتیدەر بەڵکو دەبێ شانبەشانی چیرۆکەکە بجوڵێ". ئەمڕۆ مەندەنی پور سەرقاڵی نووسینی رۆمانێکی درێژە کە بە قسەی خۆی لە چەند جێگاو شارێکی جیاوازدا ڕوودەدات هەر بۆیە ماوەیەکە لە پۆلەکانی وانە وتنەوە دەربارەی چیرۆك نووسین دورکەوتۆتەوە کە گۆڤاری کارنامە لە تاران سازیدەکات. مەندەنی پور چیرۆکێکی کورت و سەرکەوتووی بۆ مێرد مناڵان چاپ کردووە. ئەم کتێبە ناوی (راز – ڕاز)ە و لەلایەن چاپخانەی (سروش)ەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە. هەروەها کتێبێك دەربارەی (هونەری چیرۆك) ئامادە دەکات بۆ چاپ. لە چاوپێکەوتنێکدا لێمان پرسی بۆچی دەنووسیت و ئاوا وەڵامی داینەوە "لە مناڵیدا لەوانەی داڕشتندا بابەتێکم دەربارەی پایز نووسیبوو کە پێمابوو شاکارە. بۆ نموونە نووسیبووم گەنم لە پایزدا زەرد دەبێ. دوای خوێندنەوەی ئەم داڕشتنە بە پێچەوانەی چاوەڕوانی منەوە مامۆستا وتی "کوڕە وا تێنەگەی گەنم لە پایزدا زەرد دەبێ بەڵکو لە هاویندا زەرد دەبێ"، ئەمەش بۆ من کێشەیەکی زۆری دروست کرد. من لەو کاتەوە دەستم بە نووسین کردوە بۆ ئەوە دەنووسم کە گەنم لە پایزدا زەرد بکەم!"

## پەراوێز

*ئەمە قسەی نووسەری بابەتەکەیەو وەکو ئێرانیەك دەڵێ ئێمە هەموومان شەهریاری مەندەنی پور دەناسین، بە پێچەوانەی ئەمەوە ئێمە لە کوردستانی عێراق شەهریاری مەندەنی پور ناناسین، هەتا ئێستاش ئەوەندەی من ئاگادارم لە گۆڤار و رۆژنامەکانی لای خۆماندا بەیەك دێڕیش باسی نەکراوە، بۆیە من ئەم دەستپێشخەرییەم کرد بەو ئومێدەی ئەمە لاکردنەوەی وەرگێڕەکانی تری لێبکەوێتەوە و بە نیازیشم لە داهاتوودا هەندێ لە چیرۆکەکانی تەرجومە بکەم.

## سەرچاوە

رۆژنامەی همشهری ژمارە (743) 2002/6/8. وەك دەبینین ئەم بابەتە هی سێ ساڵ پێش ئێستایە دیارە لەم ماوەیەدا مەندەنی پور بەرهەمی تری چاپ کردووە.

# وێستگەکانی سەردەم

- **جیهانگیری**

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **ڤۆڵتێر**

لویس جۆزێف

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- **ئیسلامییەکان و رۆشنبیران**

عەفیف ئەخزەر

لە عەرەبییەوە: لاس

- **رینیە ماریا ریلکە**

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- **نامەیەکی مەکسیم گۆرکی بۆ چیخۆف**

لە فارسییەوە: حەمە رەسول حەسەن پوور



# جیهانگیری

**هاشم سالح**

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

له شەستەكانی سەدەی بیستەمدا سۆسیۆلۆژستی كەنەدی "هێربەرت مارشاڵ ماكلۆ هان"، پێشبینی ئەوەیكرد بە هۆی ئامرازەكانی ڕاگەیاندنەوە، جیهان بگۆڕێت و ببێت بە گوندێكی گەردونی.. لە ڕابردودا ئەوەی لە چین ڕویدەدا بەلای ئەوروپییەكانەوە گرنگ نەبوو، گرنگیش بوایە، دوای چەندین مانگ و ساڵ پێیان دەگەیشت. بەڵام هەنوكە بچوكترین ڕووداو لە كاتی خۆیدا و لە ڕێی كەناڵە ئاسمانیەكانەوە دەبینین. یەكێك لە پسپۆڕەكان بەم دواییە هەوڵیدا جیهانگیریمان بۆ ڕونبكاتەوە، لە مبارەیەوە دەڵێت: (لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا هەواڵێك لە شاری ئەسكەندەریەوە بۆ ئەوەی بگەشتایەتە ڕۆما، بە تێكڕایی پێویستی بە سەعاتێك بۆ هەر كیلۆمەترێك هەبوو. باوای دابنێین ماوەی نێوان ئەو دوو شارە هەزار كیلۆمەترە، كەواتە گەیشتنی هەواڵێك هەزار سەعاتی پێدەچێت، واتە زیاتر لە چل ڕۆژی دەوێت. ڕەنگە هەواڵێكی وا فەرمانێك بێت، ئیمپراتۆری ڕۆمانی دەریكردبێت بۆ ئەوەی دەسەلاّتی هەرێمایەتی لە شاری ئەسكەندەریە جێبەجێی بكات. بەڵام لە سەدەی هەژدەدا ڕەوشەكە باشتر بوو، بۆ نمونە هەواڵێك لە لەندەنەوە بۆ ئەو شارانەی سێ سەد كیلۆمەتر لێیەوە دوور بوون، لە ماوەی چوار ڕۆژدا دەگەیشت.. لە ساڵی 1856 نامەیەك لە لەندەنەوە بۆ شاری بۆمبای، لە ماوەی بیست و چوار كاتژمێردا دەگەیشت. بەڵام هەنوكە لە ڕێی ئیمەیل و ئەنتەرنێت و مۆبایل و كەناڵە ئاسمانیەكانەوە، لە ماوەی چركەیەكدا هەواڵی ئەم پەڕی دنیا بەوپەڕی دنیا دەگات.. سەرەتایترین پێناسەی جیهانگیری بریتیە لەوەی كە بە هۆی تەكنۆلۆژیای زانیاری و ئامرازەكانی پەیوەندی، كات و ماوەكان كورتدەكاتەوە. ئەنتەرنێت و ئیمەیل و مۆبایل، هەموویان شتگەلێكن لە ماوەی چوار پێنج ساڵی ڕابردوودا

دۆزراونەتەوە و لە باریاندایە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا، بەشە جیاجیاکانی جیهان بەیەك بگەیەنن. ئەمڕۆکە تەواوی دانیشتوانی جیهان لە یەك کاتدا یاریەکانی جامی جیهانی دەبینن و وەکویەك هەڵدەچن. بە جۆرێکیش لە دەوری تەلەفزیۆنەکان خڕ دەبنەوە، وەکو ئەوەی هەمویان دانیشتوی یەك گوندبن و وەکویەکیش دڵخۆش دەبن و ئاهەنگ دەگێڕن.. بەڵام لە ڕابردوودا لە یەکدی دابڕاوبوون و وایان دەزانی هەریەکەیان لە ئەستێرەیەکی جیاوازدا دەژی، تەنانەت هەندێکیان بە هیچ شێوەیەك ئاگاداری بوونی ئەوانی دیکە نەبوون.. لەم سەروبەندەدا کەناڵە ئاسمانییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان لە نزیککردنەوەی میللەتانی دنیادا بینیووە). دەربارەی جیهانگیری پێناسەی دیکە هەیە، لە دەرەوەی ئامرازەکانی زانیاری کە کاریگەریەکی ئەفسوناویان هەیە و دەتوانن لە ماوەی چرکەیەکدا، ئەو سەری دنیا بەم سەری دنیاوە ببەستنەوە.

لە ڕاستیدا چەمکی جیهانگیری بەر لە بیست ساڵ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هاتە ئارا، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا تەمەنی ئەم چەمکە لە دەساڵێك تێپەڕناکات. بەر لە هەموو شتێکیش جیهانگیری مانای ڕزگاربوونی ئاڵوویردی بازرگانی، لە هەموو کۆسپ و تەگەرە گومرگیەکان دەگەیاند. بریتی بوو لە بە جیهانیبونی کەلوپەل و شتومەکەکان لە سەرتاسەری گۆی زەویدا، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە جیهان دەبێتە یەك بازاڕی کراوە، بۆ کێبڕکێی نێو دەوڵەتی لە نێوان شمەك و کەلوپەلی وڵاتانی جیهاندا. کەواتە مانای یەکەمی جیهانگیری، ئابووری و تەکنۆلۆژی بوو، بەر لەوەی لە ماوەی دوایدا بگۆڕێت بۆ کلتوری و سیاسی و تەنانەت بۆ ململانێی شارستانیش!

لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا پرۆسەی جیهانگیری خێراتر بوو، بە تایبەت پاش لێکهەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤیەت و گۆڕانی ئابووری چین بە ئابوریەکی سەرمایەداری، ئەگەرچی سستمی سیاسی ئەو وڵاتە هەر کۆمۆنستیە.. بوون بە ئەندامی چین لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیدا، بووە مایەی یەکخستنی بازاڕی نێودەوڵەتی، بە تایبەت کە ڕوسیا و وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات کەوتنە پەیڕەو کردنی مۆدێلی سەرمایەداری.

پاشان جیهانگیری لە ڕەوتێکی ئابوورییەوە بوو بە پرۆسەیەکی کلتوری، دوای ئەوەی فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنیە ئەمریکیەکان بازاڕەکانی دنیایان پاوانکرد. هاوکات لە ڕێی کۆکاکۆلاو ماکدۆناڵد و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکانەوە، ئەمریکا توانی دەست بەسەر ئابووری جیهاندا بگرێت. ئەم کارەش فەرەنساییەکانی جاڕسکرد، بەڵام داخۆ دەتوانن چیبکەن؟ ئەڵبەتە دەیانەوێت بەقەد توانای خۆیان بەرخورد بکەن و دژی ئەو پرۆسەیە بوەستنەوە. ئەمە وایکرد هەندێك لە بیریاران زۆر بە سادەیی بڵێن: (جیهانگیری واتە بە ئەمریکایکردنی جیهان!)، هەروەها ئەوانە پێیان وایە جیهانگیری دیاردەیەکی زۆر تازە

نییەو پێشینەی لە ڕابردودا هەیە.

بۆ نمونە جیهانگیری لە سەدەی نۆزدەدا جیهانگیرییەکی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی، واتە ئەوروپی بوو، بەڵام هەنوکە بۆتە جیهانگیری ئەمریکای. لەبەرئەوە چاخی زێڕینی یەکەمی جیهانگیری، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەست پێدەکات و تا سەرەتاکانی جەنگی جیهانی یەکەم دەخایەنێت. لە ساڵی 1914 بەدواوە شۆڕشێکی تەکنۆلۆژی ڕویدا، کە بووە مایەی لێك نزیککردنەوەی بەشە جیاجیاکانی دنیا. ئیتر بۆ یەکەم جار هێڵی شەمەندەفەر و تەلەفۆن و کەشتی بازرگانی و ئۆتۆمبێل و تەنانەت ڕۆژنامەش پەیدابوو. بەم ئامرازانەوە ئەورووپا کەوتە خۆی، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا بسەپێنێ و مرۆڤایەتیش ناچار بکات شێوازی شارستانیەتی ئەو قبوڵ بکەن، هەموو ئەمانەش لە ڕێی پرۆسەی کۆلۆنیالیزمەوە.. بەڵام جیهانگیری دوای دوو جەنگی جیهانی گەورە کە شەڕی ساردی بەدوادا هات، گورزێکی کاریگەری بەرکەوت. لەبەرئەوە جیهانگیری دووەم، واتە ئەوەی ئێستا ئێمە لە سایەیدا دەژین، تەنها ئەو کاتە سەرکەوت کە بلۆکی خۆرهەڵات هەرەسی هێنا. بەمجۆرە دەرگای دنیا بە ڕووی ئەمریکا و خۆرئاواییەکاندا کرایەوەو بوونە هێزێك کەس ململانێی نەدەکردن. تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی لیبرالیزم بوو بە ئایدیۆلۆژیای باڵادەستی جیهان. تەنها دوو هێز لە بەرامبەر لیبرالیزمدا وەستانەوە: ئایدیۆلۆژیای فێندەمێنتالستی توندڕەو لەلایەك و هێزە چەپرەوەکانی ناوەوەو دەرەوەی خۆرئاوا کە دژ بە جیهانگیری سەرمایەداری بوون، لە لایەکی تر. یەکەمیان بۆ دژایەتیکردنی خۆرئاوا کاری خۆتەقاندنەوە و پەلاماری تیرۆرستی بەکاردێنێت، بەڵام دووەمیان شێوازی خۆ پیشاندانی هێمنانە و جەماوەری دەگرێتە بەر، وەکو ئەوەی لە: (سیاتل و جەنەواو لەندەن و ژنێف و پۆرتۆ ئەلیگری)، بینیمان.

فێندەمێنتالستەکان دەخوازن جیهانگیری لە ڕەگوڕیشە هەڵکەنن، چونکە ئەوان پێیان وایە پرۆسەیەکە هەر هەمووی گەندەڵی و خراپەکاری و بەدڕەوشتیە. لە کاتێکدا چەپەکان تەنها دەیانەوێت جیهانگیری ئاڕاستە و ناوەڕۆکی خۆی بگۆڕێت، چونکە ئەوان دەزانن جیهانگیری بەهۆی ئامرازە نوێیەکانی پەیوەندیکردنەوە بۆتە واقیع، لە ڕاستیدا دیاردەیەکی پۆزەتیڤیشە. بەڵام دەشێت وایلێبکرێت زیاتر مرۆڤ دۆستانەتر بێت و کەمتر بەربەریانە بێت.. ئەم جیهانگیریەی ئێستا لە ئارادایە، سەرەتا وەها بانگەشەی بۆ دەکرا کە بەختەوەری لەسەرزەوی بەدی دێنێت و ئازادی و دیموکراسیش بۆ سەرجەم میللەتان دەستەبەر دەکات، بەڵام تا ئێستا ئەوەی کردویەتی دەوڵەمەندەکانی زۆر زیاتر دەوڵەمەندتر کردووە و هەژارەکانیش هەژارتربوون. بە پێی ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان، نیوەی دانیشتوانی جیهان تا ئێستاش بە کەمتر لە دوو دۆلار ژیانی ڕۆژێکیان بە ڕێدەکەن! بەڵام جیاوازی نێوان هەژاری جاران و هەژاری سەردەمی جیهانگیری

ئەوەیە، ئەمیان دەتوانێت لە ڕێی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە ئەو دەوڵەمەندیە زۆرەی خۆرئاوا ببینێت، لە کاتێکدا هەژاری جاران ئەم شتانەی نەدەبینی و وەکو هەژارانی ئەمڕۆ هەستی بە مەحرومی و نائومێدی قوڵ نەدەکرد.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەژاری بۆتە سکاندالێك و تەحەمول ناکرێت، ئەمەش کەلێنێکی گەورەیە لە شارستانیەتی ئەمڕۆدا. ئەم هەژاریەش بەرەنجامی بە تالآنبردنی جیهانی سێهەم نییە لە لایەن جیهانی سەرمایەدارییەوە وەکو زۆرێك پێیان وایە، بەڵکو ئاکامی فەرامۆشکردنی کەنارە لەلایەن سەنتەرەوە. جیهانگیری، برسی و ڕوت و ڕەجاڵەکانی جەنگەڵەکانی ئەفریقا ناچەوسێنێتەوە، بەڵکو ئافەرۆزیان دەکات و پشت گوێیان دەخات. ئەمەش زۆر لە چەوساندنەوەیان ترسناکترە، چونکە ڕەنگە لە ئەنجامی چەوساندنەوەیان خێرێکیان لە دەست بوایەتەوە و هەژاران هەندێك شتیان دەسگیر بوایە.. ئەم خەسڵەتە نامرۆڤانەیەی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و ژیاری خۆرئاوا، دواجار دەبێتە مایەی ئەوەی هێزگەلێك نەفرەتی لێبکەن..

قەلاچۆکردنی تیرۆر بە زیادکردنی خەرجی سەربازی نابێت. مادامەکی سالآنە برسیەتی ملیۆنەها کەس بکوژێت و ملیۆنانی تریش بەدەردەسەری بژین، جیهان ئارامی بەخۆیەوە نابینێت و ڕێك نابێتەوە. لێرەوە بەگژاچونەوەی تیرۆر بەبێ چارەسەرکردنی هەژاری و برسیەتی، کارێکی بێهودەیە. ئەمە حەقیقەتێکە کارشوناسانی خۆرئاوا خۆیان باسی لێدەکەن.. بۆ ئێمەش کێشەکە لەوەدانییە، ئاخۆ لەگەڵ جیهانگیریداین یان دژایەتی دەکەین؟ بەڵکو ئەوەیە: ئاخۆ ئێمەش لێی بەهرەمەند دەبین، یاخود هەر لە دوورەوە لێی دەڕوانین؟

تەواوی میللەتانی دنیا دەخوازن داخڵ بەسەردەمی جیهانگیری بن، بەلآم کێشەکە ئەوەیە زۆربەیان ناتوانن، مادامەکی تەنها پاوانە بۆ میللەتە دەوڵەمەندەکان. کێ دژ بە بەجیهانیبونی نان و شیر و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و تۆلێرانس و خۆشگوزەرانی و تەنانەت فیلمەکانی هۆلیودیشە. کەواتە ئێمە بە گشتی دژ بە جیهانگیری نین، بەڵکو دژ بە لادان و خۆپەرستیەکەین..

شایەنی باسە قوربانیەکانی جیهانگیری خەڵکانێکی زۆرن، نەك تەنها لە دەرەوەی خۆرئاوادا، بەڵکو لەناو خودی خۆرئاوا خۆشیدا. سۆسیۆلۆژستی فەرەنسی "پیربۆردیۆ" لە کتێبی (بێنەوایی جیهاندا)، پەردە لە ڕووی ئەو هەژاریە زۆرە هەڵدەماڵێت کە لەناوجەرگەی کۆمەڵگە ئەوروپیەکاندا هەیە، بەشێکیان کۆچبەرەکانن و بەشەکەی دیکەشیان ئەوانەن بەڕەچەڵەك فەرەنسین و خەڵکی ئەسڵی وڵاتەکەن.

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط – 2004/2/13.

# ڤۆڵتێر

**لویس جۆزێف**

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



**تویژەری ئەمریکی "لویس جۆزێف" لێرەدا خوێندنەوەیەکی گشتی بۆ فەلسەفەی ڤۆڵتێر پێشکەش دەکات. ئاشکرایە ئەم بیرمەندە فەرەنسییە بە بیروباوەڕە رۆشنگەرییەکانی هەم دنیای پڕکردبوو هەم خەڵکیشی سەرقاڵ کردبوو. بە درێژایی چل ساڵ چەندین شەڕو جەنگی لەگەڵ پیاوانی ئاینی بەرپاکرد.**

ڤۆڵتێر ساڵی 1694 لە پاریس هاتووەتە دنیاوە و لە ساڵی 1778 لە تەمەنی سەرو هەشتاو چوار ساڵییەوە هەر لە پاریس کۆچی دوایی کردووە. ساڵی 1734 دوای گەڕانەوەی لە لەندەن بە ماوەیەك کتێبە ناسراوەکەی (نامە فەلسەفییەکان یاخود نامە ئینگلیزییەکان) بڵاودەکاتەوە، تێیدا بەسەرسامبوونێکی زۆرەوە قسەوباس سەبارەت بە کاروباری سیاسی ئینگلیز و یاساکانی ئەو وڵاتە پێشکەوتووە دەکات. بەمەش دەیویست گەر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت ڕەخنەو گلەیی لە دەمارگیری و توندڕەوی دەسەڵاتی فەرەنسی دواکەوتوو بگرێ ئەم نامانە لە ناوەندە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی پاریس هەرایەکی گەورەیان نایەوە. دەسەڵاتداران فەرمانیان بە سوتاندنی نامەکان و ڕاوەدونانی خاوەنەکەی دەرکرد. ڤۆڵتێر بۆ ئەوەی لە گرتن و زیندانیکردنی لە باستێل ڕزگاری ببێت، بە نهێنی پاریس بەجێدەهێڵێ و دەڕواتە لای خانمێکی ئەرستۆکراتی دەوڵەمەند کە سەرسامە بە فیکری ڤۆڵتێر. خانمەکە لای خۆی گلیدەداتەوە و پارێزگاریشی لێدەکات، ڤۆڵتێر ماوەی 10 ساڵ لە کۆشکەکەیدا دەمێنێتەوە.

ڤۆڵتێر لەو ماوەیەدا بە قووڵی دەستدەکات بە لێکۆڵینەوە و گەڕان و پشکنین بە نێو زانستی (نیوتن)دا بگرە چەند تاقیکردنەوەیەکی فیزیایی ئەنجام دەدات. دانەری ئەم کتێبە دەڵێ فەلسەفە لای ڤۆڵتێر تێکەڵ بە ئەدەب بووە لە واقیعدا ئەم نووسەرە گەورەیە تەنها لە بواری فەلسەفەدا داهێنەر نەبووە، بەڵکوو لە بواری ئەدەب و بە تایبەتی رۆماندا داهێنەر بووە.

ساڵی 1759 رۆمانێکی فەلسەفی بەناونیشانی "کاندید" واتە دڵساف یان ساویلکە بڵاودەکاتەوە کە یەکێکە لە شاکارە ئەدەبییەکانی. لە ڕاستیدا ئەو گەنجەی کە ناوی "کاندید"ە کەسێکی ساویلکەیە و بڕوا بە هەموو ئەو شتانە دەکات کە مامۆستاکەی "بانفلۆس" پێی دەڵێت و فێری دەکات. ئەم مامۆستایە تیۆرەیەکی سادە و ساکاری سەبارەت بە خۆشبینی لە ژیاندا پێدەڵێ. بەڵام دوای ئەوە کاندید بە چەند ئەزمونێکدا تێدەپەڕێ کە هەر هەموویان دەبنە شوێنی نیگەرانی و شکست بۆی. ئەودەم

بۆی ڕووندەبێتەوە کە بیروباوەڕی مامۆستاکەی هەر هەمووی هەڵەیە.

ئامانجی ڤۆڵتێر لەم ڕۆمانەدا گاڵتەکردنە بە هەموو ئەو مەنزومە فەلسەفییە یاخود میتافیزیکیانەیە کە لە بەرامبەر تاقیکردنەوەدا خۆڕاناگرن، جگە لەوەش ئامانجی ڤۆڵتێر لەم ڕۆمانەدا ڕەخنەگرتنە لە دەمارگیری ئاینی کە ئەودەم لە ئەوروپادا بلاوبوو. هەروەها ڕەخنەگرتنە لەو قسە پڕوپوچ و خورافاتانەی لە نێوەندی گەلانی دواکەوتودا بەربلاوە.

ڕۆمانی کاندید یاخود مرۆڤی ساویلکە هیچ نییە تەنها بەرگریکردنە لە پراگماتیزبوون لە ژیان. مرۆڤ وەك ئەوەی ڤۆڵتێر دەڵێ: دەبێ پراگماتی، عەمەلی، نەرم و لەسەرخۆ بێت، تاکو بتوانێ بژی.

ڤۆڵتێر ساڵی 1763 کتێبێك سەبارەت بە (لێکبوردن) بلاودەکاتەوە، ئەمە دوای ئەوەی گوێبیستی چیرۆکی ئەو پیاوە پرۆتستانتە دەبێ کە لە شاری تۆلۆز لەلایەن زۆرینەی کاسۆلیکەوە دەچەوسێنرێتەوە. ئاشکرایە کاسۆلیکەکان کۆمەڵێ تۆمەتی ناڕەوا دەدەنە پاڵ ئەو پیاوە، پاشان دەیگرن و هێندە ئازار و ئەشکەنجەی دەدەن تاکو دەمرێ. دواتر چیرۆکەکە بلاودەبێتەوە و ڤۆڵتێریش دەیبیستێ. ڤۆڵتێر بە بیستنی ئەو چیرۆکە بێئەندازە لە پیاوانی ئاینی دەمارگیرەکان توڕەدەبێ و داوای دادگاکردنی ئەو خەڵکانە دەکات کە بەو تاوانە دزێوە هەستاون. لەمەشدا سەرکەوتو دەبێ، بەوەی دەتوانێ ڕێز و حورمەت بۆ ئەو پیاوە داماوە بگەڕێنێتەوە کە بە غەدر بووە قوربانی دادگاکانی پشکنینی کلێساو دەمارگیری مەزهەبی کوێرانە کە ئەودەم لە فەرەنسا بلاوبوو.

ئاشکرایە ئەو سەردەمە زۆرینەی کاسۆلیکە توندڕەوەکانی کەمینەی پرۆتستانتەکانیان دەچەوساندەوە کە بە ڕێگایەکی جیاواز لە بیروباوەڕی مەسیحیان دەڕوانی و بەشێوەیەکی جیاوازلەوەی کاسۆلیکەکان لێیتێگەشتبوون.

لەسەر کاریگەری ئەم چیرۆکە بە ئازار و دڵتەزێنە ڤۆڵتێر کتێبەکەی لەسەرلێکبوردن نووسی و تێیدا داوای لە هەموو فەرەنسیەکان کرد بە هەموو مەزهەبەکانییەوە کە خۆیان لە دەمارگیری ئاینی بەدووربگرن و جیاوازی لە بیروڕاو جیاوازی لە مەزهەب قبوڵ بکەن. چونکە ڕەحمەتی خودا گەورەیە و بەشی هەموان دەکات.

ساڵی دواتر، واتە ساڵی 1764 کتێبە بەناوبانگەکەی بەناونیشانی "فەرهەنگی فەلسەفی" بلاوکردەوە تێیدا هێرش دەکاتە سەر میتافیزیکیا، دەمارگیری، تیۆلۆژیای کلێسای کۆن و تایفەگەری کە باڵی بەسەر عەقڵی خەڵکی سادەی ئەو سەردەمەدا کێشابوو. هەر لەو کتێبەدا پرنسیبە سیاسیە گەورەکانی دەربارەی یاساکان، چۆنیەتی ڕێکخستنی دەوڵەت، شێوەی حکومەت..هتد دەخاتە ڕوو. بە کورتیەکەی ئەمە هەندێ لەو فیکرانە بوو کە ئەم کتێبە لە خۆی دەگرێ.

### سەرچاوە

بیان الکتب، 2005/4/27.

# ئیسلامییەکان و ڕۆشنبیران

عەفیف ئەخزەر
لە عەرەبییەوە: لاس



ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ هەموو ئەو شتانەی ناو کەلەپوریان دەمەزەرد کردەوە کە دژی ڕۆشنبیری و ژیانن، ئەمەش بە مەبەستی تەکفیرکردنی بیرکردنەوەو ناو زەدکردنی هەموو داهێنانێك بوو بە بیدعەکاری.. فەقیهەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، وێنەکێشان و گرافیك و فەلسەفەو تەنانەت لۆژیکیشیان قەدەغە کردبوو. لەمبارەیەوە "سیوطي" دەڵێت: (ئەوەی لۆژیك بێژێت کافرە)، هەروەها "ئیبن سەلاح" دەڵێت: (لۆژیك دەتباتەوە سەر فەلسەفە کە کوفرە، چونەوە سەر کوفریش کوفرە). سەروەختێکیش "ئیبن ڕوشد" دوچاری ڕاوەدوونان هات، فەقیهەکانی قورتوبە بە کۆرس دەیانوت: (بە لۆژیك کاریان کردو وتیان ئەمە حەقیقەتە، بەلاکان دەچنەوە سەر لۆژیك).

ئیسلامییەکان شانیان دادایە سەر ئەم کەلەپوورە تاریکەی، دوژمنی ڕوناکی ئەقڵەو دوو چەکی ترسناکیشیان لێخواست بۆ بێدەنگ کردنی ڕۆشنبیران، ئەو دوو چەکەش بریتین لە: سانسۆرو تیرۆر.. نوسەری ئێرانی "سەرکۆهی" باسی ئەو شیزۆفرینیایە دەکات کە ڕۆشنبیرانی ئێران، بەهۆی سانسۆری زۆری حکومەتی ئیسلامییەوە دووچاری بوون: (لە ناخی هەر نوسەرو ڕۆژنامەنوسێکی ئەم وڵاتەدا دوو کەس هەن، یەکێکیان دەنوسێت و ئەوی دیکەشیان هەڵدەستێت بە سڕینەوە، یاخود لە باشترین حاڵەتدا مانای ڕستەکان بەرەمزو میتافۆر بارگاوی دەکات)، (ئێکسپرێس–8/6/2000).

لەلایەکی ترەوە حزبوڵڵای ئێرانی– کە پێشبینی ناکرێت ڕێ بەچی بەدات و چی قەدەغە دەکات–، زۆرجار کتێبی وەهای سوتاندووە کە دەوڵەت بە چاپکردنی ڕازی بووەو مۆڵەتی ڕەسمی پێدراوە، بەڵام حزبوڵڵا گوێی بەوە نەداوەو جگە لە سوتاندنی کتێبەکە، دەستیانداوەتە گڕدانی ئەو خانەی بڵاوکردنەوەیەی چاپی کردووەو هەروەها کەوتونەتە ڕاوەدونانی نوسەرەکەشی.

ئیسلامییەکان هەر تەنها بە دانانی سانسۆر ڕۆشنبیرانیان سەرکوتنەکردووە، بەڵکو ئەم پرۆسەیەیان بە تەکفیرکردن و تیرۆر درێژە پێداوە. بۆ نمونە "خومەینی" بە درێژایی ژیانی (شانازی بە دەرکردنی فتوای کوشتنی ئەحمەد کیسرەوییەوە دەکرد لە ساڵی 1947دا)، (بڕوانە: ئەمیر تاهیری). ساڵی 1979 کاتێك پرسیاری ئەوەیان لە "خومەینی" کرد بۆچی فەرمانی بە لە سێدارەدانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی داوە بەبێ دادگایی کردنیان، لەوەڵامدا دەڵێت: (لەبەرئەوەی ئەوانە تاوانبارن و پێویست ناکات کاتی خۆمانیان لەگەڵدا بکوژین و بکەوینە دادگایکردنیان)، (هـ.س.پ). بەناوی شەریعەتی ئیسلامییەوە جێنشینە

توندڕەوەکانی "خومەینی" لە ناوەوەو دەرەوەی ئێراندا دەستیاندایە جێبەجێکردنی یاسای جەنگەڵ بەسەر ڕۆشنبیراندا. بڕگەی 228 لە یاسای سزادانی ئیسلامی دەڵێت: "ئەگەر بۆ دادگا ساغبووەوە ئەو کەسەی کوژراوە، خوێنی حەڵاڵکراوە -واتە مورتەدە-، ئەوا بکوژەکەی ئازاد دەکرێتو بە بێتاوان دەدرێتە قەڵەم).. هەر بە ناوی ئەم یاسای جەنگەڵەوە، دەزگای شەهیدان کە سەر بە ڕابەری شۆڕشی ئیسلامییە، خەڵاتێکی بە بڕی دوو ملیۆن دۆلار بۆ کوشتنی "سەلمان ڕوشدی" ڕۆماننوس تەرخانکرد.. دواجار هەر لە سایەی ئەم یاسایەدا، ئیتلاعات ناوی 180 ڕۆشنبیری ئێرانی خستە لیستی ڕەشەوە، بە مەبەستی تیرۆرکردنیان، بەڵام تەنها دەستیان بە چوار کەس لەوانە گەیشتو ئەگەر سەرۆك "محەمەد خاتەمی" نەهاتایەتە ناو مەسەلەکە، ئەوا کۆی ئەوانی دیکەش بە دەردی ئەو چوار ڕۆشنبیرە دەچوون!

ئەو ڕوباری خوێنەی ساڵی 1979 شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لەگەڵ خۆیدا هێنای، ڕکو کینەی لەناخی ئیسلامییەکانی دەرەوەی ئێراندا بێدارکردەوە، تا نەیارەکانیان وەك دوژمن ببینن‌و بکەونە پاکتاوکردنیان. بۆ نمونە ساڵی 1985 بە تۆمەتی (هەڵگەڕانەوە)، "حەسەن تورابی" بڕیاری لەسێدارەدانی فەیلەسوف عارف "محەمەد مەحمود تەها"ی دا. ساڵی 1999 دادگای ئیستیئناف لە خەرتوم بە تۆمەتی (سوکایەتیکردن بە ئایین)، هونەرمەندێکی بە لێدانی 260 قامچی حوکمدا. لە لوبنانیش ئیسلامییەکانی سەر بە حزبوڵڵا هەستان بە تیرۆر کردنی "مەهدی عامل" و "حسین مروە"! شایەنی باسە "حسین مروە" هێندە کەنفت بوو، لەسەر جێدا چاوەڕێی مردن بوو. لە میسر ئیسلامییەکان "محەمەد عەبدولوەهاب" یان بە هەڵگەڕانەوە لە دین تاوانبار کرد، لەبەرئەوەی گۆرانی (من غیر لیە؟)ی وتبوو. هەمان حوکمیشیان بەسەر "نەصر حامد ئەبو زێد"دا دا. لەپێناو ڕۆمانی (اولاد حارتنا) تیرۆرستێکی ئیسلامی "نەجیب مەحفوز"ی دایە بەر چەقۆو یەکێکی دی بەپێی فتوایەك، "فەرەج فۆدە"ی تیرۆرکرد.

لەسەر وەختی دادگایکردنی ئەو تیرۆریستەی "فەرەج فۆدە"ی تیرۆرکردبوو، دادوەر لێی دەپرسێت بۆچی کوشتت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: لەبەرئەوەی عەلمانی بوو.. کە دادوەر دەپرسێت عەلمانی یانی چی؟ دەڵێت: نازانم! کاتێك دادوەر ڕووی پرسیار دەکاتە "محەمەد غەزالی"، یەکێك لەسەرکردەکانی ئیخوان موسلمین، دەربارەی ئەوەی حوکمی خوا چییە لەسەر ئەوانەی خەڵك دەکوژن؟ وەکی کەسێکی توندڕەو بە تەواوی یەقینەوە دەڵێت: (ئەوانە حوکمی هەڵگەڕانەوە لەئاینیان بەسەر ئەو کەسەدا داوە، کارێك کە دەبوو دەسەڵاتداری یەکەمی دەوڵەت بیکردایەو نەیکرد). جارێکی دی دادوەر لێی دەپرسێت: (کەواتە حوکمی ئەوانە چییە؟) لەوەڵامدا "غەزالی" وەکی سومبولی میانڕەوی دەڵێت: (ئەوانە حوکمی خوایان جێبەجێ کردووەو ئیسلام سزای ئەوانە نادات). تیرۆریستەکە کاتێك گوێ بیستی فتواکەی "محەمەد غەزالی" بوو کە ڕشتنی خوێنی "فەرەج فۆدە" بە حەڵاڵ دەزانێت، پڕ بە هۆڵی دادگاکە

هاواری کردو وتی: (ئێستا بە ویژدانێکی ئاسودەوە دەمرم). ئەرکی فتوادان ئەوەیە بە هەڵگرتنی گوناه لەسەرشانی کەسی تیرۆریست، ویژدانی ئەخلاقی ئاسودەکات، بۆ ئەوەی سازو ئامادەبێت بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەك ئامبازی نێچیرەکەی بێت.

لە جەزائیریش ئیسلامییەکان زیاد لە شەست رۆشنبیریان تیرۆرکرد، لەوانە: "تاهیر جەعوتی" شاعیرو "جیلالی یابسی" ئەکادیمیست. بەرەی ئینقازی ئیسلامی لەسەرزاری "ئەنوەر هەدام" تەبەنی تیرۆرکردنی "جیلالی یابس"ی کرد. شایەنی باسە لەسەروبەندی تیرۆرکردنی "یابس"دا، توندڕەوێکی ئیسلامی تونسیی نوسیبووی: (چارەنوسی ئەو عەلمانییە تونسییانەی دەستیان لەگەڵ رژێمدا تێکەڵ کردووە، وەك چارەنوسی یابس دەبێت). دواجار "یوسف قەرزاوی" کە بەحساب کەسێکی میانڕەوە، فتوای تەکفیرکردنی دەرکرد بۆ "حەیدەر حەیدەر"و رۆمانەکەی (خوانێك بۆ گژوگیاکانی دەریا)و هەر کەسێکیش ئەو بەرهەمە بە کارێکی داهێنەرانە بزانێت، (واتە زۆربەی زۆری رۆشنبیرانو داهێنەرانو رەخنەگران لە میسرو وڵاتانی دیکەی عەرەبی، تەنانەت ئەوانەشی وەکو من ناکۆکن لەسەر ناوەڕۆکی سیاسی رۆژمانەکە)، ئەو فتوایە دەیگرێتەوە. ئاشکرایە تەکفیرکردن بە مانای حەلاڵکردنی خوێنی ئەوانە دێت کە تەکفیر دەکرێنو هاندانی هەر ئیماندارێکیشە بتوانێت ئەو کارە جێبەجێ بکات!

سەرکوتکردنی رۆشنبیران لەلایەن ئیسلامییەکانەوە، بە قەدەغەکردنی کتێبەکانیانو راوەدونانیانو فتوادان بە کوشتنو برینو دادگاییکردنو لەسێدارەدانیان، لەبەرئەوەی پرۆسەیەکی بە بەرنامەیەو بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو خەریکە دەبێتە حوکمی یاسا. بێگومان لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش کە بۆچی ئیسلامییەکان تەکفیری بیرکردنەوەو بیریارانو داهێنەران دەکەن؟ وەکی پرۆژە وەلامێکی کراوە بۆ گفتوگۆکردن، پێنج گریمانە بەردەست دەخەم:

1-ئەو توند ڕەوی و دەمارگیرییەی لەناخی دەرونیاندا رەگی داکوتاوە، دەیانخاتە سەر کەلکەڵەی ئەوەی ئەوان خاوەنی مەعریفەیەکی ئیلاهینو پێویستیان بە هیچ شتێکی تر نییە. ئەو حەقیقەتەی دەمارگیرێکی ئسوڵی خۆی بە خاوەنی دەزانێت، لە واقیعدا جگە لە وەهمێکی گەورە شتێکی تر نییەو پەنا بەم وەهمە دەگرێت، لەبەرئەوەی ناتوانێت رووبەڕووی حەقیقەتە تاڵەکان بێتەوەو بیر لە خۆکوشتن نەکاتەوە. ئەم مرۆڤە پێیوایە پەسەندنەکردنی هەر بۆچونێکیو بونی رای جیاواز تر لە هی ئەو، مانای سوکایەتی پێکردنو شکاندنی کارەکتەری ئەوە، ئەمەش دەیخاتە حاڵەتێکەوە تاسازو ئامادەبێت بۆ شەرانگێزیو پاکتاوکردنی بەرامبەر، وەك ئەوەی لە دۆخی بەرخوردێکی شەرعیدا بێت لە خۆی.

2-پێیان وایە دەبێت خەڵکی ئاراستە بکەنو بانگیان بکەن بۆ سەر رێگای راست، ئەم حەزو ئارەزووەش بۆ ئاراستەکردنی خەڵك وەکی دەرونشیکاری باسی دەکات، تێکەڵەیەکە لەسادیزمو خود ئەڤینیو ئەوەشی دوچاری ئەم پەتایە بووبێت، بۆچونەکانی خۆی وەکی ئیرادەی یەزدان بەسەر ئەوانەدا فەرز دەکات کە باوەڕیان پێی نییەو وەك ئەو بیرناکەنەوە. لەراستیدا ئەوە نەك هەر تەعبیرنییە لە ئیرادەی

ئیلاهی، بەڵکو گوزارشتە لەو نەخۆشیو هەلوەسانەی لە ناخی ئەو مرۆڤەدا هەن.

3-ناکارایی و دەسەوسانی دەستەبژێرەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوەی بتوانن وەکی پێویست (هاولاتی لە ئیماندارو ئایین لە سیاسەتو دواجار ئایین لە توێژینەوەی زانستیو ئەفراندنی ئەدەبیو هونەری) جیابکەنەوە، ئەمەش بۆ خۆی ناوەڕۆکی پرۆژەی مۆدێرنەیە.

4-نەگۆڕانی مەرجەعیە فیقهیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستو تازە نەبوونەوەیان، بە جۆرێك بتوانێت خۆی لەگەڵ یاساکانی سەردەمدا بگونجێنێت، بە تایبەت مافەکانی مرۆڤ کە بواری ئازادی بیرکردنەوەو رادەربڕین دەستەبەر دەکاتو وەك یەکی سەیری هەموو بیرو باوەڕەکان دەکات. لەم سەردەمەدا هەر یاساو بیروبۆچونێك دژ بە بنەماکانی مافی مرۆڤ بێت، شەرعیەتی خۆی لەدەست دەداتو بۆ ئەوە باشە لە ئەرشیفدا هەڵبگیرێت. پێویستە ولاتانی ئێمە کە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤیان پەسەند کردووە، رێزی ئیمزاکانی خۆیان بگرنو سەرلەنوێ فیقهی کۆن لەسەر بنەمایەکی مۆدێرن دابڕێژنەوە. ئەمەش مانای وایە یاسا گەلێك دەربکرێت کە بوار بە هەموو ئاقارە ئەدەبیو هونەریو فەلسەفیو زانستییەکان بدات، گوزارشت لەخۆیان بکەنو بە ئازادیش لێکۆڵینەوەو گومانو ئەزمونی شتەکان بکرێت، هەروەها ئەقڵو خەیاڵ سانسۆر نەکرێنو سنوریان بۆ دانەنرێت.

واتە بە جۆرێك کاربکەین کە میللەتانی دنیا لەسەرتاسەری گۆی زەویدا دەیکەن. خۆدزینەوەمان لە دەسکەوتەکانی مۆدێرنە، ناهەقییەکی گەورەیە دەرهەق بە خۆمان.

5-ئیسلامییەکان کە سەرکوتکردنی فیکرو داهێنان بۆتە پیشەیان، لە واقیعدا ئەوانە لەیەك کاتدا هەم جەلادنو هەم قوربانیش. جەلادن لەبەرئەوەی بەناوی شەریعەتەوە یاسای جەنگەڵ بەسەر رۆشنبیریو رۆشنبیراندا دەسەپێننو بەم کارەشیان ئازادیان لێزەوت دەکەنو خوێنیان دەڕێژن.

قوربانیشن، لەبەرئەوەی زۆربەی زۆریان هەر لە منداڵییەوە بە بەرنامەیەکی ئایینی کۆنو نەزۆکی وا پەروەردەکراون، دوور بووە لە سۆسیۆلۆژیاو مێژووی ئایینەکانو سایکۆلۆژیاو زمانەوانیو.. هتد. بەرنامەیەکی ئایینی لەو جۆرە مێشکی پڕکردوون لە مەرگدۆستیو نەفرەت کردن لە زیندەگیو تەکفیرکردنی ئەو سەردەمەی تیایدا دەژین، دواجار ئەمانە قوربانی دەستی کەناڵەکانی راگەیاندنیشن کە وەك پەروەردەی ئایینی، خەڵك بەرامبەر ژیانی مۆدێرن رق ئەستوور دەکەنو سوکایەتی بە دەسکەوتەکانی مۆدێرنەوە دەکەن.

لێرەدا ئەوە بە بیردەهێنمەوە کە یەکێك لەو پارێزەرانەی بەشداربوو لە فتوادان بۆ تیرۆرکردنی "فەرەج فۆدە"، بە بەردەوامی لە تەلەفزیۆنی میسرەوە دەردەکەوتو ملیۆنەها بینەر دەیانبینی، بۆ ئەوەی مێشکیان بشواتەوەو ئامادەیان بکات ببنە بکوژو کوژراو، بکوژی رۆشنبیرانو کوژراوی دەستی هێزەکانی ئاسایش!!

سەرچاوە

www.Elaphe.com

# رینیه ماریا ریلکه

**هاشم سالْح**

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



نازانم بۆچی کاتێ وەرزی هاوین دێت، پێویستیم بۆ شیعر زیاتر دەبێ، من وەك نەخۆش چۆن ناوەناوە پێویستی بە دەرمان هەیە، ئاوا پێویستم بە شیعر هەیە. عەیامێکە هەستدەکەم نەخۆشی شیعرم و تەنها شیعریش چاکمدەکاتەوە. تاقە شتێك کە جێی داخە ئەوەیە من هەموو زمانەکانی دیکەی جیهان نازانم، تاکو هەموو شاعیرێکی مەزن بە زمانە تایبەتەکەی خۆی بخوێنمەوە. ئەو کات من "تاگور"م بە زمانی هیندی دەخوێندەوەو، هۆڵدەرلین یاخود ریلکە یان نیتچەم بە ئەڵمانی دەخوێندەوەو دیستۆفسکی یان بۆشکینم بە روسی دەخوێندەوە، چونکە شیعری وەرگێڕدراو وەك شیعرێکی نەزۆك وایە، داوای لێبوردنیش لە خوێنەر دەکەم چونکە من ئەم وشەیەم خۆشناوێت. من ئەوە دەڵێم و دەزانم وەرگێڕانی باش هەیە و ماندوبونی پێوە دیارە، هەر چۆنێك بێت وەرگێڕانی شیعر کارێکی پێویستە و من یەکێکم لە لایەنگرانی وەرگێڕانی شیعر. لە هەندێ جاردا دەقە بنەڕەتییەکە لە بەرامبەر دەقە وەرگێڕدراوەکەدا دادەنرێت، وەك ئەوەی لەم کتێبەی ریلکەدا کراوە. ئەم کارەش هەر دوو ڕەخنەگری فەرەنسی "جان ئیف ماسۆن" و "گابرییل ئالتین" پێیهەستاون و نوسەری بەناوبانگ خانم "مارگریت یورسنار" پێشەکی بۆ نوسیوە. "مارگریت" سەبارەت بە وەرگێڕانی شیعر دەڵێ:

"من گەرچی تاڕادەیەك هاوسەردەمی ریلكە بووم، بەڵام ناسینێكی شەخسی نەمناسیوەو زۆر درەنگ كتێبەكانیم خوێندوەتەوە، لە ساڵی مردنەكەیدا بەرهەمەكانیم خوێندووەتەوە. بەشێكی زۆری شیعرەكانی تێگەشتن لێی سەخت و گرانە و نوقمی تەمومژێكی گەورەیە.. شیعری وەرگێڕدراویش تەنها بریتییە لە كۆترێكی پەڕوباڵ كراو، بریتییە لە جۆری دەریاكە بە زەبری هێز لە چوارچێوە سروشتییەكەی خۆی دەرهێنراوە. شیعری وەرگێڕدراو لەو دورخراوانە دەچێ كە لەسەر كەناری روبارە بیانیەكاندا ڕاوەستاون و خەفەت بۆ ئەوە دەخۆن كە لە نیشتیمانی خۆیاندا نین"

دواتر "مارگریت یۆرسنار" بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (بەڵام بەرهەمە پەخشان ئامێزەكانی و نامە تایبەتیەكانی و هەندێ لەو شیعرانەی ڕاستەوخۆ بە زمانی فەرەنسی نوسراون، هەروەها ئەو بەسەرهاتانەی كە خەڵكی لەسەر ریلكە بۆیان گێڕاومەتەوە، خەڵكانێك كە ریلكەیان ناسیوەو خۆشیان ویستووە، هەموو ئەوانە وایانكرد هەستێكی خۆشەویستی برایانەی بێكۆتایم لە بەرامبەر ریلكەدا هەبێت).

ریلكە هەستیدەكرد لەم جیهانەدا تەنهایە و بابەتی تەنهایی یەكێكە لە گرنگترین ئەو بابەتانەی كە زۆر جەختی لەسەر كردووە. ئەو لە نێو ئاپۆرەی خەڵكیدا خۆی بە تەنها دەزانی. بەڵام لە نێو ئەو بونەوەرانەی كە لە تەنهاییەكەیدا یارمەتیان دەداو باری سەرشانیان سوك دەكرد، دەتوانین ناوی خوداو بەهار و منداڵی و با بێنین، بەڵێ "با" بەشێوەیەكی تایبەتی، ئەو بایەی پێش ئەوەی بگات بە ئێمە بەسەر درەختی چەندین وڵاتدا تێپەڕیوە. ئێستا یادكردنەوەی ریلكە بوەتە شنەیەكی سوك و هێمن، یادكردنەوەی وەك ئەو ڕەشەبایە وایە كە دەم دەسە هەڵدەكات و بەسەرماندا گوزەر دەكات، تاكو تەنهاییە دڵتەنگەكەمان یاخود دڵەڕاوكە ترسێنەرەكەمان بڕەوێنێتەوە ریلكە بۆ خۆی دڵەڕاوكەیەكی شێتانەی نەخۆشی هەبوو كە ناكرێ هیچ لێكدانەوەیەكی بۆ بكرێ چونكە ئەو دڵەڕاوكەیە ڕۆچوبووە قوڵایی منداڵییەوە. ئەوە شیعر بوو دڵەڕاوكە ناوخۆییەكەی دەمژی، شیعری وێستگەی ئیسراحەتكردن بوو: واتە مێرگێك لە بیابانی ژیاندا هەموو ژیانی ریلكە بریتییە لەو گرژی یاخود هەڵچون و داچونە بەردەوامەی نێوان دڵەڕاوكەیەكی كوشندە و دڵنەواییەكی ماندو: واتە ئەو دڵنەواییەی بەزۆری زۆرداری دێت، ئەمەش دوای ئەوەی دڵەڕاوكە لێدانە جاڵجاڵۆكەیەكەی خۆی دەوەشێنێت و دەگاتە دوا سنوری خۆی. لەبەرئەم هۆیەیە شیعرەكانی ریلكە مۆركێكی ئارام بەخش و خۆبەدەستەوەدانی تێدایە. ئەمەش وەك ئەوە وایە شیعر قەرەبوی ژیان بكات یاخود ڕامكردنی ژیانە یان خۆدەرخستنەوەیە لە مەترسیەكانی شیعر ترس و دڵەڕاوكەمان، ئازارمان، خەمو خەفەتمان دەمژێ. لە شیعردا ڕزگاربوون، گەر كاتیش بێت دەدۆزینەوە، شیعر بە مانای تەواوی وشە وێستگەی ئیسراحەتكردنە.

گەر شیعر نەبوایە، ئەوا دڵە ڕاوكە شێتانییەكە بەرەو خەرەندی چاڵەكە فڕێیدەداین. گەر شیعر نەبوایە ئەوا

شتگەلێکمان جێبەجێ دەکرد کە کەس تەحەمولی دەرئەنجامەکەی نەدەکرد. بەڵام یارییە دۆزەخیانەکەی دڵەڕاوکە سەرلەنوێ دەستپێدەکاتەوە، تاکو شیعرێکی دیکە دێت و ئەو دڵە ڕاوکە دۆزەخیانە لە سنوری خۆیدا ڕادەگرێ، ئیدی ئا بەم جۆرە، نە دڵەڕاوکە کۆتایی دێت و نەشیعر.

گەر شیعر بۆ شاعیر چارەسەر بێت، ئەوا بۆ خوێنەریش چارەسەرە. شیعر بریتییە لە موسەکنێك یاخود هێورکەرەوەیەك بۆ گرژی هەڵچونە دەمارییەکان، لەبەرئەوە لە جیاتی ئەوەی بڕۆم بۆ دەرمانخانە تاکو هەندێ حەب و دەرمانی پزیشکی بکڕم، دەچم شیعر دەخوێنمەوە. هەر شاعیرێکیش یارمەتیمان نەدا بەرگەی تاڵی و ناخۆشی ژیان بگرین، تەنانەت گەر یارمەتیمان نەدا بۆ ئەوەی ساتێکی کەمیش دڵخۆش بین، ئەوا شایەنی ئەوە نییە بیخوێنینەوە. هەر شاعیرێك پانتاییەکی بچوك بۆ ژیان. زیاد نەکات یاخود دەلاقەیەك نەکاتە دیواری داخراوی ژیان، ئەوا پشتگوێ دەخرێ و بێبایەخ دەبێ.

بەم مانایە شیعر سەبورییەکە لە جیهانێکدا کە سەبوری تێیدا نییە. لەم گۆشە نیگایەوە پەیوەندییەك لە نێوان شیعر و موقەدەسدا هەیە. لێکچونێکی ئاشکرا هەیە لە نێوان زمانی شیعری و زمانی ئاینی. بێگومان هەندێ جیاوازیش هەیە لە نێوانیاندا کە نامەوێ – یاخود ناتوانم – لێرەدا لەسەریان بوەستم.

هەردوو ڕەخنەگرەکە لە لێکۆڵینەوەیەکی بەسودا کە هاوپێچە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا دەڵێن: بابەتی شەو حاجسێك بووە لای ریلکە، هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە تاکو دوا ڕۆژەکانی ژیانی ئەمەش شیعرەکانی "نۆڤالسیس"مان بیر دەخاتەوە "ورتەورت بۆ شەو" ریلکە لە کۆتایی 1912 و سەرەتای 1913 لە ئیسپانیا نیشتەجێ بوو، سودێکی زۆریشی لەو نیشتەجێ بوونە وەرگرتووە. لەوێ دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا متەسەوفە ئیسپانیەکان بناسێ، هەروەها بەشێوەیەکی تایبەتی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە، بەڵێ قورئانی پیرۆز! ریلکە لەو گەشتەیدا بۆ ئیسپانیا بۆ یەکەمجار قورئانی ناسی. قورئانی پیرۆز کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دروستکرد.

دیوانی "شیعر بۆ شەو" لە دیوانە بەناوبانگەکەی "لاوانەوەی دۆمینۆ" جیاوازترە لەم دیوانەیدا – شیعر بۆ شەو – باس لە بابەتێکی تایبەت دەکات و تێیدا قووڵ و قوڵتر دەبێتەوە و بە چەندین شێوە پیشانی دەدات. ریلکە لە میانەی بابەتی شەو یاخود لە میانەی زوڵمەتی شەوەوە بە شوێن ئەو شتەدا دەگەڕێ کە لە دیوانی "لاواندنەوەی دۆمینۆ"دا ناوی ناوە کرانەوە یاخود ئاسۆی کرانەوە. دەکرێ بڵێین کرانەوە لە ناوجەرگەی داخستندا. گەر داخران نەبوایە، ئەوا هیچ پێویستییەك بۆ کرانەوە نەدەبوو. شیعریش بەمانایەك لە ماناکان واتە کردنەوەی کونێك لە دیواری داخراو. کەشفی شیعری مانای سەرکەوتن و ئازادی گەر بۆ ساتێکیش بێت لێرەدا ئاخاوتنی شیعری لە هەندێ وشەی بنەڕەتیدا چڕ دەبێتەوە، هەندێ وشە لە جۆری: سیما، فریشتە، پانتای، شەو، ئەستێرە، مانگ. بەڵام لە شیعرێکەوە بۆ شیعرێکی دیکە تێبینی هەندێ بەلەکۆنە یاخود پەنجەرە دەکرێ کە بە

شێوەیەکی کز ڕۆشنکراوەتەوە، هەروەها هەندێ گردۆڵکە و گلۆپ و شەقام و چرا دەبینرێ. ئا ئەمەیە چوار چێوە گشتییەکەی ئەم شیعرانە. لەم سەروبەندەشدا شتێکی بنەڕەتی ڕوودەدات کە ناکرێ دەستبگری بەسەریدا، شتێك پەیوەندی بە خۆشەویستیەوە هەیە: یاخود ناتەواوی خۆشەویستی یان پێویستی بۆ خۆشەویستی.. هتد. کاتێ شیعر باڵدەگرێ وەك پەرجوویەك دەردەکەوێ، وەك شتێك لە ڕادەبەدەر، ئەمە کەمترین حاڵەتە کە هەستی پێدەکەین کاتێ شیعری شاعیرە مەزنەکانی وەك ریلکە و ڕامبۆ و بۆدلێر و رینیە شار و وموتەنەبی و بەدەوی خەلیل.. هتد دەخوێنینەوە.

ئێستا با هەوڵدەین هەندێ لە شیعرەکانی ریلکە بخوێنینەوە، لە وەرگێڕانێکەوە وەریبگێڕین!

**بازنەکانی شەو**

کاتێ لە خەو هەڵدەستم و ئەستێرەکانی شەو دەبینم
ئایا لەو بەرزاییەوە تەنها بەسەر روخسارمدا هەڵدێت
مەبەستم روخساری ئێستامە.
یاخود لە هەمان کاتدا بەسەر سەرجەم ساڵەکانمدا هەڵدێت
ساڵەکانم
ئەو پردانەی بەسەر عەمودی ڕۆشناییەوە هەڵواسراون.

* * * *

ئەوە کێیە دەیەوێ لەوێوە ڕێگا ببڕێ
ئەوەی وا دەزانێ من بۆ ئەو تەنها پردی رووبارێکم
ئەوەی هەروا بەسەرمدا دەپەڕێتەوەو
بازنەیەکی فراوان دروستدەکات
ئەوەی باز دەدا بەسەرمدا و دەمبا
دەمبا وەك چۆن دێوانەیەك روقعەی شەترەنجێك دەباو
سورە لەسەر ئەوەی بردویەتییەوە؟

ریلکە لە دیوانێکی دیکەی بەناوی "کتێبی کاتژمێرەکان" دەڵێ:

ژیانم لە نێو کۆمەڵێ بازنەی فراواندا دەگوزەرێنم
لەنێو کۆمەڵێ شتدا کە درێژدەبنەوە
ڕەنگە نەتوانم بازنەی کۆتایی تەواو بکەم
بەڵام هەوڵدەدەم
ئاه
جارێك لەسەر پردەکە
کەوتنە خوارەوەی نەیزەکێکم بینی
نابێ هەرگیز ئەوە لە بیر بکەین.
هەرگیز!

پاشان ئەم شیعرە کە ڕاستەوخۆ بە فەرەنسی نوسراوە و من لێرەدا تەنها پارچەیەکی پێشکەش دەکەم:

ڕێگاکان لە نێوان دوو پێدەشتا
دەچنەوە سەر ناشوێن
لەو باوەڕەداین
ڕێگاکان لە ڕێگا ڕاستەقینەکانی خۆیان لاداوە
ڕێگاکان هیچ شتێك لە بەرامبەریاندا نییە
تەنها بۆشاییەکی سپی و وەرزەکان نەبێت

ناوی کتێب: شیعر بۆ شەو
نوسینی: رینیە ماریا ریلکە
لە بڵاوکراوەکانی فیردییە — پاریس.

**سەرچاوە**

بیان الکتب، 2002/7/7.

# نامەیەكی مەكسیم گۆركی بۆ چیخۆف

لە فارسییەوە: حەمە رەسول حەسەن پوور



نیژنی نووگورد
نێوان 20و30 نۆڤەمبەری 1898

**ئانتوان پاڤۆلۆڤیچ ی زۆر بەرێز!**

بۆ وەلاّم دانەوە بەنامەكەم و هەروەها ئەو بەلێنەی بۆ نامە نووسینی سەر لە نویٚ داوتە لە دلّەوە سوپاست دەكەم. بەبیٚ سەبری چاوەڕوانی نامەی تۆم و حەزدەكەم بیروڕای تۆ سەبارەت بە چیرۆكەكانم بزانم.

چەند ڕۆژ لەمەوبەر (شانۆنامەی) "خالٚ ڤانیا"م دی. بینیم و وەك منالێك گریام: تووڕە نەبووم بەلاّم لە ژێر كاریگەری شانۆنامەكەتدا بە گێژی و شێواوییەوە چوومەوە مالٚ.

نامەیەكی دوور و درێژم بۆت نووسی – دراندم. وتنی ئەوەی كە ئەم شانۆیە چ هەستێك لە دەروندا پێك دێنێت بەرۆشنی ناومكینە، كە سەیری ئاكتەرەكانمكرد، بە مشارێكی كول دەبوومە دووكەرت. راستەوخۆ ددانەكانی دەدلّم دەچەقیٚ و لە دەردو نارەحەتییان دەچریكێنێت. بۆ من زۆر سامناكە. خالۆ ڤانیای تۆ جۆرێك هونەری دراماتیك و بە تەواوەتی نوێیە، چەكوشێكە پێی لە مێشكی بەتالی خەلٚكی عەوام رادەكێشیٚ. گشتیان چونیەك لەگەمژەیی خۆیان پێدادەگرن. تۆ لە "مەلی دەریا" یان "خالٚ ڤانیا" بە تەواوەتی هەستت پێنەكراوە. ئایا شانۆنامەی دیكەشت دەبن؟ تۆ لەم ئیشەتدا مەحشەرت خولقاندووە.

لە دوایین بەشی خالٚ ڤانیادا كاتێكی دوكتۆر دوای راوەستانێكی زۆر سەبارەت بە گەرمای ئەفریقا دەدویٚ ، من لەگەلٚ ئافەرین لیٚ كردنتا، توشی بووم و بۆ ئەم خەلٚكە و بۆ ئەم رەوشە نا لەبارەی تێیداین، لەرزیم. زەربەیەكی كاریت وەشاندووە ئامانجی پێكاوە! بەلاّم مەبەستت لەم زەربانە چییە؟ ئایا مرۆڤ بەرەو ژیان دەگەڕێنیەوە؟ باشە ئێمە خەلٚكانی بێچارە، غەمبار، بیٚ هیواو خەمۆكین و تاك دەبێت كانگای شەرافەت و پاكی بێت تا بتوانێت زگی بەم توورەكەی دل و ریخۆلّەی ئێمە هەمانە بسووتێت و لە هەولّی یارمەتیدانی ئێمەدا بیٚ بۆ ئەوەی بژین. لەگەلٚ ئەوەیدا هەموویان بە چەشنێك رەحم و بەزەیی ئامێزن. بەشبەحالّی خۆم قەت مۆدێلی تەقوانێم، بەم حالّەشەوە بە بینینی ڤانیا ئەوانەی ئەویان خۆشدەویٚ خوڕ خوڕ گریام، ئەگەر چی خوڕ خوڕ گریان ئیشێكی گەمژانەیەو لەوە گەمژانەتر دوان سەبارەت بەوە.

دەزانی لە روانگەی منەوە، تۆ لەم شانۆنامەیەدا بەنیسبەت خەلٚكی بیٚ تەفاوەتتر لە خوت شەتیانی. وەك سەهۆلّی باو بۆرانی بەفر لەگەلّیاندا ساردوسڕی. بمبوورە. لەوانەیە من هەلّەبم و بەلاّم من روانگەی خۆم بەیاندەكەم.

سەیر دەکەی لەو کاتەوە شانۆنامەی تۆم بینیوە، هەستکردن بە ترس و دڵەخورپەم تێدا دروستبووە. کاتی مناڵیم هەستێکی ئەوتۆم هەبووە. لە باغەکەماندا گۆشەیەکم هەبوو کە خۆم گوڵم تێدا چاندبوو و باش گەشابوونەوە. بەڵام رۆژێکیان کاتێك چووم ئاویان بدەم، سەیرم کرد گڵەکەیان گێڵدراوە و گوڵەکان بەسەر لق و پۆپەکانیاندا سەریان شۆڕبۆتەوە. ئیش، ئیشی بەرازبوو، بەرازەکەی خۆمان، شیپانەی دەرگاکەی خۆمانی شکاندبوو هاتبۆ ژوورەوە. رۆژیکبوو هەتاو تیشکی دەهاویشت و ئەو رۆژە بە زیاد نەبووە بە گەرمییەکی لە رادەبەدەر لەم جێگە وێرانانەی دەداکە پارچەیەکی دڵم بوون.

بەڵێ، هەروایە. ئەگەر شتێکی ناراستم وتووە، مەتۆرێ، من پیاوێکی بێ پەردە و دێهاتیانەم و دەروونم بە دەردێکی بێدەمارانەوە نەخوشبووە و بە هەڵکەوت ئەمەرەوشی پیاوێکی بیرمەندە. ساغی و سەلامەتی و پشتگەرمیت بۆ بە ئاوات دەخوازم. گرینگ نیە چەندە ئافەرینت لێبکەم. وا بزانم تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت تۆ نە ناسراویت و دەرکیان پێنەکردووی. حەزناکەم خۆم بەڵگەی ئەم بابەتە وتراوەبم.

اڕیشکۆف

بێزەحمەت بیروڕای خۆتم سەبارەت بە خاڵۆوانیا بۆ بنووسە. ئەگەر بەم قسانەم ماندووم کردووی بەراشکاوی پێم بڵێ. ئەگەر نا دیسانەوە نامەت بۆ دەنووسم.

**سەرچاوە**

نامەهای ماکسیم گۆرکی،

ل 29–30.

## فایلی ژمارەکانی
## داهاتوومان

لە ژمارەکانی داهاتووی گۆڤاری سەردەمدا بە نیازین دوو فایل بکەینەوە بۆ هەریەك لە:

*پییر بۆردیۆ

*ئەدۆنیس

چاوەڕوانی بەرهەمو هاوکاری ئێوەی بەڕێزین..

